٨٥

# پوختەی
# مێژووی ئەورووپا

## لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ

(سەردەمی کۆن، سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی نوێ)


نووسینی

پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن

وەرگێڕانی

نهاد جلال حبیب الله



٢٠٠٩




بسم الله الرحمن الرحیم

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: پوختەی مێژووی ئەورووپا

نووسەر: پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن

وەرگێڕ: نهاد جلال حبیب الله

بابەت: مێژوویی

سالی چاپ: ٢٠٠٩ز – ١٤٣٠ك.

ژمارەی چاپ: یەکەم

# (پێشەکی وەرگێڕ)

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورەو میهرەبان، سوپاسێك تەنها شایانی گەورەیی و میهرەبانی خۆی بێت، سوپاس بۆ خوا بۆ ئەو میهرە گەورەی پێی بەخشیم تا بتوانم پێنووسی دەستم بخەمە کار بۆ وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە پێویستەی ناو کتێبخانەی ئیسلامی و کوردیمان، پاشان سەلات و سەلامی خوای گەورە لە پێشەواو پێشەنگی باوەڕداران موحەممەدو ئالوبەیت و یارانی و هەموو هاوڕێبازانی تا ڕۆژی دوایی.

مێژووی ئەوروپا مێژوویەکی گرنگی ناو ڕێکردەی مێژووی مرۆڤایەتیەو هەر لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ لەسەر ئاستی جیهانی ڕۆڵی کارای بینیوە، بەتایبەت لەمڕۆدا نزیکبوونەوەکە زۆرتر بووەو تا ئاستێکی بەرچاویش خۆی لەمەیدانی پێکدادان و ململانێدا دەبینێتەوە، ئایا ململانێی ئایینی بێت وەك ئەوەی ئەوان مەسیحی و ئێمە موسڵمانین، یاخود ململانێی شارستانی، ئەوان ئەمڕۆیەکی پێشکەوتوویان هەیە کە ڕابردووی دواکەوتوویان پێ پەردەپۆش کردووەو ئێمەش ئیمڕۆیەکی دواکەوتوو و چەقبەستوومان هەیە کەڕابردووی گەشاوەمان پێ ناشیرین کردووە، یان ململانێی نەتەوەیی بێت کە زۆرداران و داگیرکارانی ئەوروپی نەوەك یاریدەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی نەبوون، بەڵکوو داخی سەلاحەدین و نەوەکانی سەلاحەدینیان پێ ڕشتین و یاریدەدەرو نەخشە داڕێژەریش بوون بۆ دابەشکردنی خاکی کوردان کە تا ئەمڕۆش بەدەستیەوە دەناڵێنین.

ئەوروپا لەڕۆژگارێکی تەمەنیدا ژیانی بەربەری و شالاوی هۆزو تاقمە جیاجیاکانی بەخۆیەوە دەدی، سەردەمانێك هەبوو خۆی بەجیهانی ئیسلامی دەچواند و بەرگی ئیسلامی ئەوپەڕی کەشخەیی و خانەدانی بوو، ستەمی لەجوولەکە دەکرد و کوشتاری بەکۆمەڵی لەڕوویاندا ئەنجامدەدا، ئەم ئەورووپایە هەنگاو بەهەنگاو چوو تا گەشتە ئاستێکی بەرزی پێشکەوتنی وا بتوانێت جڵەوی دەسەڵاتی جیهان بگرێتە دەست و ببێتە نمونەی پێشکەوتنی زانستی، ئەو

پێشکەوتنە زانستیەی هێندە بەرزو فراوان بوو کە گەلانی دیکەی والێکرد ئامادەبن خراپەو جیاوازیە ئاکاری‌و هزری‌و مەزهەبیەکانی ڕۆژئاواش وەربگرن، هەندێ جار هێندە بارەکەیان لێتێکچووبوو لەجیاتی ئەسڵی خواستەکە (پێشکەوتنی زانستی)پاشکۆ ناپەیوەستە بنەڕەتیەکانی ئەو خواستەیان وەرگرت (ئاکارو بیری ئایینی ئەوروپا) بەجۆرێك پێیان وابوو ئەمانە سەرچاوەی ئەو پێشکەوتنەن.

بۆیە پێویستە شارەزایی لەسەر مێژووی ئەورووپا ببێتە هەوڵێکی مەیدانی مێژووییمان، بەڵام بەداخەوە لەکتێبخانەی کوردیماندا نووسین یان وەرگێڕانێکی وا لەو بارەیەوە بەدی ناکرێت، لەکاتێکدا ئەمڕۆی ئێمەی کورد پێویستی زۆری بەشارەزابوونی ئەو بوارە هەیە، هاوکات وەك دیدی ئایینیش کتێبخانەی ئیسلامی کوردیمان لەوبوارەدا زۆر لاوازە، بەتایبەت ئەگەر بزانین جیهانی ئیسلامی‌و هزری ئیسلامی ململانێیەکی دێرینەو سەختیان لەگەڵ ئەورووپادا هەیەو ئەمڕۆش تای تەرازووی ململانێکە بەلای ئەواندا کەوتووە، بۆیە پێویستە بە وردی لەپێشینەو هۆکارو ئەنجامی ئەم واقیعە بکۆڵینەوە تابزانین چ هەنگاوێك بگرینەبەر.

لە ڕوانگەی ئەم مەبەست‌و هیواخوازیە ئایینی‌و نەتەوەییەوە پێمان باشبوو سەبارەت بە مێژووی ئەوروپا کتێبێك وەرگێڕینە سەر زمانی شیرین‌و پاراوی کوردی، بەڵکوو خزمەتێك بێت بەنەوەی نوێی زانستخوازو یارمەتیەك بێت بۆ خوێندکاری ستەملێکراوی کوردو هەنگاوێك بێت بۆ تەواوکردنی ئەرکی پشتگوێ خراوی مامۆستایان‌و تایبەتمەندانی مێژووی ئەورووپا لە نێوەندە جیاجیاکانی خوێندن‌و خەڵاتێکیش بێت بۆ نەتەوەی ستەملێکراوی کورد.

بۆ ئەمەش ئەم کتێبەی (پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن) مان هەڵبژارد کە باس لەپوختەی هەموو سەردەمەکانی مێژووی ئەوروپا دەکات هەر لە کۆنەوە تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، واتە لە سەدەکانی پێش زاینەوە دێتە سەرەتای زاینی‌و لەوێوە ماوەی بیست سەدە مێژووی ئەوروپا دێنێت، لەهەموو گرنگتر لەپاڵ لایەنە سیاسیەکەیدا لایەنەکانی دیکەی مێژووی ئەورووپای هێناوە، بەمجۆرە

سەرچاوەیەکی چاكو سەرەتایی دەبێت بۆ خوێنەرانی کورد بە شێوەیەکی گشتیو خوێندکارانی بەشی مێژوو بەشێوەیەکی تایبەتی، چونکە هەمیشە ئەو ساتانە لەبیر ناچن کە مامۆستاکانی زانکۆ لەکاتی وتنەوەی وانەی مێژووی ئەورووپادا پێیان دەوتین بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان، خوێندکارانیش لەبەرئەوەی زۆربەیان شارەزای زمانی دیکە نەبوونو سەرچاوەی کوردیش لەوبارەوە نەبوو، ناچاربوون بەبێ خوێندنەوە گوێ لەمامۆستاکان بگرن تا بە بیرو دیدی ئەوان خۆیان گۆش بکەن، بەوجۆرە بە یەکجار نزیکەی هەشتا خوێندکار یەك دیدیان لەسەر مێژوویەکی ئاڵۆزی واهەبوو کە سەدان کتێبی خاوەن دیدی جیاوازی لەسەر نووسراون.

بەو هیوایەی ئەم هەوڵە سەرەتایيو نەوازشیە دەستگرۆییەك بێت بۆ هەوڵی زانستخوازی هەموان، ئەگەرچی لەهەندێ خاڵو لایەندا لەگەڵ نووسەردا هاوڕا نینو دەکرێت رامان زۆر لەیەکدی جیاواز بێت، بەڵام تا ئاستێکی زۆر نووسەر توانیویەتی دیدێکی خاوەن ویژدانو خاوەن بنەمای زانستی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بگرێتەبەر، بەڵکوو هەموو لایەنە چاكو خراپەکانی ژیارو مێژووی ئەورووپای خستوەتە بەرچاو، ئەمەش لەوانەیە بۆ کەسانێك زۆر سەخت بێت، چونکە هەندێك لە تاو سەرسامبوونیان بە ئەورووپاو بەکەمدانانی ڕۆژهەڵات (کەزۆرجار لە مایەپووچی خۆیانە) خەریکە بەچاوی پیرۆزیەوە سەیری مێژووی ئەورووپا بکەنو هەوڵبدەن دەوروبەریشیان بەو دیدەی خۆیان گۆش بکەن، بۆیە بەخوێندنەوەی نووسینی لەم جۆرە لەوانەیە زیزبن، بەڵام با ئەوە لەبەرچاو بگرن ڕاستی مێژووی جیایە لە ململانێی هزری ئەمڕۆ، مێژوو دەبێت وا سەیر بکرێت کە ڕوویداوەو کەسانی پێش ئێمە ئەنجامیان داوەو ئێمەش دەبێت لەتەرازوویان بدەین تا چاكو خراپەکانیان بپێوینو سوودمەندبین، نەوەك خۆمان ببەینە ئەو سەردەمەو بکەوینە بەرگریکردنو دوێنێ بەسەر ئەمڕۆماندا بسەپێنین، ئەوەش لەبەرچاو بگرن ئەمە نووسەرێکی خاوەن دیدی ئیسلامی یان دژە ڕۆژئاوایی نیە تا

بڵـێن بـەبیرێکی توندڕەوانـە یـان دۆگمابینانـەی دژ بـە ئـەوروپا نوسـیویەتی، یان تاکێکی ڕۆژهەڵاتی نیە تا بلێین کینەی ڕۆژهەلاتـەو بە ڕۆژئاوای دەڕێـژێت. بەڵکوو کەسێکی بیانیەو بەچاوی لێکۆڵینەوەی زانستیەوە لایەنی چاك‌و خراپـی ڕۆژئاوای هێنـاوە، بۆیـە چـۆن باسـی لایەنـە چاکەکانی وەردەگـرین، با لایەنـە خراپـەکانیش ببینین.

دواجـار لـەخوا دەپاڕێمـەوە ئـەم کـارە بەنیـەتی دڵـسۆزیم وەربگرێـت‌و هـەر هەڵەیەکی تێدا بووەو لێی بێئاگا بوم لـێم ببورێـت، هیواداریـشم هـەموو خوێنـەرێك سوودی لێوەربگرێت.

(إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت وإليه أنيب)

نهاد جلال حبيب الله

٨/رجب/١٤٣٠ك

Nihad Hawramany@ Maktoob.Com

********************

# (پێشەکی نووسەر)

لەسەرەتای ئامادەکردن یان لێکۆڵینەوەی هەر بابەتێکدا پرسیارێکی شێوەیی دێت بەبیری مرۆڤداو ڕەوابوونیشی لەخودی بابەتەکەوە وەردەگرێت، ئەویش ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت: ئەو سوودە چییە کە لەڕووی مرۆیی و ئەخلاقی و هزرییەوە بەدوایدا دەگەڕێین؟ سوودی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەژیانماندا چییە؟

بەڵێ دەکرێت هەندێ جار ئەو پرسیارە سوودبەخشەی پەیوەستە بەلێکۆڵینەوە مێژووییەکانەوە وروژێنەرو نیشاندەری شتە شاراوەکان بێت و بەشێوەیەکی بەرچاو هاندەر بێت، بەڵام لەڕاستیدا لێرەدا بەهیچ جۆرێك دەرفەتی بۆ نییە، چونکە لێکۆڵینەوەی مێژووی بەتایبەت لەلایەن کەسانی لێکۆڵەری مێژووییەوە پێویستە وا سەیری بکرێت، وەك ئەوەی کەسێك بەسەر شاخێکدا سەرکەوێت، چونکە ئەوەی ئێمە دەمانەوێت بەدڵنیاییەوە لە لوتکەی ئەو شاخەدا بەدی دەکەین، ئەمەش ڕاستیەکی بێگومان و دوور لەمشتومڕە.

بانگەشەیەك دەڵێت هەرچییەك مرۆڤ لەڕابردوودا ئەنجامی داوە گرنگییەکی ڕاستەوخۆی بۆ ئەمڕۆی مرۆڤ هەیە، ئەو گرنگیدانە سروشتیەش وا لەهەموو مێژوو دەکات شیاوی باس و لێکۆڵینەوە بێت، بۆیە بۆ هیچ لێکۆڵەرێك یان تایبەتمەندێك ناگونجێت ئەگەر بەدیهێنانی جیاوازیە مێژووییەکانی نێوان سەردەمە مێژووییەکان یان دەم و ماوە مێژووییەکان لەیەکدی جیابکاتەوە، بەڵکوو مێژوو چەند ئەڵقەیەکی پێکەوە بەستراوە و ناکرێت ئەڵقەکانی لەیەکدی جیابکرێنەوە، ئەگەرنا ئەو سوودەی هیواخوازین بەدەستی بهێنن لەدەستدەچێت.

هەروەك هەموو کەسێك گرنگیدانی بەڵکوو مێژوو هەیە، ئەمەش لەڕاستیدا گرنگیدانێکی سروشتی و مرۆییە و لەناخی مرۆڤدا مێژوونووسێکی لێزان و وردبین خۆی حەشار دەدات، هەروەك پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین لێرەدا جیهانێکی ناکۆکی هەیە لەنێوان حەزی زانستخوازی خۆبەخۆ بەمەبەستی کات بەسەربردن کە مرۆڤ بەرەو خوێندنەوەیەکی کات بەسەربردن لەسەر کەسایەتیەکان یان ڕووداوە

لەگەڵ ( جەنگی کستبرگ یان شاژنی سکۆتلەندا (ماری) وەك ) دەبات مێژوویەکان وردو راستی لێکۆڵینەوەی کە تێڕامانەی ئەو و مەنهەجی سەختی لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەخۆ دەگرێت.

پاشان دەکرێت بپرسین سوودی مێژوو چیە؟ سەرەتا دەبێت بڵێین لێکۆڵینەوەی مێژوو ئەو پاڵنەرە مرۆییەی هەیە کە هەندێ کەس بەرەو لێکۆڵینەوەی هەر بابەتێکی مرۆیی دیکە دەبات، ئەویش پاڵنەری بەدیهێنانی مەعریفەی خودی مرۆڤایەتییە، بەدیهێنانی لێکۆڵینەوەی مێژوو ئەو داناییەیە کە ئیغریقیەکان کردبوویان بە لوتکەی ئامانجی ژیانی مرۆیی، ئەو داناییەش بریتیە لە ( خۆت بناسە ) سوقرات دەڵێت: ( ژیانێك کە ملکەچی وردبینی و پشکنین نەبێت شیاوی ئەوە نیە زیندوو رایگرین ).

ئەو لەو قسەیدا جەخت لەوە دەکاتەوە ئێمە وەك مرۆڤ بەبوونی مرۆییمان ناچینە پێگەی هۆش و بەرچاوڕوونیەوەو بەڕێی داناییدا ناڕۆین تا کاتێك وردبینی و راڤەی سروشتی مرۆییمان بکەین، بەلام ئایا لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆیی تەنها لێکۆڵینەوەیە لە کایەی تاکی مرۆڤ؟

ئیغریقیەکان تا ئاستێکی زۆر لەمەسەلەی لێکۆڵینەوەیان لەمرۆڤدا بەو دیدە بەرتەسکەوە پابەندبوون و نمونەی دابڕاویان لە لێکۆڵینەوە مرۆییەکاندا هێناوە، هەرچەندە تا ئاستێکی کەم گرنگیان بەخەڵك داوە لەبواری پەیوەندی حەقیقی مێژوویی و کۆمەلایەتیاندا، پاش گەشەسەندنێکی داخراوو هێواشی ئەو بیرو بروایانەش کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا ئینجا گەیشتنە قۆناغی کۆتاییان، روونبوویەوە ئەو دەروازەیە بۆ لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆیی بەس نیە، لەڕاستیدا ژیاری رۆژئاوایی کە لە هەموو شارستانیەتەکانی دیکە جیاواز بووە سەرەتای هۆشێکی روونی مرۆیی نیشانداوە لەو پێکهاتە مێژووییەی کە هەمیشە لەگۆڕاندایە.

ئێمە بۆ ئەوە مێژوو ناخوێنینەوە تا ئاسۆی زانیاریمان فراوان بکاتو گەشە بەزانیاریمان بداتو تەنها تاقیکردنەوەکانمان زیاد بکات، بەڵکوو تا خواستی زیادکردنی زانیاریمان بەرەو زانینی ڕووداوەکانی ڕابردوومان ببات و بتوانین لەوێوە ڕابردوو بە ئێستاوە ببەستینەوەو بنەڕەتی نەریتو دامەزراوەکانمانو ڕێگەی ژیانو جۆری حکومەتو چۆنێتی پێشکەوتنی بگرینەبەر، بەمەش ڕێ لەبەردەمماندا خۆش دەبێت تا لە ژیارو ڕۆشنبیریو کێشەکانی ژیاری ئێستا تێبگەین.

مێژوو لەنێو زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا پلەو پایەی یەکەمی هەیە، چونکە پێشەکیەکە کە هەرکەسێك بیەوێت لە هەر زانستێکی کۆمەڵایەتی وەك ئابووری یان جوگرافیاو سیاسەتو کۆمەڵناسیو زانستە سروشتیەکانو گەشەسەندنی ئەدەبو هونەر قووڵ بێتەوە، پێویستی بەو پێشەکیە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە گرنگە بەڵام زانستێکی وردو بێ ئەملاولای وەك بیرکاری نیە، چونکە هەرکات دەگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو تا لە باری ئەو کۆمەڵگەو خەڵکەی سەدەکانو دەمە مێژووییەکان بکۆڵینەوە، زۆربەی کات پێویستمان بە مەزەندە هەیە تا زانیاریەکان کۆبکەینەوەو بەشبەشیان بکەین لە چوارچێوە یان چەند چوارچێوەیەکی دیاریکراودا تا یارمەتیمان بدات لە لێکۆڵینەوە جیاوازە مێژوویی و مرۆییەکاندا، سەرەڕای ئەمەش زانایانی مێژوو زۆرجار لەسەر چەند ڕاستیەکی دیاریکراوی مێژوویی یەکدەنگن، بەڵام زۆرجار لەڕاڤەکردنیدا ڕاجیاوازن، بۆنمونە هەندێ لە مێژوونووسان کۆمەڵێك ڕاستی دێننو بەهۆکاری حەقیقی پشت هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ز. دادەنێن، بەڵام لە ڕاڤەی ئەو ڕاستیانەدا ڕاجیاوازن، هەیانە بۆ هەڵگیرسانی ئەو جەنگە ئەڵمانیاو نەمسا زیاتر تۆمەتبار دەکات، هەندێکی دیکەیش ڕوسیاو فەرەنساو بەریتانیا سەرزەنشت دەکەن.

دەکرێت وا لە مێژوو تێبگەین کە ناسینی خودی مرۆڤایەتیە، ئەگەر پرسیار لەجۆری ئەو کەسە بکەین کە یادەوەری خۆی لەدەستداوە -با هەر مرۆڤێك بێت-

ئەو کەسە لەکتوپڕێکدا هەرچی زانیوە لەبیری بکات، بەبێ گومان هیچ نیەو تەنها ئاژەڵێکەو بەس، واتە منداڵێ کە تازە لەدایك دەبێت زیاتر لەئاژەڵێك دەچێت کە هێزو توانایەکی شاردراوەو کەڵەکەبووی هەبێت، بەڵام ئایا دەکرێت یادەوەریەکان لەچوارچێوەی تاکی مرۆڤدا بەرتەسك بکەینەوەو لەیادەوەری بەکۆمەڵی ڕەگەزی مرۆیی بێ ئاگا بین؟

لەڕاستیدا ئەگەر ئامانج بەدیهێنانی زانیاری تەواو بێت ئەوا ناتوانین یادەوەری تاکێك وەربگرین، ئەو قسەی کە لە (ئۆلیسیس) وەرگیراوە کلیلی ڕاستی گرنگترین سوودەکانی مێژوومان پێدەبەخشێت (من بەشێکم لە هەموو ئەوەی پێش من هاتووە) ئەمە بەسیفەتی تاکەکەسی خۆم نا، بەڵکوو بەو سیفەتەی کە ئەندامێکی ناو کۆمەڵێکی جیاو تایبەتی مرۆڤم، ئیدی ژیار بێت یان کۆمەڵگە، چونکە ئێمە لەگەشەسەندنی کەسایەتی جیاوازماندا تەنها تۆمەتبار نین بەپەیوەندی تاکە کەسی یان بنەماڵەییمان، بەڵکوو بەو گۆڕانە زۆرانەش کە لەژیانی کۆمەڵایەتیماندا ڕوودەدەن‌و چەند سەدەیەك پێشتر زۆربەیان ڕوویانداوە، ئەوەش ئەوەیە کە پێی دەڵێین مێژوو.

ئیدی هۆشیاریمان بەو ڕاستیە هەبێت یان نا، ئەوا ئێمە تەنها یادەوەریەکی تاکەکەسیمان نیە، بەڵکوو لە یادەوەری بەکۆمەڵی هەموو ڕووداوەکانی ڕابردووی ڕەگەزی مرۆییدا بەشدارین، پاشان هەموو تاکێکی مێژوویی ئایا ئەو ڕاستیە پڕ گرنگیە بزانێت یان تەواو لێی بێ ئاگابێت، چونکە ژیانی هەریەکەمان مەحکومە بەو ڕووداوانەی لەماوەی سەدان ساڵ لە وڵاتانێکی دوور لە ئێمەش ڕوویانداوە، ئێمەش هەرچەندە تێگەیشتنمان سنوردار بێت لەژیانی ڕۆژانەماندا بەپێی ئەو ڕووداوانە هەڵسوکەوت دەکەین، چونکە بەڕوانین بۆ ئەو یادەوەریە کۆمەڵایەتیەو یادەوەری تاکە کەسی خۆیشمان، قسەکەی سوقرات دەڵێینەوە (ئەو ژیانەی ملکەچی پشکنین‌و وردبینی نەبێت شیاوی ئەوە نیە زیندووی ڕابگرین)، چونکە ئەو یادەوەریەی ڕابردوو کە نادرێتە بەر پشکنینی ورد تەنها ئەفسانەیە، کاریگەری

ئەفسانەو بڕیاردانی پێشتریش بەسەر کردەی کۆمەڵایەتیدا هەرچیەك بێت هەڵەیەو ڕاست نیە، مێژووش وەك زانستێك و چالاکیەکانی، عەقڵی یادەوەری ڕابردوو دەخاتە بەر وردبینی ڕاستاڵ، لەڕوانگەی پەیڕەوی ئەو مەنهەجە زانستیانەش کە زانایانی سەدەی پێشوو دایانهێنان مێژوو هەوڵدەدات پەردەی سەر ڕابردوو هەڵبداتەوە ( وەك ئەوەی چۆن بووە ) نەوەك لەسەر بنەمای چەند ئەفسانە یان بڕیارێکی پێشتر کە لەپێناو ماستاوچێتی بۆ کۆمەڵ و گەلان گەشەیان سەندووەو خۆیان سەپاندووە.

بە سروشتی حاڵ تێگەیشتنی مێژوو وەك ئەوەی ڕوویداوە مرۆڤ بەرەو کەماڵی مەعریفی دەبات، لە لێکۆڵینەوەی مێژوویشدا زۆر جار کەماڵ بەدەست نایەت، تەنانەت ئەگەر چاکترین کارگێڕی ناو جیهان لەگەڵ ئەوپەڕی سووربوون و ئەوپەڕی پێگەیشتوویی هەبێت بۆ هەوڵی دەربازبوون لە کاریگەری خۆی، هێشتا مێژوونووس کاریگەر دەبێت بەو ئەفسانەو ویستانەی لەپاشخانی ڕۆشنبیری و هزری خۆیدا خۆیان حەشار داوە.

ئەم ڕاستیەش هەندێ مێژوونوسی بەرەو بێهیوایی و ڕووخان لەبەردەم واقیعی ڕێژەیی بردووەو پێیان وایە هەموو کەسێك مێژوونووسی خۆیەتی و لە مێژوودا ڕاستی ڕەهابوونی نیە، دەڵێن دەکرێت هەر ڕاڤەیەکی مێژوویی لەگەڵ ڕاڤەیەکی دیکەدا هاوتا بێ، هەموو ڕاڤەیەکی مێژوویش ئایا کەسی سادەو ئاسایی ناتایبەتمەند پێشکەشی بکات، یان لێکۆڵەری تایبەتمەند بێت، جەخت دەکاتەوە لەسەر ناوچەیی و جۆرێتی ئامانجە کۆمەڵایەتیە خوازراوەکان، ئەم بێ هیواییە زۆرجار لەئاستی خۆی لادەدات، هەرچەندە مامۆستاکان بەرەو لادان دەبات، بەڵام هەمیشە کارێکی پاك و چاکە.

لەگەڵ ئەوەی دان بەوەدا دەنێین ئەو مێژوونووسانەی لەسەدەیەك لەسەدەکانی ڕابردوو دەکۆڵنەوە هەندێ جار زۆر بەسەختی ڕاڤەیان جیاوازە، هەندێ جار دیدی هەرکامیان بۆ هۆکارو ئەنجامەکانی ئەو ڕووداوانەی لێیان

دەكۆڵنەوە جیاوازە، بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا لەچەند شتێكدا كۆكو هاوڕان، كاتێك مێـژوو گەشـەی سـەندو لەسـەدەی نۆزدەهەمـدا بـوو بەزانـست، مێژوونووسـان سەبارەت بە ڕاڤەی ڕابردوو گەشتنە چەند خاڵێكی گشتی، بەلاّم هێشتا لەسەر چەند مەسەلەیەكی دیكە ڕاجیاوازو ناتەبان.

لێرەدا یەكبوونێكی نێو مشتومڕی نێوان مێژوونووسانو بنەڕەتێكی پتەوی ڕاستیە یەكدەنگیەكان سەبارەت بەڕابردوو هەیە، هەروەك مشتومڕێكی بەردەوام لەسەر چەند لایەنێكی دیكەی ڕابردوو هەیە، پێدەچێت دواجار لەسەر ئەوانەش بگەنە یەكدەنگی.

لێكۆڵەری مەیدانی مێژوو و خوێنەری بێدارو چاودێر خێرا تێدەگات لێرەدا مشتومڕێكی توند لەنێوان مێژوونووساندا هەیە، ئەگەریش كەمێك بەدواداچوونو بیرتیژی هەبێت، بۆی دەردەكەوێت ئەو ناكۆكیەی بەردەمی بەرەو ئاوابوون دەچێت، بەلاّم كەس بۆی نیە لەو ڕاستیە لابدات كە پاش چەند سەدەیەك كاری سەختی هەزاران زانا تا ئەمڕۆ بەهەمان پلەی دڵنیاییەی كە زانای سروشتی یان كیمیایی یان بیۆلۆجی ڕاستیەكانی جیهانی سروشت دەزانێت ئێمەیش چەندین شت لەبارەی ڕابردووەوە دەزانین، كەسی خوێنەرو لێكۆڵەریش نابێت بەهۆی ناكۆكی سەختی نێوان مێژوونووسان كە هەندێ جار دێتەكایە ڕێ لە خۆی ون بكاتو وای لێبكات گومان بەوە ببات مێژوو تەنها تووڕە بوونو دەنگ بەرزكردنەوەیە، بەپێچەوانەی ئەوەوە پێویستە مرۆڤ بەوپەڕی گوڕوتینەوە بنەوێتە لێكۆڵینەوەی مێژوو، چونكە دەبێتە هۆی ناسینی خودی مرۆڤایەتی، لێرەشەوە مرۆڤایەتی لەدەست ئەفسانەو ئەو خەونانە ڕزگار دەكات كە هێشتا زاڵن بەسەر جموجۆڵو ڕەفتاری گەلانی دیكەدا.

ئەگەر چی زانینی دروستی مێژوو وامان لێدەكات بەشێوەیەكی ئاسان و جوان پێشبینی داهاتوو بكەین هاوكات دواجار یارمەتیمان دەدات تا لەڕابردوودا بەداناییەكی زیاتر هەڵسوكەوت بكەین، چونكە ئەو كەسەی شارەزایی وردی

سەبارەت بە ڕووداوەکانی ڕابردوو هەیە زیاتر لە تێگەیشتنی تەواوی سروشتی مرۆڤایەتی نزیکە، بۆیە دەتوانێت بەدانایی و متمانەی زادەی مەعریفەی حەقیقیەوە هەڵسوکەوت بکات.

لەگەڵ هاتنی سالی ١٥٠٠ز.دا بەڕوونی دەرکەوت قۆناغێکی مێژوویی کۆتایی پێهات و قۆناغێکی نوێی مێژوویی خاوەن مۆرکی مرۆیی و ژیاری هزری و کۆمەڵایەتی شوێنی گرتەوە، لەو ماوەیەدا سەدەکانی ناوەڕاست کۆتاییان پێهات و سەرەتای سەردەمی نوێ بوو، بەڵام ئەو ماوە مێژووییە سەردەمێکی بەدوای خۆیدا هێنا کە بەدەوڵەمەندی فەرهەنگی و هزری و دامەزراوەیی ناسرابوو، سیستمی زاڵی وەك کڵێسای مەسیحی و حکومەتی نمونەیی و سیستمی سەرمایەداری و زانکۆ و چەند بیرێکی خاوەن بزاوت و زیندوێتی زیاتر، بەڵکوو بوونی بیری ڕۆمانسیو هزریو عەقڵانی و نیشتمانی و ڕێبازی زانستی لەخۆ دەگرت، سەرەڕای سروشتی تێکەڵ و ناتەبایی خودی مرۆڤ.

ئەگەر سوودی مێژوو ناسینی خودی مرۆڤایەتی بێت، ئەوا ناکرێت لە بێلایەنی بێباك بین و بەتەواوەتی لە هێڵە سەرەکیەکانی گەشەسەندنی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێ تێبگەین، چونکە چەندین لایەنی ژیاری سەدەی بیستەم تەنها بەرهەمی ئەزموونی سەردەمی نوێن، سەرەڕای مۆرکی ئەزمونی سەدەکانی ناوەڕاست ئەگەر (لەڕاستیدامندال باوکی مرۆڤە ) بەوجۆرەی کە شاعیران و دەروونناسان پێمان دەڵێن، ئەوا ئەزموونی نوێی ناو مێژووی ئەورروپی لە سنورێکی دیاریکراوی ئەزموونی سەدەکانی ناوەڕاستدا هێشتا بەسەر تواناکانی ئەورروپا و مێژووی ئەورروپیدا زاڵە، ئیدی ئەو ئەزموونانە چاك بن یان خراپ بن تا ئەمرۆی ئێمەش بەردەوامن.

ئامانجی ئەو هەوڵە نەوازشیەی پێشکەشی خوێنەری دەکەین، ئەوەیە لایەنە بنەڕەتیەکانی ماوەی ئەزموونی مێژووی ئەورروپی ڕوونبکەینەوە، لەگەڵ باسکردن

چـاکی و شـیکاری دەسـتکەوت و سـەرکوتکاریەکانی، بـەرزی و نزمیـەکانی، چـاکی و خراپەکانی.

هەوڵماندا وە بە پێنج بەشی سەرەکی ئەمە بخەینـە بەر باس، هـەر بەشێکیان قۆنـاغێکی بەرفراوانی مێـژوویی لـەخۆدەگرێت، لەهـەر باسـێکدا ئـەو لایەنانـەمان باسکردوون کە لەم پێشەکیەدا ئامارژەمان پێدان، ئەو دیاردانەشمان باسکردوون کە تایبەتمەنـدی ئـەو سـەردەمەن، بەهـەموو لایەنـە جیاجیاکانیـەوە، پێمـان بـاش بـوو بەشـەکانی مێـژووی ئـەوروپا پێکـەوە بهێـنین تـا بـۆ شـارەزایی سـەردەمی قۆنـاغی نـوێی مێـژوویی و زانینـی دیمـەن و تایبەتمەندیـەکانی سـەردەمی نـوێ لەدیـدی مێژووی ڕابردوویەوە باس و خواسەکان ڕوون بکەینەوە.

جفری برۆن

*******************

# بەشی یەکەم:
# مێژووی ئەوروپا لەسەدەکانی کۆنو ناوڕاستدا

## باسی یەکەم:
## دیاردە سەرەکییەکان.

## باسی دووەم:
## ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیو مەسیحییەکان.

## باسی چوارەم:
## بەربەرەکانو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

## باسی پێنجەم: شانشینە فرەنجییەکان.

## باسی شەشەم: گۆڕانکارییەکانی ژیاری ئەوروپی لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا.

# باسی یەکەم
# دیاردە سەرەکییەکان
# دروستبوونی ئەوروپا

وشەی ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ ناوی (ئیروپا)ی کچی فیونکس کە لەچیرۆکە ئەفسانەییە ئیغریقیەکاندا هاتووە، یان دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (ئیرب)ی فینیقی کە بەواتای خۆرئاوابوون دێت. ئەورووپا مەڵبەندێکی گرنگی ڕۆشنبیری و ئابووری بوو. زۆربەی زمانە ئەورپییەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ زمانی ئاری جگە لەزمانی (ویلز)و (ئیسکتلەندا)و (ئێرلەندا)و (بەریتانیا)، چونکە بنەڕەتی زمانی ئەمانە سلتیە.

دانیشتوانی ئەورووپا لە سەردەمی بلیۆبیی دا لەسەر ڕاوکردنی ماسی و ئاژەڵان دەژیان لەسەردەمی نیۆلیتیشدا ئاژەڵیان دەلەوەڕاندو کشتوکاڵیان دەکرد. کانزاکاری برۆنز لە کریت لەساڵی (٣٠٠٠ پ، ز) دەستیپێکرد، ئەمەش لە میسری و فینیقیەکانەوە گوازرایەوە. پیشەسازی کانزاکاری لەساڵی (٣٠٠٠پ،ز)دا گەشتە ئەڵمانیا و بەریتانیا یۆنانییەکان لەساڵی (١٤٠٠پ، ز) دا یاری میسینیان دامەزراند. ئەو ژیارەش گوازرایەوە بۆ باکووری ڕۆژئاوای ئەوروپا.

لەساڵی (٧٠٠ پ، ز)دا لەئەوروپا ئەبجەدی فینیقی و دراوی ئاسیای بچووك بڵاوبوویەوە، لەسەردەمی چوارەم و شەشەمی پ، ز. یشدا ژیاری ئیغریقی دامەزرا، لەسەدەی سێیەمی پ، ز. یشدا ژیاری ڕۆمانی لەنیمچەدوورگەی ئیتالیا دەرکەوت و تاسەدەی دووەمی پ، ز. مایەوە و تیایدا یەکانگیری ژیاری ئیغریقی بوو. ئیغریقیە کۆنەکان و ڕۆمانەکانیش چەند ژیارێکی گەورەیان بونیادنان کە بەفەلسەفە و هونەری جوان و حکومەت و کارگێڕی بەناوبانگ بوون.

لەبنەڕەتدا ئەورپییەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە لەشێوەی چەند شەپۆلێکی کۆچبەراندا بەخاکی ئاسیای بچووك بەرەو بەلقان بەرۆژهەڵاتی ئەورووپا یان لەدەوروبەری دەریای ڕەشدا کشان تا بەدوای گژوگیادا بگەڕێن، ئەمەش لەسەردەمی پێش مێژوودا بوو.

مرۆڤی ژیر لەئەوروپا لەکۆتاییەکانی سەردەمی بەردینی دەرکەوت، مرۆڤی نەوێ قەرەوڵگرو کۆکەرەوەی بەرهەم بوو. لەدوای خۆشی ئەو کاریگەرییانەی بەجێهێشت کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٥ هەزار تا ١٠ هەزار ساڵ لەدەوروبەری دووسەد ئەشکەوتدا کە زۆربەیان لەئیسپانیا و فەرەنسا بوون.

لەسەردەمی بەردینی نوێدا مرۆڤی ئەوروپی پەیڕەوی کشتوکاڵی دەستپێکرد تا شوێنی راوچێتی بگرێتەوە، لەماوەی هەزارەی شەشەمی پ، ز. یشدا کشتوکاڵ لەرۆژئاوای ئەوروپا بڵاوبوویەوە.

ئەم ژیارە نیۆلیشیانە لە ساڵی ٥٠٠٠ی پ، ز دا دەستیانپێکرد، کاتێک پەیکەری بەردینی زەبەلاح هاتەکایەوە لەو ماوەیەدا رۆشنبیری دانوب و بەلقان لەسربیا و یۆنانی کۆن کە خاوەن گوندی سەخت و پتەو بوو دامەزرا.

پشکنینەکانی ئەو ناوچە ژیاریانەی بەلقان ئەوەیان نیشان داوە کە لە ٤٠٠٠ پ، ز. دا مس لە ژیاری فینشادا بەکارهاتووە، لەو ماوەدا لەدەریای بەلتیقەوە عتیر دەهێنرا کە گرنگی خۆی هەبوو، لەماوەی هەزارەی سێیەمی پ، ز. یشدا مس و قەڵایی بەشێوەیەکی زۆر لەبوهیما (تشیك) لەنێوەندی ئەورپا دۆزرایەوەو برۆنزیان لێ دروست دەکرا، گۆرستانی پاشاکان و چینی دەوڵەمەند لەو ماوەیەدا ئاماژەبوو بەگۆڕێك کە خۆڵی لەسەربوو، بەڵام لە کۆتاییەکانی هەزارەکەدا پەنایان برد بۆ سووتاندنی مردووەکان و خۆڵمێشەکەیان دەخستە گۆزەوە، ئەم نەریتەش لەژیاری ئیبرنفلددا دەگیرایەبەر تا ئەمڕۆش نازانرێت زانی هیندۆ ئەوروپی لەکیشوەری ئەوروپی چۆن پەیدابوو، دەڵێن هیندۆ ئەوروپییەکان لەباکووری دەریای رەش لەساڵی ٢٥٠٠ پ. ز. ژیاون و دوای هێرش بردنە سەری لەبەلقاندا بڵاووبونەتەوەو لەگەڵ خۆیاندا لەساڵی ٢٢٠٠ پ. ز. ئەسپییان بردۆتە ئەوروپا، دواتر لەماوەی نیوەی سەردەمی برۆنزی بەناوچەکانی تری ئەوروپیدا بڵاوبوونەتەوە.

لەسەردەمی ئاسنیندا کە لەساڵی هەزاری پ. ز. دەسپێدەکات و ژیاری ئیرفلیند کە لایەنە سەرەکییەکانی بەلای ڕووبارەکاندا بڵاوبوونەوە بوویە هۆی

پێکهێنانی چەند کۆمەڵێکی مرۆیی وەك سلتو سلاڤو ئەوانەی بەئیتاڵی قسەیان دەکرد لەگەڵ لیریاتییەکاندا. هەروەك لەباکووری ئیتالیا ژیاری ڤیلانوڤان لەنێوان هەزای پ. ز. بۆ حەوت سەدەی پ. ز. دەرکەوتو گرنگی خۆی هەبوو.

ژیارێکی هاوشێوەش دەرکەوت کە ژیاری هالشان بوو، لەنێوان سەدەی هەشتی پ. ز بۆ پێنجی پ. ز. دابوو کە لەگەڵ سلتەکان لەزۆربەی رۆژئاوای ئەوروپا لەنێوان سەدەی حەوتی پ. ز. بۆ چواری پ. ز. بلاْوبوونەوە، ژیاری سلت بەژیاری لاتین ناسرا کە بەشێکی زۆری لەژیاری هالشت وەرگرت.

گەلە جەرمانییەکانیش لەسالاْنی پێنج سەدی (پ. ز)ەوە لەباشووری ئەسکەندەنافیا و بەلتیق بلاْودەبوونەوە، لەسالاْنی هەشت سەدی پ. ز دا پاش هێرشی دوورییەکان ژیاری ئیغریقی هەڵهات، بەلاْم بەشێوەیەکی پێچەوانەی میسینیەکان، ئەمەش بەهۆی ئەو فینیقیانەوە کە چەند مەڵبەندێکی بازرگانیو ژیارییان لەدەریای سپی ناوڕاستدا دامەزراندو چەند رەگەزێکیان بەئاراستەی رۆژئاوا بلاْوکردەوە، ئیغریقیەکانیش لەوانەوە ئەبجەدییان وەرگرت، بەلاْم پیتەکانی (عیللە) یان بۆ زیادکرد.

لەسەدەی هەشتی پ. ز دا ئیغریقییەکان لەداگیرکەنیاندا بلاْودەبوونەوە بەتایبەت لەباشووری ئیتالیادا، لەسەدەی دوای ئەویشدا ژیاری هیللی گەشتە لوتکە، ئاڵوگۆری بازرگانی نێوان ئەو ناوچە داگیرکراوانەو ئیغریقییەکانیش بویە هۆی بلاْوبوونەوەی رۆشنبیری ئیغریقی، ئەوان لەمیراتی ژیاری خۆیان دەترسانو جگە لەخۆیان بە بەربەریان دادەنا، زۆربەی کۆمەڵە رەگەزییەکانی رۆژئاوای ئەوروپا لەوانیش ئیترو سکانك کە ژیاری فیلانۆ ڤانیان دامەزراند لەگەڵ رۆشنبیری ئیغریقی دا یەکانگیربوون.

چەند مەڵبەندێکی ئیغریقیش وەك ئەثینا لەسەدەی لەسەدەی پێنجەمی پ. ز دا بەرەو دیمرکراتییەت گەشەیان سەند، لەو ماوەشدا یۆنان بەمەترسی فارسی هەرەشەی لێدەکرا بە تایبەت کە ئاسیای بچووك ملکەچی فارسەکان بوو بوو،

فارسەکان لەساڵی ٤٩٠ پ. ز دا هێرشیان بردبوویە سەر یۆنان و دوای راوەدوونانیان لە ٤٧٩ پ. ز ئەپینای دیموکراتی بوو بە هێزی گەورەی جیهانی ئیغریقی و لەناوچەی دەریای ئیجە ئیمپراتۆریەتی ئەپینا دامەزرا، ئەمە کامڵبوونێکی رۆشنبیری و ئابووری لەسەدەی پێنجەمی پ. ز بەدیهێنا، ئەو سەردەمە بەسەردەمی زێرینی تەقلیدی ژیاری ئیغریقی دادەنرێت. دواتر ململانێ ناوخۆییەکانی نێوان شارە یۆنانیەکان بڵاوبوویەوە تائەوەی هێزی مەکدۆنیا لەباکووری یۆنان لەسەر دەستی فلیپی و ئەسکەندەری گەورەی کوڕی لەداوی ئەو لەسەدەی چوارەمی پ.ز دا دەرکەوت و یۆنان و مەکدۆنیا یەکیانگرت و ئەسکەندەر دەستیگرت بەسەر میسرو شام و وڵاتی فارس تا هیند.

پاشان ڕۆمانەکان ئەو ئیمپراتۆریەتە هێلینییەیان لەناوبرد داوی ئەوەی دەستیانگرت بەسەر مەقدۆنیادا، یۆنانی سەدەی دووەمی پ. ز وەك یۆنانی سەردەمی ئاسنین نەبوو، بەڵکو بەسەر چەند کۆمەڵێکی رەگەزی و زمانەوانیدا دابەش بوو بوو کە چاویان لەژیاری سەردەمی نیۆلیتی تازە پێگەشتوو بوو ئەو کۆمەڵانەش پێکهاتەی چەند جۆرێك هیندۆ ئەورووپییەکان بوون، ئەمانە لەهەزارەی دووەمی پ. ز بەرەو باکووری ئیتالیا کشابوون و نیمچە دوورگەی ئیتالیاشی گرتەوە، زۆربەی ئەو کۆمەڵانەش لە ئیتاڵیەکان بوون.

گەورەترین ژیاری سەردەمی ئاسنین ژیاری فیلانۆ فانالتی بوو کە لەباکووردا دامەزراو کاریگەری خۆی لەسەر ناوچەکانی دەوروبەر هەبوو، ئیترۆسکانەکانیش لەسەدەی دەیەمی پ. ز. ەوە لەئاسیای بچووکەوە کشان و لەنێوەندی ئیتالیا سەقامگیر بوون و ژیارێکی ئاوێتەی (فیلانۆڤی و ڕەگەزە رۆژهەڵاتییەکان و لەگەڵیشیاندا ژیاری ئیغریقی) یان پێکهێنا.

لە ٧٥٣پ. ز. دا لەشاری ڕۆما لەسەر ڕووباری تیبر دامەزرا، ڕۆمانەکان گەلێکی لاتینی سەر بەکۆمەڵەی ئیتالی بوون، ڕۆما لەسەرەتادا گوندێکی سەرەتایی بوو کە ئیترۆسکانەکان تا کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمی پ. ز. داگیریان کردبوو،

دواتـر ڕۆمانـەکان کەوتنـە داگیرکردنـی ناوچـەکانی دەروبـەریان، لەسـەرەتاکانی سەدەی چوارەمی پ. ز. دا هێرشیان بردە سەر گالـەکان، گالـەکان چـەند هۆزێکی سـەلتەکان بـوون، لەسـەرەتای سـەدەی سـێیەمی پ. ز. ڕۆمانـەکان دەسـتیانگرت بەسـەر چـەند بەشـێکی گـەورەی ئیتالیـاداو کردیـان بـەڕۆمانی، ڕۆمانـەکان ڕێیان بڕی‌و زمانی لاتینـی خۆیـان‌و ژیاریـشیان یەکخست‌و ئیتر ڕۆما بەرامبەر بەقرتاج وەستا.

ڕۆمانـەکان لەسـەدەی دووەمـی پ. ز. دا بەتـەواوەتی دەسـتیانگرت بەسـەر باکووری ئـەفریقیاو دوورگـەکانی ڕۆژئـاوای دەریـای سپی ناوڕاسـت‌و مەقدۆنیاو یۆناندا، دەریای سپی ناوەڕاست لەسەردەمی یەکەمی پ. ز. دا بوو بەدەریاچەیەکی ڕۆمـانی، دواتـر ڕۆمانـەکان ڕێگـەیان دامەزرانـد تـا ئاسـانکاری پەیوەنـدی نێـوان بەشەکانی ئیمپراتۆریەت هەبێت‌و یەکبوونی ژیاری خۆیان بەدیهێنا.

تێکـەڵبوونی نێـوان ژیـاری هێلینـی‌و ڕۆمـانی بـوو بـەهۆی دوانـەبوونێکی زمانەوانی نێوان دانیشتوانی ڕۆژئاواو ئیغریقی لەرۆژهەلات، بە چەند جەنگێکی نـاوخۆیش ڕۆمـا لـەڕۆژانی دەسـەڵاتی ئۆگەسـت لەسـەدەی یەکـەمی پ. ز. لەکۆمارێکەوە بوو بەئیمپراتۆریەتێك. لە ٢١٢ پ. ز. دا ڕەگەزەکانی ژیاری ئیغریقی ڕۆمـانی کاریـانکردە سـەر هـۆزە جـەرمانی‌و سـەلتییەکان، لەسـەدەی سـێیەمی زاینیشدا ئیمپراتۆریەتەکە بەرەو هەڵوەشانەوە چوو. لەسەدەی چوارەمی زاینیشدا ئیمپراتـۆر قوسـتەنتین پایتـەختی لەڕۆمانـەوە بۆقوسـتەنتینییە گواسـتەوەو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتی دامەزراند.

ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی ڕۆژئـاوایش بەپایتەختەکەیـەوە لەسـەدەی پێنجـەمی زاینیـدا بـەرەو ڕووی شـاڵاوی جەرمەنـەکان بوویـەوە کـە شانشینە جەرمەنیـەکانیان پێکهێنـا، کڵێـساش میراتـی ڕۆمـانی پاراسـت، ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی کاریگـەری زمانـەوانی لاتینـی خـۆی بەجێهێـشت‌و فەرەنـسی‌و پورتوگـاڵی‌و ئیتـاڵی‌و ئیـسپانی لەلاتینی کەوتنەوە.

لەسەدەی حەوتەمی زاینیدا عەرەبە موسڵمانەکان لەرۆژانی خەلافەتی ئومەویدا ئیسپانیاو چەند بەشێکی باشووری فەرەنسایان گرت، باکووری ئەورووپاش بوو بە نشینگەی هۆزە فرەنجەکانی رۆژئاوای ئەورووپا، ئەمەش لەنێوان سەدەی پێنجەمی زایینی تا نۆیەمی زایینی دا بوو، ئەوانە بتپەرست بوون و چوونە سەر مەزهەبی کاپولیکی و بەکارۆلینجییەکان ناوبران، دیارترین پاشایان مەلیك شارلەمان بوو، لەسەردەمی ئەمدا فرەنجەکان بوونە گەورەی رۆژئاوای ئەورووپا و کەوتنە موژدەبەری مەسیحییەت، جا شانشینی فەرەنجی توانی زۆربەی ئەورووپا و رۆشنبیرییەکەی بێنێتە ناو سنووری خۆی، ئەمەش لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانییەوە رووی نەدابوو تا ئەوەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پیرۆزی لەژێر دەستی کڵێسای کاپولیکی راگەیاند.

لەساڵی ١٠٤٥ ز. دا ئەورووپا چووبە ماوەی گۆڕانێکی گەورەو کۆچی جەرمان و ئاسیاییەکان وەستاو ئەورووپا لەڕووی دانیشتوانەوە سەقامگیر بوو، بازرگانی بەشێوەیەکی زۆر لەئیتالیا و باشووری فەرەنساو هۆڵەندا فراوانبوو، ئەو ڕێنیسانسەی لەسەدەی چواردەی زایینییەوە دەرکەوت، ماوەی دەستکەوتەکانی هونەرمەندان و بیناسازە ئەورووپییەکان و سەردەمی دۆزینەوە گەورەکانی ئەوکات بوو کە لەسەدەی پانزەی زایینییەوە دەستیپێکرد و بەدۆزینەوەی دەریایی بۆخاك و دەریا نەزانراوەکان دەرکەوت، پورتوگال و بەریتانی و فەرەنسی و ئیسپانیەکان کاری داگیرکارییان لەئەفریقیاو ئاسیا و هەردوو ئەمریکادا گرتەبەر.

لەسەدەی هەژدەی زاینیدا چەند پیشەسازییەکی نوێ دەرکەوتن و گەشەیان سەند، لەسەدەی بیستەمیشدا ئەورووپا بەرەو ڕووی دوو جەنگی جیهانی بوویەوە کە لە ساڵی ١٩٤٥ز. کۆتاییان پێهات، دوای ئەو دوو جەنگە ئەورووپا بۆ دوو سەربازگە دابەشبوو، سەربازگەی رۆژهەڵاتی بە ڕێبەری یەکێتی سۆڤیەت و سەربازگەی رۆژئاوایی بە ڕێبەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەساڵانی نێوان ١٩٨٩ تا ١٩٩١ز. دا بەرەی رۆژهەڵاتی بەلێکهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت دارما و ئەورووپا چووبە ناو ئەو چەمکە ناسراوە بە تاك جەمسەری زاڵبوو بەسەر جیهاندا لەڕووی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیرییەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێبەری ئەو ئاراستەیە دەکات.

**********************

# سەرەتاو کۆتایی سەردەمی کۆن

کۆمەڵگەی مرۆیی لەماوەی مێژووی دوورودرێژی خۆیدا بە چەندین قۆناغدا تێپەڕبووەو هەریەکەیان چەند تایبەتمەندییەکی لەقۆناغی مێژوویی پێش خۆیو دوای خۆی هەیە، دواتر زنجیرەیەکی پەیوەستی دا پێکدێنێت کەناکرێت لەیەکتر جیابکرێنەوە، سەرەتا یان کۆتایی قۆناغی مێژووییش ڕووداوێکی کتوپڕ نییە کەبکرێت بەساڵێکی کاتی دیاریکراو یان مانگ یان ڕۆژێکی دیاریکراو دەستنیشان بکرێت، بەڵکو چالاکی گواستنەوە لەقۆناغێکی مێژووییەوە بۆ قۆناغێکی دی بەشێوەیەکی هەنگاو بەهەنگاو ڕوودەدات کەهەندێ جار کاتێکی زۆری دەوێت، ئەو ڕاستییە مێژووییەش مۆرکێکی گشتگیری سەختی دیاریکردنی سەرەتاو کۆتایی هەر قۆناغێکی مێژووییمان پێدەبەخشێت، لەهەمان کاتیشدا لەڕاڤەی ڕاجیاوازی مێژوونووسان و لێکۆلەران لەسەر ئەو بابەتەمان بۆ دەکات.

بێگومان باری وا بەتەواوەتی بەسەر قۆناغ یان سەردەمەکانی مێژوویی مرۆیی ئەوروپیدا پەیرەو دەبێت، لەگەڵ ئەوەی دەزانین سەختی بابەتی بەهەر جۆرێك بێت واتای نەکران و مەحاڵبوونی دابەشکردنی مێژوویی ئەورووپی نییە بۆچەند قۆناغێك یان سەردەمێك کەدەکرێت هەریەکەیان چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی هەبێت کەمۆرکی زاڵی ئەو قۆناغە پێکبێنێت، ئەو دابەشکارییەی کەلەمڕۆدا بۆمێژووی ئەورووپی زیاتر باوە، ئەوەیە کە چوار قۆناغی مێژوویی دابەشی دەکات: سەردەمی کۆن، سەدەکانی ناوەڕاست، سەردەمی نوێ، سەردەمی ئێستا (هاوچەرخ).

ئەو مێژوونووسانەش کە بەو دابەشکارییە کاردەکەن لەدەستنیشانکردنی ماوەی کاتی ئەو قۆناغانە ڕاجیاوازن، ئەمەش بەپێی جیاوازی دەرهاویشتەو پاڵنەریان لەلێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەوروپیدا، جا هەندێکیان هاوڕێی ویستیان ئەوەیە کەڕووداوێکی جەنگی دیاریکراو بکەنە سنورێکی یەکلاکەرەوەی دوو سەردەم یان قۆناغی مێژوویی، هەندێکی تریش ڕووداوێکی سیاسی یان ئایینی

یان گەشەسەندن و گۆڕانێکی ئابووری گرنگ یان بزاڤێکی زانستی نوێ دەکەنە سنورێکی جیاکەرەوە ئەمەش بەپێی تێڕوانینییان بۆماوەی نێوان دوو سەردەم یان قۆناغی مێژوویی.

بەپێی ئەوەی پێشوو، تێبینی ئەوە دەکەین کەهەندێ لە مێژوونووسان جەنگی ئەدرنەی ساڵی ٣٧٨ ز، یان ڕووخانی ڕۆما لەساڵی ٤١٠ ز، یان ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەساڵی ٤٧٦ ز، دەکەنە کۆتایی سەردەمی کۆن و سەرەتای سەردەمی ناوەڕاست، لەکاتێکدا هەندێکی تر ئەو گواستنەوەی نێوان دوو سەردەمە مێژووییە بەهاتنە سەر دەسەڵاتی دیقلدیانوسی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (٢٨٤ز-٣٠٥ز) دەستنیشان دەکەن، ئەمەش بەهۆی ئەو چاکسازییە گۆڕانکارییانەی کە سەردەمەکەی لە کارگێڕی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بەخۆیەوە دی، لەکاتێکدا هەندێکی تر دەیبەستنەوە بە سەرەتای سەردەمی قوستەنتینییەوە (٣٠٥ز-٣٣٧ز) کە پیاتەختی لەڕۆماوە بۆقوستەنتینیە گواستەوەو مەرسومی ناسراو بە (میلان)ی لەساڵی ٣١٣ ز دەکرد کە بەو پێیە دانی نا بەئایینی مەسیحی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا.

هەندێکی تر پێیان وایە سنورێکی جیاکەرەوەی نێوان دوو سەردەمەکە خۆی لەمردنی ئیمپراتۆر ئیۆدوسیوس لەساڵی ٣٩٥ز دەبینێەوە، چونکە مردنی ئەو بوو بەهۆکاری دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەنێوان هەردوو کوڕەکەیدا (ئەرکادیۆس)و (هۆنوریوس)و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دابەشبوو بۆبەشی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی.

ژمارەیەکی کەمیش لەمێژوونووسان پێیان وایە سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (جستنیان) (٥٢٧ز-٥٦٥ز) سنووری جیاکەرەوەیە، چونکە ئەو کۆتا کەس بووە هەوڵیداوە بەشی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یەکبخاتەوە، بۆیە سنووری جیاکەرەوەی سەردەمی کۆن و سەردەمی ناوەڕاستی ئەورووپایە.

بەچاوپۆشی لەو ڕاو دیدە جیاوازانە لەدیدو نوسینەوەی مێژووی ئەورووپی و دیاریکردنی دیاردە مێژووییەکانیدا، زۆربەی مێژوونووسان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ساڵی ٤٦٧ ز. کە ساڵی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانییە لەسەر دەستی ئەدۆکەر، خاڵی گۆڕانی گرنگی گواستنەوەی ئەورووپایە لەسەردەمی کۆنەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست.

دەکرێت بڵێین گواستنەوە لەسەردەمی کۆنەوە بۆسەردەمی ناوەڕاست لەنیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی زاینییەوە بووەو ئەو گواستنەوەش بەپێی هەروەها لەئەنجامی چەندین هۆکاری بەشداربووەوە دێت کە لەپێش ئەو مێژووەدا بووە، ئەویش دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و شلۆقی و دارمانی و چوونە ناوی مەسیحیەتەوە وەك ڕەگەزێکی گرنگ لەپێکهێنانی مێژووی ئەورووپی و کەڵەکەبوونی شاڵاوی هۆزە جەرمەنییە بەربەرەکان و ڕووخانی ئیمپراتۆیەتی ڕۆمانی لەرۆژئاواو سەپاندنی مۆرکێکی نوێیە بەسەر کیشوەری ئەورووپیدا.

وەك چۆن مێژوونووسان لەدیاریکردنی سەرەتای سەردەمی ناوەڕستدا ڕاجیاوازن، بەهەمان شێوە لەدیاریکردنی کۆتایی ئەو سەردەمەو سەرەتای سەردەمی نوێشدا ڕاجیاوازن، دەستەیەك ڕووخانی قوستەنتینیە لەسەر دەستی تورکە عوسمانییەکان لەساڵی ١٤٥٣ز کە ساڵی دۆزینەوەی کۆلۆمبسە بۆ کیشوەری ئەمریکی (جیهانی نوێ) دەکەنە سنوورێکی یەکلاکەرەوەی سەردەمی ناوەڕاست و نوێ، دەستەیەکی تریش ساڵی ١٥١٧ز. کە ساڵی ڕاپەڕینی مارتن لۆپهری چاکسازی ئایینییە بەسەر کڵێسای کاتولیکدا دەکەنە سنووری یەکلاکەرەوەی نێوان دوو سەردەمەکە.

دەکرێت بڵێین ماوەی کۆتایی سەردەمی ناوەڕاست چەند گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری گەورەی بەخۆیەوە دیوە کە بۆتە هۆی گواستنەوەی ئەورووپا بۆسەردەمی نوێ، ئەو گۆڕانانەش لەنیوەی دووەمی سەدەی پانزەدا ڕوویاندا، ئەو ماوەش چەند ڕووداوێکی گرنگی بەخۆیەوە دی وەك جەنگی سەد ساڵەی نێوان ئینگلتەراو فەرەنسا و ڕووخانی قوستەنتینیە و دۆزینەوەی

جیهانی نوێ لەکیشوەری ئەمریکی و رووخانی غەرناتە لەساڵی ١٤٩٢ ز. و دۆزینەوەی ڕێگەی سەری هیوای چاك (رأس الرجا و الصالح) لەساڵی ١٤٩٧ز. ئەو رووداوانە بوونە هۆی دەرکەوتنی بەرەبەیانی سەردەمێکی نوێ کە ڕێنیسانسی ئەورووپی و دۆزینەوە جوگرافییەکان و بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی بەخۆیەوە دی کە دواتر بەسەردەمی نوێ ناسراو دواتریش بەدوورودرێژی قسەی لەسەر دەکەین.

سەبارەت بەکۆتایی سەردەمی نوێ و سەرەتای سەردەمی هاوچەرخ، خەریکە هەموو مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەکدەنگ بن کە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم لەساڵی ١٩١٨ز سنووری یەکلاکەرەوەی نێوان ئەو دوو سەردەمەیە، لەسەر ئەو بنەڕەتەش دەکرێت قۆناغەکانی مێژووی ئەورووپی بۆ ئەم قۆناغانە دابەش بکەین:

- سەردەمی کۆن لەپێش ساڵی ٤٧٦ ز.
- سەردەمی ناوەڕاست ٤٧٦ ز-١٥٠٠ز.
- سەردەمی نوێ ١٥٠٠ز – ١٩١٨ز.
- سەردەمی هاوچەرخ ١٩١٨ز – تائەمڕۆ.

لەگەڵ ئەوەی جارێکی دی جەخت دەکەینەوە لەسەر گرنگی زانینی ئەوەی ئەو دابەشکارییە بەهەر جۆرێك بێت بەجیاکەرەوەی قۆناغە مێژووییەکان و لێکۆڵینەوەیان بەشێوەیەکی جیاکردنەوەی لەڕووداوەکانی پێش خۆی یان دەرەنجامەکامی دوای خۆی سەیر بکرێت، بەڵکو لەبەر ئاسانکاری لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەورووپی و پێشکەشکردنی بەپێی پێناوێکی ڕوون و ڕیزبەندی و ڕێکوپێك پشتمان بەم دابەشکارییە بەستووە:

*__دیاردەکانی گۆڕان__: ئەمەش بەپێی دابەشکاری پێشوو بەشداربووانە خۆی دەنوێنێت، بەتایبەت ئەوەی لەنێوان سەردەمی کۆن و ناوەڕاستدا هەیە بۆیە هەوڵدەدەین لێرەدا لەم ڕوانگانەوە بیانخەینە ڕوو:

*__لایەنی سیاسی__: لەسەدەی چوارەم و پێنجەم خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەر دەستی بەربەرە جەرمەنییەکان کەوت، جەرمەنییەکانیش چەند دەسەڵاتێکیان تێدا دامەزراند وەك: شانشینی فەرەنجی، شانشینی قووتە

ڕۆژئاواییەکان، شانشینی قووتە ڕۆژهەڵاتییەکان، شانشینی وەندالْ، بەوجۆرە واقیعی ڕامیاری ئەورووپی ئەوکات چوویە قۆناغێك کەسیفەتی زاڵبوونی ئەو قۆناغە فرەیی و بڵاوبوونەوەی بنیادی دەوڵەتان و شانشینەکان بوو، جا پاش ئەوەی بوونی تاکە ئیمپراتۆرێك کە فەرمانڕەوایی هەرێم بکات وەك کایەیەکی سیاسی و جوگرافی هاتە مەیدان، دەوڵەتان و شانشینە جیاجیاکان لێکهەڵوەشان و چەند قەوارەیەکی سیاسی دامەزران کە چەندین سیفەتیان وەرگرت.

لەلایەنی سیاسییەوە گواستنەوەی سیستمی ڕۆمانی لەڕۆماوە بۆ قوستەنتینیە و گۆڕینی سیستمی دەسەلات لەبێزەنتەوە بۆ سیستمی ئیمپراتۆری میراتگری هاتە کایە لەساڵی ٤٧٦ز. دا کورسی دەسەڵاتی ڕۆما کەوتە دەست بەربەرییەکان و دوای ئەوە هیچ ئیمپراتۆرێکی ڕۆمانی لەسەر ئەو کورسییە دانەنیشت، بەڵکو دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی لەڕۆمادا گوازرایەوە بۆ پاپا (ئوسقوفی ڕۆما).

## *لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی:

لەگەڵ سەرەتای سەدەی چوارەمی زاینیدا کۆیلەکان بوونە چینی سەرەکی ئیشکەری کشتوکاڵ و پیشەسازی، وەك چۆن باریان لەپێشتر لەسەدەی یەکەم و دووەمی زاینیدا لەو کاتەیان دەچوو، ژمارەی کۆیلەکان لەئەنجامی وەستانی جەنگە فراوانخوازییە ڕۆمانییەکان کەمیکرد، وێڕای ئەوەش کەمی وەڵامی کاری کۆیلەکان گەورە خاوەن زەوییەکانی هاندا تا زەوییە فراوانەکانیان بەسەر کۆیلەکانیاندا دابەشبکەن تاوەك کۆلۆن (جوتیاری پەیوەست بەزەوی) تیایدا کار بکەن بەرامبەر بەوەی بەشێکی بەرهەمەکە وەربگرن.

بەوجۆرە سیستمی کۆلۆنی لەپەیوەندییە کشتوکاڵیەکاندا زاڵبوو، ئەمە پاش ئەوەی لەسەدەکانی کۆندا سیستمی کۆیلایەتی (عبودی) زاڵبوو، سیستمی کۆلۆنی بەرەو سیستمی دەرەبەگی گەشەی سەند، ئەمەش (دەرەبەگایەتی) لەئەورووپا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵبوو.

***لایەنی هزری:**

لەسەدەکانی کۆندا ئایینی بتپەرستی یان فرەخوداوەندی کە لەسەر پەرستشی چەندین ئایین و بەپیرۆزدانانی ئیمپراتۆر وەستابوو بەسەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا زاڵبوو، ئەمەیان لەسەرەتای سەدەی چوارەمی زاینیدا دەسەڵاتە ڕۆمانییەکان دانیان نا بەئاییني ڕەسمی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، ئەمەش لەکۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی زاینیدا ڕوویدا.

بەمجۆرە ئاییني مەسیحی بەهەموو ئەوروپای ڕۆژئاوادا بلاوبوویەوەو پاش ماوەیەك بوو بەتاکە ئایین یان (ئاییني سەرەکی) هەموو گەلانی ئەورووپاو ڕێنماییەکانی مەسیحیەتیش بەمۆرکی خۆیەوە خۆی بەسەر ژیانی سیاسی و هزری هونەری لایەن و دیاردەکانی تری ژیاریدا سەپاند.

لەقۆناغی یەکەم و دووەمی سەدەی ناوەڕاستدا (٣٠٠-١٠٠٠ن) و (١٠٠٠-١٣٠٠ن) کڵێسای مەسیحی ڕۆشنبیری ئەورووپی قۆرخ کرد و دژ بەچەمك و دەربڕینە هزرییە ئازادیخوازە پێشکەتنخوازەکان وەستا، ئەو چەمك و دەربڕینانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندی چینی دەرەبەگیدا پێشوانەبوون.

جەنگی نێوان کڵێسای مەسیحی لەلایەك و چەمکە زانستییەکان و هزری پێشکەوتنخوازی ئازاد لەلایەکی ترەوە تا سەدەی پانزە مایەوەو ئەوکات کڵێسای مەسیحی لەبەردەم هزری زانستی بولرەکانی سیاسی و هزری هونەری و ئابووریدا شکاو لەو ئەنجامەشدا بزووتنەوەی مرۆیی کەوتە بوژاندنەوەی ڕۆشنبیری کلاسیکی (یۆنانی و ڕۆمانی) و ئەدیب و فەیلەسوف و زانایان کەوتنە هێرشبردنە سەر هزری ئاییني دواکەوتویی کە زادەی پەیوەندییە دەرەبەگیەکان بوو.

هەروەها ئامرازەکانی چاپ کەوتنە بلاوکردنەوەی هزری نوێی پێشکەتنخوازی کە بەرهەمی پەیوەندییە بۆرجوازییەکان بوو، ئەوەش بەشێکی ئەو دیاردە ژیارییانەبوو کە هەندێك وەك چەند بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ کۆتایی سەردەمانێك و سەرەتای سەردەمێکی تر دەیخەینەڕوو و دواتریش بەسەردەمی نوێ ناوبراو ئێمەش لەبەشەکانی تردا بەدوورودرێژی لەسەری دەوەستین.

## *قۆناغەکانی سەدەکانی ناوەڕاست:

پێش ئەوەی بچینە نێو دیاردەکانی سەدەکانی ناوڕاست، ناچارین ئەو پرسیارەی خوارەوە بوروژێنین، چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست کەی و بۆچی دەرکەوت؟

بەکارهێنانی چەمکی (سەدەکانی ناوەڕاست) لەسەرەتاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەدیبە مرۆڤگەرا ئیتالییەکان، ئەوانەی بەیەکەم بەکارهێنەری ئەو چەمکە دادەنرێن لەسەرەتاکانی سەدەی پانزەدا، پاشان ئەو چەمکە بڵاوبوویەوەو تائەمرۆ هات، مرۆڤگەرا ئیتالییەکان بەتایبەت بترارك تەواو هەواداری رۆشنبیری کلاسیکی (یۆنانی و ڕۆمانی)ن، بۆیە کەوتنە هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەو رۆشنبیرییە.

هەروەها پێیان وایە ئەو سەردەمەی تێیدا ژیاون سەردەمی ڕێنسانسە، چونکە تایبەتمەندی بوژاندنەوەی فەرهەنگی کلاسیکی کۆنی هەیەو قۆناغی مێژوویی درێژەپێدەری دارمانی کورسی دەسەڵاتی ڕۆما لەسەر دەستی بەرەبەرەکان لەساڵی ٤٧٦ز تا ئەو سەردەمەی خۆیان کە تیایدا دەژین بەقۆناغی دواکەوتویی و دارمان دەزانی، چونکە تیایدا ژیانێکی بەربەری زفت زاڵبوو کەتیایدا مەشغوڵی ژیاری پێشکەوتووی کلاسیکی دامرکێنرابوو، بەمەش سەدەکانی ناوەڕاست بەڕای ئەوان (چەند سەردەمێکی تاریکن) و لەهەموو لایەن و بوارەکاندا دواکەوتوون.

ئەو دیدە بۆ سەردەمەکانی ناوەڕاست بەتێپەڕبوونی کات و دەرکەوتنی چەند بیریارێکی ئەوروپی کە لەو سەردەمەدا چاویان لەژیارێکی نوێی تازەو نوێ بوو بەرەو گۆڕان دەچوو، ئەو بیریارانە لایەنەکانی وێنەی ژیاریان بۆخەڵك و لێکۆڵەران نیشان دەداو روون دەکردەوە.

جیهانی سەدەکانی ناوەڕاست لەئەوروپا لەسەریەك ڕەوت نەدەچوو و ناکرێت بڵێین ئەوخەڵکەی لەو قۆناغە مێژووییە دوورو درێژەدا ژیاون (٣٠٠-١٥٠٠ز) لەسەر یەك ڕەوت و سیستمی یەکگرتوو ژیابن.

باری خەڵکیش بە تێپەڕ بوونی کات هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێشەوە دەچوو، بۆیە هەندێ لەمێژوونووسان مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست بۆسێ قۆناغی مێژووی

سەرەکی دابەش دەکەن کەهەریەکەیان تایبەتمەندی جیاکەرەوەی لەویتر هەیەو لەکات و شوێندا جۆرە جیاوازی و لادانێکیان هەیە.

**قۆناغی یەکەم**: ئەو قۆناغەیە کەماوەی حەوت سەدە بەردەوام بووە (لەسەرەتای سەدەی چوارەمەوە تاکۆتایی سەدەی دەیەم)، لەم قۆناغەدا بەرەبەرە جەرمانیەکان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوای ئەورووپییان لەناو بردو سیستەم و ژیارو نەریتی ئەوێشیان لەناو بردو دواتر لەسەر دارو پەردوی ئەو ئیمپراتۆریەتە چەند شانشینێکی جەرمانی نوێیان دامەزراند کەچەند ڕێکخستنێکی تایبەت و ژیاری شالاو بەریان هەبوو.

بەم ڕوداوە گەورەیەش لاپەڕەی مێژووی کۆن پێچرایەوەو سەردەمێکی نوێ لەمێژووی ئەوروپا دەستی پێکردکەسەردەمی ناوەڕاستە، ئەمە وێڕای باری پشێوی و کاولی کەزادەی شالاوە بەربەریەکان بوو لەهەموو بەشەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپیدا. ئیدوارد جیبۆنی مێژوونووس دەڵێت: (شتێکی نەشیاو موستەحیلە مرۆڤایەتی بیتوانیبا لەو سەردەمە پشێویەدا هیچ پێشکەوتنێك بەدەست بهێنێت)، ئەمە والە مێژوونوس (و.ب.کیر) دەکات تا ناوی (سەدە تاریکەکان) لەسەدەکانی یەکەمی سەدەکانی ناوەڕاست بنێت، زۆرێك لەمێژوونوسانێ کە گرنگی بەو قۆناغەی مێژووی ئەوروپا دەدەن ئەو ڕایە وەردەگرن.

لەو قۆناغەدا مۆمی گەشاوەی ژیاری کۆنی ڕۆمانی کوژایەوەو ڕووناکی زانست و مەعریفە دامرکایەوەو تاریکیەکی چڕوپڕ ژیانی هەزری گرتەوەو تەنها پاشماوەیەکی فەرهەنگی پوکاوەی لاتینی مایەوە، کڵێسای ڕۆمانی ڕۆژئاواش لەو مانەوەدا ڕۆڵی هەبوو کەفەر هەنگێکی کەمی پارێزراوی ناو دیوارەکانی لەبەر چەند بیانویەك هێشتەوە، پێدەچێت هۆکاری دەرکەوتنی (ئەب) یەکەمینەکانی کڵێسا بێت کەنوسینەکانیان لایەنەکانی ئەو ڕۆشنبیریەیان خستەڕوو کە پەیوەستی مەسیحیەت و فەلسەفەی مەسیحیەت و کڵێساو ڕێنماییەکانی ئەو سەردەمەی کڵێسابوون.

باری تاریکی هزری بەدرێژایی پێنج سەدەی یەکەمی سەدەکانی ناوەڕاست بەردەوامبوو، بەلاّم لەسەرەتای سەدەی هەشتەمدا هەستانەوەیەکی سەرەتایی هزری دەرکەوت ئەگەر چی سادەو نەوازشی بوو، ئەمە لەئیرلەنداو ئینگلتەرا دەرکەوت و پەیوەست بوو بەدوو کەسی پەیڕەوکاریەوە کە بریتیبوون لە (بیدە)و (ئەلکوین)، لەسەرەتای سەدەی نۆیەمیشدا هەستانەوەیەکی تری هزری دەرکەوت کە پەیوەست بوو بەئیمپراتۆری فرەنجی کارۆلینجیەکانەوە (شارلەمان)، بەلاّم هەستانەوە هزریەکە لەسەرەتای سەردەمی جێگرەوەکانیدا بەرەو دواکەوتن چوو، ئەمەش بەهۆی دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتەکە بۆ چەند شانشین و میرنشینێکی ململانێکاری نێوان خۆیان.

وێڕای ئەمەش، دەکرێت تێبینی بوونی بارێکی ئاشنابوون و تێکەڵبونی نێوان ژیاری کۆنی ڕۆمانی و ژیارەکانی ئەو گەلە جەرمانیانە بکەین کەهاتنە ناو ئەورووپای ڕۆژئاواو لەپاڵ ڕەگەزە ڕۆمانیەکان و گەلانی تری دێریندا تیایدا نیشتەجێ بوون.

**قۆناغی دووەم** : ئەم قۆناغە بەدرێژای سێ سەدە بەردەوامبوو. (هەر لەسەرەتای سەدەی یانزە یان کۆتایی سەدەی سیانزە) لەم قۆناغەدا جەنگە خاچپەرستیە داگیرکاریەکان ڕوویان دا، ئەو جەنگانەی کەئەورووپای ڕۆژئاوایی بەرپای کردن، ئەورووپای ڕۆژئاواش لەو کاتەدا لەژێر قەڵەمڕەوی ڕێبەرایەتی پاپایدابوو، ئەم جەنگانەی بەرانبەر ژیاری ئیسلامی ڕۆژهەلاّتی ئەنجامدا، هەروەك و لەو قۆناغەدا سیستمی دەرەبەگایەتی و سیستمی (فروسیە) دەرکەوت.

لەسەدەی یانزەشدا هزری ئەورووپی ڕۆژئاوای لەو کۆت و بەندو سنورە هزریە داخراوانەی لەو ڕۆژگارەدا زاڵبوون و چەند سەدەیەکی دورو درێژ تیایدا دیل بوو ڕزگاری دەبوو. خێرا ئەنجامە چاکەکانی بۆ کەسانی دیار ڕوون بویەوە، ئەمەش بەدەرکەوتنی هزری ئازاد وفەلسەفەی خوێندنگەیی، ئەمە کەشی لەباری ڕەخساند بۆپێکهێنانی هەستانەوەیەکی هزریو زانستی گرنگ لەسەدەی دوانزەدا کە بەڕێنیسانسی هزری یەکەم ناسراوە، کەسانی کارای ئەو هەستانەوەش بەتایبەت ئەبیلارد بانگەوازیان بۆهزرو گەڕانەوە بۆفەرهەنگی کلاسیکی کۆنی یۆنانیو

ڕۆمانی دەکرد, ئەم ڕێنیسانسە بوو بەهۆی پێکهێنانی تۆوی یەکەمی زانکۆ زانستییەکان کە دوای ئەو ڕۆڵی دیارو گرنگی گواستنەوەی ڕۆژئاوای ئەورووپیان لەسەردەمی نەزانیو تاریکی زاڵبوونی ئەو ماوەدا بۆسەردەمی زانستو ڕوناکی کەمەشخەڵەکانی لەسەردەمی ڕێنیسانسی گەورەی سەدەی پانزەو شانزەدا ڕوون بونەوە گرتە ئەستۆ، ئەو هەستانەوەش ڕێخۆشکەری بۆسەردەمی نوێو ژیارە گەشاوەکەی کرد.

کڵێسای پاپەویش بەچاوی ڕەزامەندییەوە نەیدەڕوانیە ئەو ڕێنیسانسە، بەڵکو ڕێنیسانسی هزریو فەلسەفەی سەدەی دوانزەی زاینی بەمەترسیەك دەزانی کە هەڕەشە لە قەوارەی کڵێسا بکات، ئەمە پاڵی پێوەنا تا بەهەموو پێناوێکی بەردەست لەڕوویدا بوەستێت، تەنانەت بەچەکە تەقلیدییەکەشی کە هەموو ئەوانەی لەڕێنماییو هزرە تەقلیدیەکەی دەچوونە دەرێ بە (هەرتەقە) ناوزەد دەکرد، کڵێسا تەنها بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو بەرامبەر بەهەریەك لەوانەی پێیان دەوترا هەرتەقە چەند حوکمێکی توندو قورسی دەرکرد وەك بێ بەریکردن یان کوشتن بەسوتاندن بێت یان بە لەخاچدان، ئەبیلاردی فەیلەسوفو بوترس لومباردی خوێندکاریشی لەپێشەوەی ئەوانەدابوون کەکڵێسای پاپەوی لەبەرامبەریاندا حوکمی توندی لەو جۆرەی دەرکرد.

**قۆناغی سێیەم**: ئەم قۆناغە بەرتەسك دەبێتەوە لەسەدەی چواردەو پانزەدا (١٣٠٠–١٥٠٠ن)، لەم قۆناغەدا ژیاری ئەوروپی ڕۆژئاوای شێوەیەکی جیا لەقۆناغەکانی پێشوی لەهەموو بوارەکاندا وەرگرت:

## ١-سەبارەت بەسیستمی دەسەڵات:

گەلانی ئەوروپا واسەیری پاشایان دەکرد کەسەری دەوڵەت بێت، ئەمە دوای ئەوەی سەری دەرەبەگایەتیە، هەروەك گەل داوایان لەپاشا دەکرد تادەسەڵاتی خۆی سنوردار بکات، ئەمە بووبەهۆی دەرکەوتنی چەند قەوارەیەکی پەرلەمانی، هەروەك گەلانی ئەورووپای ڕۆژئاوایی ڕویانکردە بیرکردنەوە لەبنیادنانی دەوڵەتی نەتەوەییو ئەو بیرە کۆنانەی کە بەچاوی یەك دەوڵەتی خاوەن یەك ئیمپراتۆر یان یەك کڵێسا بەڕێبەری پاپەوی سەیری ئەورووپایان دەکرد، بەرە بەرە پاشەکشەیان کرد.

ئەمە دوپاتی لێکهەڵوەشانی قەوارەی یەکگرتوی ئەورووپی دەکردەوە. سەرەڕای ئەمانە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی زمانە نیشتیمانیە ناوچەییەکان لەنوسین و فێربوندا بەڵگەیەکی تری لێکهەڵوەشانی یەکبوونی ئەورووپی بوو، دوای ئەوەی لەپێشتر لاتینی چەندین سەدە تاکە زمانی ئەورووپابوو بۆزانست و مەعریفە.

## ٢- سەبارەت بەباس و خواسە ئاینیەکان:

کڵێسای پاپەوی لەقۆناغی دووەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا (١٠٠٠-١٣٠٠ز) ململانێیەکی توندی لەگەڵ پاشاکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بەرپاکرد، مەبەست ئەوەی کە ئەڵمانیاو ئیتالیای لەخۆدەگرت، ئەمەش بەهۆی هەوڵی هەریەك لەو دوو دەسەڵاتە ئایینی و دنیاییە بۆ بەرزکردنەوەی شانو شکۆی خۆیان لەسەر حسابی ئەوی دی، وێڕای ئەوەی پاپەوی توانی چەند سەرکەوتنێك بەسەر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری دنیاییدا بهێنێت، بەڵام ئەو سەر کەوتنانە لەنێو خۆیاندا تۆوی شکست و دارمان بوون و پاپەویەت لەهەوڵێکی سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر سەرکردەو پاشاکاندا پەنای بردە بەر دەرچوون لەپەیامی ڕۆحی خۆی، بەمەش گومان لەپیرۆزی و ڕۆحی بونەکەی کەوتەوەو خەڵکی لێی دەتەکینەوە.

بەهۆی ئەمەوە مەڵبەندی پاپاو کڵێسای پاپەوی لەقۆناغی سێیەم و کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا لاواز بوو و خەڵکیش لەچەندین بواردا هێرشیان بردە سەر، ئەم هێرش بردنە لەقۆناغەکانی پێشتری مێژوویدا باو نەبوو.

## ٣- لەلایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتیشەوە:

سیستمی دەرەبەگایەتی لەقۆناغی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەرەو ئاوابوون دەچوو، لەکاتێکدا شارە پیشەسازی و ئابووریەکان گەشەیان سەندو چینی بۆرجوازی پێکهات کە دواتر لەژیانی ئابووری و سیاسیدا ڕۆڵی یەکەمی دەگێڕا، ئەمەیارمەتی گەشەسەندنی باری ئابوری دا، چ لەبواری پیشەسازی یان ئابووری دۆزینەوەی ڕێگە دەریاییەکان بەرەو ئەمەریکاو هیندو چین بێت.

********************

# باسی دووەم
# ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی
## دامەزراندن و دارمانی ئیمپراتۆریەتەکە

ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەدەی سێیەمی پێش زاینیدا دامەزراو تاسەدەی پێنجی زاینی لەئەوروپای ڕۆژئاوای بەردەوام بوو، ئەو ئیمپڕاتۆریەتە کەگەیشتە ئەوپەڕی توانا و بەهێزی خۆی و فراوانبوونی ناوچەکانی، ئەمەش لەکۆتایی سەدەی یەکەم و کۆتایی سەدەی دووەمی زاینیدابوو، ئیمپراتۆریەتەکە لەو ماوەیەدا ئەوروپای ڕۆژئاوای و بەلقان و ئاسیای بچووک و ولاتی شام و میسر و لیبیا و تونس و جەزائیر و مەغریبی لەخۆگرت و قەلەمڕەویشی تائێران و هیند و سودان و گەلە جەرمانیەکانی ڕۆژهەلاتی ڕاین و باکووری دانوب چوو.

بەلام ئەو ئیمپراتۆریەتە لەسەدەی سێیەمی زاینیەوە بەرەو قۆناغی دارمان و لێکهەلوەشان چوو، ئەمەش بەهۆی چەندین هۆکارەوە کە بوویە هۆی ئەوەی لەکۆتایدا لەسالی ٤٧٦ز. بڕووخێت.

باری ئابووری ئیمپڕاتۆریەتەکە لەئەنجامی ئەو جەنگە ناوخۆییانەی یەکبوونیان تێکشکاندبوو خراپبوو و ڕێگەکانی بازرگانی تێدا نەماو زۆری باجی سەپێنراویش لەلایەن دەسەلاتە ڕۆمانیەکانەوە بەسەر دانیشتواندا و لەدەستدانی بەهای دراو و بەرز بونەوەی نرخەکان بەشێوەیەکی تەواو زۆر، بونە هۆی خێراکردنی دارمانی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی شارە ڕۆمانیەکان لەو ماوەیەدا دووچاری تەنگەژەیەکی توند بووبوون و پیشەو کارەکان دارمان، ئەمە بویە هۆی دامەزراندنی کۆلۆنە داخراوەکان و ئەوانەی بەس بۆ خۆژیان بوون، هێزی کڕینی دانیشتوان گەشتە نزمترین ئاست. ئەمە بویە هۆی بلاوبوونەوەی هەژاری لەنێو ئەندامانی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی بەرفراواندا و دوابەدوای ئەوەش هەنگاو نان و خواستە جیاوازیەکان بەرەو خۆخوازی ناوچەیی و پشت بەستن بەخۆ سەریهەلدا.

لەسەر ئاستی بازرگانیش تای تەرازووی بازرگانی لەبەرژەوەندی بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەدا بوو، ئەمە بەبەراورد لەگەڵ بەشی ڕۆژئاواییدا. وێڕای تەواو بوونی هەوڵ و کاری ئەو کۆیلانەی هێزی بەرهەمهێنی بنەڕەتی ناو ئیمپراتۆریەتیان پێکدەهێنا، ئەمەش بەهۆی کۆتایی پێهاتنی جەنگە فراوان خوازییەکانی ئیمپراتۆریەت، ئەوە بوبەهۆی بەرەوپێشبردنی داڕمان و لێکهەڵوەشانی ئیمپراتۆریەتەکە.

لەگەڵ لاوازی دەسەڵاتی مەرکەزیدا دیدی جیاخوازی لای سەرکردەکانی هەرێمەکانی سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی گەشەی سەندو چەند ویلایەتێکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەرەو جیاوازی لەپەیکەری پەککەوتەی ئیمپراتۆریەتەکە دەچوون، هەروەك دەسەڵاتداری سوپاو گرتنە دەستی دەسەڵات لەمەڵبەندی ئیمپراتۆریەت و هەرێمەکاندا یەکێك بوو لەهۆکارە گرنگەکانی داڕمانی و پاشاکان بوون بەیاری دەستی سوپاو دەسەڵاتی مەرکەزیش پلەو پایەو شانووشکۆی خۆی لەدەستداو سەرکردەکانی ناوچەکان و سوپا تواناکانی چەند هەرێمێکی فراوانی ئیمپراتۆریەتەکەیان گرتە دەست.

وێڕای هەموو ئەمانە مەترسی هۆزە بەربەرییەکانی جەرمان و قووت و هۆن و ئەوانی دی و شاڵاوە یەك لەدوای یەکەکانیان سنوری ئیمپراتۆریەتەکەیان ئەو کەمە توانای ئابووری و سەربازییەی ئیمپراتۆریەتیان لەناو دەبرد، لەپاڵ هەموو ئەوانەدا چەند هۆکارێکی تری گرنگ بوونە هۆی لێکهەڵوەشان و پەرتپەرتبوون و داڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

ناتوانین ئەوە بشارینەوە کە چەند پاشایەك هەوڵیاندا ئیمپراتۆریەت ڕزگار بکەن و بەدەرکردنی لەو تەنگەژانەی کەمێك پێش داڕمانی تیایدا دەژیان شان و شکۆی بۆبگێڕنەوە. وەك دیقلدیانوس (٢٨٤ز-٣٠٥ز) و ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە (٣٠٥ز-٣٣٧ز)، ئەو دوانە چەند چاکسازیەکیان ئەنجامدا بەئامانجی بەهێزکردنی ئیمپراتۆریەتەکە لەڕووی ئابووری و کارگێڕی و سەربازییەوە،

ئیمپراتۆر دیقلدیانوس توانی شانو شکۆی ئیمپراتۆریەتو ئیمپڕاتۆر بەرز بکاتەوە تائەوەی داوایکرد بەخودا دابنرێتو لەپێناو کۆکردنەوەی دەستەلاتیش لەدەستی دا گرنگی دا بەبەهێزکردنی دەزگای کارگێڕی تائاستێکی زۆر.

هەروەها ئەنجومەنی ئیمپراتۆریەتی بەتەواوەتی ملکەچی دەسەلات بوو و ئەنجومەنی پیران وەك دامەزراوەیەکی بالای ناو ئیمپراتۆریەت گرنگی خۆی لەدەستدا، بۆ بەرگری لەسنوری ئیمپراتۆریەتیش گرنگی دا بەسوپاو بەسەربازی گرتنی بەردەوامی بەربەریەکانی ناو سوپای ئیمپراتۆریەت، بۆ بەهێزکردنی لایەنی دارایی ئیمپرتۆریەتیش کاروباری دارای بەرێکخستنو سیستمێکی وردتری بۆ کۆکردنەوەی باجەکان داهێناو زەوی کشتوکاڵی لەئیمپراتۆریەتدا بۆ دیاریکردنی باجەکان بەشێوەیەکی ورد خستەکارو دراوێکی تری نوێشی لێدا.

بەلام سیستمی چوارینەی دەسەلات کە دیقلدیانوس دایهێنا، واتە دابەشکردنی ئیمپراتۆریەت بۆ چوار بەش لەنێوان دوو ئۆگەشین و دوو قەیسەردا، هەروەها بەو پێیە بۆهەریەکەیان چەند ویلایەتێكو پایتەختێکی تایبەتی بۆدانان، کاریگەرییەکی گەورەی لەیەکبوونی ئیمپراتۆریەتدا بەجێهێشتو ئەوەش لەدواتردا بوو بەهۆکارێکی دابەشبوون لەجیاتی ئەوەی ببێتە هۆی یەکبوون.

وێڕای ئەوەی ئیمپراتۆر قوستەنتین دووبارە دەسەلاتەکانی لەدەست خۆی کۆکردەوە، بەلام لەدوای مردنی سەرلەنوێ ئیمپراتۆریەت دابەشبوویەوە، ئیمپراتۆر قوستەنتین وەك کەسی پێشوی خۆی گرنگی دا بەسوپاو پایتەختی گواستەوە بۆقوستەنتینیە لەسەر دارو پەردووی شاری بێزەنتە بنیادی ناو پێی دەوترا (ڕۆمانی نوێ). باج و دراوی ڕێکخستو دانی نا بەمەسیحییەتدا، ئەم دانپێدانانەشی دەچێتە چوارچێوەی هەوڵەکانی بۆبەهێزکردنی دەستەلاتی ئیمپراتۆریەت، چونکە هێزێکی ئایدۆلۆجی لەنێو ئاینی نوێدا هەبوو کە دەکرا لەململانێ لەگەڵ ڕکەبەرەکانی لەلایەك یان سەپاندنی دەستەلاتی خۆی بەسەر بەشەکانی ئیمپراتۆریەت لەلایەکی ترەوە بەکاری بهێنێت.

بەلام ئەو چاکسازیانە نەبوونە مایەی ڕزگارکردنی ئیمپراتۆریەت لەتەنگژەکەی، بەڵکو ئەو تەنگژەیە لەکۆتایی سەدەی چوارەمی زاینیدا لەجاران قوڵ

تربـوو، جـادوای مردنــی ئیمپراتــۆر ئێودوسـێوس لەسـاڵی ٣٩٥ز ئیمپراتۆریـەت لـەنێوان ئـەرکادیۆس و هۆنوریوسـی کوڕانیـدا دابەشـبوو، ئـەو دابەشـکاریەش تاکۆتایی ئیمپراتۆریەتەکە مانەوە، بەشی ڕۆژهـەڵاتی و ڕۆژئاوایی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمانی دژایەتی یەکتریان دەکرد.

بەوجۆرە ئەو هەموو چاکسازییەی پاشاکان پەنایان بۆبردن وەك چاکسازی دارای و بەهێز کردنی سوپاو دانـان بەمەسیحیەت و هـەوڵی کەمکردنـەوەی کۆتی کۆیلایەتی، ئەمانە ئیمپراتۆریەتیان لەمەرگی دڵنیایی لەسەر دەستی هۆزە بەربەریە جەرمانیەکان ڕزگار نەکرد،جەرمانیەکان لەناو خۆی ئیمپراتۆریەتەکەداو بەتایبەت لەنێو جوتیارو کۆیلەو پیشەگەراندا کەباریان خراپ بوو هاوپەیمانیان هەبوو و باریـان گـۆڕا بۆچەند ڕاپەڕینێکی بەرفراوان لەماوەی سەدەی سێیەم و چوارەمی زاینی لەچەندین هەرێمی ئیمپراتۆریەتدا.

ئەو ڕاپەڕینانەو هـەوڵی سـەرکوتکردنیان بونە هـۆی ڕیشەکێشکردنی داهاتی ئیمپراتۆریەت و لاوازکردنی لەبەردەم مەترسیە دەرەکیەکاندا بەتایبەت مەترسی ئەو بەربەریانـەی ئـەوەیان قۆسـتبوویەوەو بـەرەو بـاکوور لـەئیتالیاوە فراوانخوازیـان دەکرد. ئەوانەش لەسێ کۆمەڵی سەرەکی پێکدەهاتن: (کلتیەکان، جەرمان، سلاف) ئەمانە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتدا لەململانێیەکی دوورو درێژی چەند سەدەییدا بوون، بەڵام ئەم ململانێیە لەکۆتایی سەدەی چوارەمی زاینیدا چوویە قۆناغێکی نوێوە کاتێـك بەربـەرەکان سـنوری ئیمپراتۆریـەتیان دەبـڕی و دەسـتیان بەسـەر زەویـدا دەگرت.

ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانیش لەسـەرەتادا تـوانی ڕێ بـەفراوانخوازی بەربـەری بگرێت و لەسنورێکی دیاریکراودا ڕایگرێت، ئەمەش بەپشت بەستن بەهاو پەیمانی لەگەڵ بەشێکیان و بەکارهێنانیان وەك بەکرێگیراو لەگەڵ سوپای ڕۆمانیدا، بەڵام ئەوانیش خێرا بوون بەدوژمنی ئیمپراتۆریەت و ئیمپراتۆریەتیش ناچاربوو چەند نەوازشێکی نوێیـان پێشکەش بکـات، بەربەریـە جەرمانیـەکانیش ئـەو خاکـەیان قۆسـتەوە کـە تیایـدابوون و چـونە چـەند پەیوەندیـەکی بازرگـانی لەگـەڵ

ئیمپراتۆریەتـــدا، لەئـــەنجامی زیـــادبوونی ژمـــارەو پێناویـــان چـــاویان بڕییـــە فراوانخـــوازیو دەســـتگرتن بەســـەر خـــاکی بـــەپیتی نـــاو ئیمپراتۆریەتـــدا، پێویستبوونیان بەخاك لەگرنگترین پاڵنەری بەربەریەکان بوو بۆ شاڵاو بردنە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەوکاتەی تیایدا چالاکی یەکخستنی هۆزە جەرمانیەکان لەچەند یەکێتییەکی گەورەی هۆزایەتیدا ئەنجام دەدرا.

لەباشـــووری ڕاینـــدا یـــەکێتی ئـــەنگلۆ_سەکـــسۆنی دەرکـــەوت، لـــەڕاینی ناوەڕاستیـشدا یـەکێتی هـۆزە فرەنجـەکان دەرکـەوت، لـەباکوری ڕاینیـشدا یـەکێتی ئەڵمانی دەرکەوت، لەودیو ئەلبیشدا یەکێتیەکانی هۆزە لۆمباردیەکانو وەندالو بەرگەندیـەکان پێکهـاتن، هۆزەکـانی قووتـە ڕۆژهـەڵاتیو قووتـە ڕۆژئاواییـەکانیش چەند شانشینێکی گەورەی لەناوچەکانی دانوبو دەریای ڕەش بۆ پێکهێنان.

لەکۆتایی سەدەی چوارەمو سەرەتای سەدەی پێنجەمی زایینیدا بەربەریەکان کەوتنـە ڕۆچـوونە نـاو ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانیو دەســتگرتن بەســەر خاکیــداو سەقامگیربوون تیایدا. ئەو چالاکیەش سەدەیەکی تەواوی خایاند، بەو سەردەمە دەوترێت سەردەمی کۆچە گەورەکانی گەلان، ڕۆچوونی قووتەکانیش سەرەتایەك بوو بۆئەو کۆچانە.

*******************

# گەورەیی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی

گەورەیی ئەم ئیمپراتۆریەتە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی دەسەلاتی مەرکەزی تیایدا توانی دەسەلاتی خۆی بەسەر ڕووبەرە فراوانە جوگرافییەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی لەو سەردەمەدا بچەسپێنیت، وێڕای ئەوەی توانی کارلێکی ئیجابیو بەسودی لەگەڵ هەموو گەلو نەتەوەو ڕەگەزو ژیارە جیاجیاکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا هەبێت، لەڕاستیدا ئەوەش ئەو شتەبوو کە داوای لەحکوومەتی ڕۆمانی دەکرد یاساو یاسا دارشتنێك دەربکات کە لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی گەلە جیاجیاکان لەڕووی فەرهەنگی مێژووییو ژیارو زمانو ئایینەوە بگونجێت، بارەکە لەو سنورەشدا نەوەستا، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەگەورەییو ڕەوتی سەرسام پێبوونیدا دەکرێت لەتوانای زۆری وەرگرتنو چارکردنی گەلانێکی ڕیشەیی خاوەن ژیاری دێرینی وەك میسری یۆنانییەکانی لەپاڵ گەلانی تری نوێدا کە لەسەرەتای پێکهێنانی ژیاری مرۆیی خۆیاندا بوون وەك گالیو جەرمەنییەکان خۆی ببینێتەوە.

ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەگەشاوەترین سەردەمەکانیدا (ماوەی نێوان هاتنی ئۆگەستین لەساڵی ٢٧پ. ز ومردنی مارکۆس ئۆرلیۆس لەساڵی ١٨٠ز) گەورەترین نموونەی ژیاری بونیادی کۆمەلایەتی دەنوێنێت لەبەر قوڵیو پەیوەستیو بەهێزی ئەو نموونەیە کە لەو چوارچێوەدا تایبەتمەند بوو، چونکە لەدیدی چینە بالاکاندا دەربڕی سیستمێکی کارگێڕی خاوەن تواناو وردەکاری بوو، لەکاتێکدا چینەکانی خوارەوە پێیان وابوو حکوومەتی ڕۆمانی لەژێر سایەی یاسایەکی دادپەروەردا بەبێ دەستوەردانە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك یان کارکردن بۆ گۆڕینی زمان یان بیروباوەڕ یان ڕێکخستنی کۆمەلایەتییان پارێزگاری لەماڵو گیانیان دەکات.

پێویستە تێبینی ئەوە بکەین ئەو ماوەی چاکسازییەکانی تێدابوو، حکوومەت زیاتر لەپاشایەتی نزیك بوو لەگەڵ پاراستنی چەندین دیمەنی سەردەمی کۆماریدا کە پێدەچێت زۆر لەسەردەمانی پێشتر لەڕێکخستنەکانی دەسەلاتدا ڕوون بێت،

دەکرێت بەشێوەیەکی تر بڵێین نیزامی دەسەڵات لەو ماوەدا لەسەر هەمان دەربڕینەکانی ڕێکخستنەکانی دەسەڵاتی پێش خۆی مابوویەوە، واتە بەپێی سیستمی کۆماری.

بەلاّم لەگەڵ دەرکەوتنی سەرۆك بۆ دەوڵەتو سوپای ڕۆمانی کە بەدرێژای ژیانی لەو پایەیدا بمێنێتەوە، بەو جۆرە سەرۆکی دەوڵەتو تاکە فەرمانڕەوای دەبێتو دەسەڵاتە فراوانەکانی بەبێ ڕکەبەریەکی وادەبێت، پایە بەرزەکانی ناو دەوڵەتیش لەدەست چینی ئەرستۆکراتیدا دەبێت کە زیاتر لەگەورە خاوەن زەوییەکان پێکدێت، هەروەك دانیشتووی ڕۆمای چینی یەکەمو نایاب دەنوێنێت، ئەمانە هەموو تایبەتمەندیو جیاکاریو خۆشگوزەرانییەکیان هەبوو جگە لەوەی پەیوەستە بەبواری سیاسی کە لەدەست بنەماڵەی فەرمانڕواو سەرۆکی سیستمدا قۆرخ کرابوو.

بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە وا بۆ دەسەڵات بڕوانن کە حکوومەتێکی سەربازی پەتی یان حکوومەتێکی خۆسەپێنی ڕەهابێت، بەتایبەت کە بەتەواوەتی پاشایەتی دەستووری نەبوو، تەنها تایبەتمەندی دەسەلاّتداری نەریتو یاسایی هەبوو (بەتایبەت لەسەردەمی یەکەمی ئیمپراتۆریەتدا) سەرەڕای دەستگرتنی بەچەندین دیاردەی سەردەمی کۆمارییەوە، لەڕاستیدا حکوومەتی ڕۆمانی لەو کاتەدا دیمەنێکی دەستووری ڕوونی بەدەستهێنابوو بەدیاردەیەکی شکۆداری حکوومەتو ئیمپراتۆریەتەکە بەشێوەیەکی گشتی.

لەڕاستیدا ئەو سیستمە سیاسییەی ئۆگەستین (٢٧پ. ز_١٤ز) داینا، بەچارەسەری نێوەندی چەمکی سیاسی نێوان سیستمی (پاشایەتی خۆسەپێنی) و (کۆماری دەستووری) دادەنرێت، دکتۆر بییر ڕۆنوفت لەکتێبەکەیدا (فراوانخوازی ئەورووپی لەجیهان، شێوەو ڕەنگەکانی ١٨٦٩ز-١٩١٤ز) دەڵێت: (ئۆگەستین دەبوو یەکێك لەدوو سیستمی دەسەلاّت هەڵبژێرێت، یەکەم سیستی قەیسەر بوو کە لەسەر بنەمای دەسەلاّتێکی سەربازی وەستابوو و هەمووان بەزۆرو گوێڕاڵیو کوێرانە

دانیان بەگەورەیی و بالأیاندا نابوو، دووەمین سیستمی دەسەڵاتی کۆماری کە دان دەنێت بەگرنگی هاولاّتییانی ڕۆمان لەئیتالیا و ویلایەتەکان لەپاڵ داننان بەدەسەلاّتی سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی دەوڵەتاندا، لێرەدا ئۆگەستین پەنای بردە بەر یەکخستنی نێوان هەردووکیان، واتە نێوان ڕێبەرایەتی سەربازی کە میراتی پێشینەکانی بوو، ببوویە پێویستییەکی پاراستنی سەلامەتی و ئاسایشی ئیمپراتۆریەتەکەو بەرژەوەندییە گشتییەکەی و نێوان خواستی هاوولاّتییانی ڕۆمان لەپاراستنی پلەو پایەی تایبەتییان بەلایەنی کەمەوە لەمەیدانی کۆمەلاّیەتی و ئابووریدا ئەگەر مەیدانە سیاسییەکەش وەلابنرێت).

بەوجۆرە ئۆگەستن یاسای ڕەهای قەیسەری لەکارخست وێڕای ئەوەی زۆربەی دەسەلاّتەکانی لەدەستدابوو، ئەودەسەلاّتانەی واڕاهاتبوو گەورەکاربەدەستانی نێو سەردەمی کۆماری تێدابەشداربکات سەرکردایەتی سەربازی وجەنگی کە لەدەست کونسوڵەکانەوە گوازرایەوە بۆدەست ئیمپراتۆر.

لاوازی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەڕوونی لەسەدەی سێیەمدا دەرکەوت دوای ئەوەی سیستم وەستاو هێزە سەربازییەکان توانیان پاشاکان لاببەن و کەسانیتر دابنێن دوای ئەوەی سوپا خزمەتگوزاری ئیمپراتۆر بوو، دەستە ئیمپراتۆرییەکانیش لەویلایەتە جیاجیاکاندا کەوتنە هەڵبژاردنی سەرکردەکانیان بەپێی خواستی خۆیان نەوەك بەپێی خواستی ئیمپراتۆرو وەزیرەکانیان، ئەمە وای لەپاشاکان و ئەندامانی تری دەسەلاّتی سەر بەئیمپراتۆر کرد تاببنە یاری دەستی پیاوانی سوپا و سەربازان.

بەلاّم ئەمە بەو واتا نا کەوا تێبگەین هەموو پاشاکانی سەدەی سێیەم لێنەهاتوو بوون، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەو سەردەمەدا چەند پاشایەك دەرکەوتن کە ڕۆڵی گەورەی خۆیان لەمێژووی مرۆیی و چاکسازی ئیمپراتۆریەتدا نیشاندا، جا ئیمپراتۆر سبتمیوس سفروس (١٩٣ز-٢١١ز) توانایییەکی گەورەی لەمێژووی ئیمپراتۆریەت و سیستمە ڕۆمانییەکاندا نیشانداو توانی خێزانێکی تەمەن کورتی واپێکبهێنێت کە تا ساڵی ٢٣٥ز لەدەسەلاّتدا مایەوە.

لەناودارترین پاشاکانی ئەو خێزانەش ئیمپراتۆر کاراکلا (٢١١ز-٢١٧ز) بوو. لەبەرئەوەی ڕەگەزنامەی ڕۆمانی بەهەموو خەڵکی ئیمپراتۆریەتدا، ئەوانەی دوای جەنگە داگیرییەکان پەیوەستی ئیمپرارتۆریەت بووبوون، وێڕای ئەوەش گەورەییەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆر سبتمیوس لەدواخستنی ئەو کارەساتەی تووشی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو.

سەرەڕای هەموو ئەمانە شتێکی ڕوون بوو کە تاچەندە قەڵەمڕەوی و دەسەڵاتداری سەربازی بەسەر هەموو یەکەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتدا ڕەگی خۆی داکووتابوو. وێڕای دەسەڵاتەکانی خودی ئیمپراتۆریەت تائاستێك ئیمپراتۆر سبتمیوس لەو کاتەی لەسەرەمەرگدابوو وەسیەتی بۆ کوڕەکانی خۆی کرد: (گرنگی زۆر بەسەربازان بدەن و گرنگی بەوانی دی مەدەن).

لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆر دکیوس (٢٤٩ز-٢٥١ز) گەشتە سەر کورسی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری زنجیرەیەکی ئەڵقە پەیوەستی پاشا سەربازییەکان دەستپێکرد کە بەرەبەرە لەدیارییەکانی فەرمانڕەوایی کۆماری دووردەکەوتنەوە تائەوەی باریان گەشتە دەسەڵاتداری خۆسەپێنی تاکڕەوانەی وا کەجەختی لەسەر سوپا دەکردەوە تاخواستی ئیمپرارتۆر جێبەجێ بکات.

ئەمە پێویستی لای هەندێك دروست کرد تادەست بکەن بەچاکسازی ئایینی لەڕوانگەی چاکسازی ڕێکخستنە کارگێرییەکانی تایبەت بەویلایەتەکان بکەن، وێڕای ڕێکخستنی باج و دراو، لەدەرەوەش فشارە دەرەکییەکان لەوپەڕی توندیدا بوون، جا فشاری جەرمان لەبارێکی ڕوو لەزیادی بەردەوامدا بوو بەتایبەت لەبەرەی ڕاین و بەرەی دانوب، وێڕای ڕوو لەزیادبوونی مەترسی فارسی لەسەر هەرێمە ئاسیاییەکانی سەربە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەوکاتەدا، لەنێوەندی ئەو پشێویە گشتگیرەدا کە بەبڵاوبوونەوەی جەنگی ناوخۆیە لەبەشە جیاجیاکانی ئیمپراتۆریەتدا چەند دیدێکی مەترسیداری دروستکردبوو.

ئیمپراتۆر دقلدیانوس (٢٨٤ز-٣٠٥ز) دەسەڵاتی گرتە دەست و هەوڵیدا لەو پشێویە تێبگات و چارەسەری کێشەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی بکات، بۆیە شۆڕشێکی گەورەی لەڕێکخستنەکانی حکوومەتی یۆنانیدا نایەوە کە وایکرد سەردەمەکەی لەگرنگترین سەردەمەکانی مێژووی ئیمپراتۆریەتەکە بێت، هەموو ئەو سەختییە ناوخۆیی و دەرەکییانەی لەکۆتا ڕۆژەکانیدا بەرەو ڕووی ئیمپراتۆر ببوونەوە، بەرەبەرە کەڵەکە دەبوون تائەوکات لەوێنەیەکی مەترسیداری ڕووندا دەربکەون، جا لەناوخۆدا گرفتە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان کەڵەکە بووبوون، لەدەرەوەشدا مەترسی جەرمان و فارس و فشاریان لەسەر سنوری ئیمپراتۆریەتەکە زیادی کردبوو.

*******************

# چاكسازییەكانی ئیمپراتۆر دیقلدیانووس

پێشتر وتمان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەرەمەرگدابوو كە ئیمپراتۆر دیقلدیانوس لەساڵی ٢٨٤ز. هاتەسەركورسی دەسەڵاتی ئەو ئیمپراتۆریەتە، بێگومان ئەو بارە پاڵی پێوەدەنا تاگەورەترین كاری چاكسازی لەپەیكەری سەرۆكی ئیمپراتۆریەتداو ڕێكخستنیدا بكات چ لەناوخۆدابێت یان لەدەرەوەدا، ناكرێت ئیمراتۆر دیقلدیانوس بەیەكەم ئەو پاشاچاكسازانە دابنێین لەسەدەی سێیەمدا هەوڵیانداوە ئیمپراتۆریەكەلەدارمان ڕزگاربكەن.

لێرەداچەند پاشایەك هەبون كە یەك لەدوای یەك دەسەڵاتیان گرتوەتە دەست لەنێوان ساڵانی ٢٥٣ز-٢٨٢ز. كەهەستیان بەمەترسی باری ئەوكاتی ئیمپراتۆریەتەكە كردوەوەو هەوڵیان داوە چاكسازی بكەن. لەوانە ئیمراتۆر ئورلیان (٢٧٠ز-٢٧٥ز) كەسەرچاوە مێژووییە هاوچەرخەكان نازناوی (نوێگەری ئیمپراتۆریەت)ی لێدەنێن، بەڵام بۆچی ئەوانە لەڕووی مێژووییەوە وەك چاكساز ناوبانگیان دەرنەكردوەو كەسانی دی وەك ئیمپراتۆر دیقلدیانوس و ئیمپراتۆر قونستەنتین ناویان دیارە؟

وەڵامی ئەوپرسیارە ئەوەیە كە ئەوچاكسازیە كەمینانە چاكسازیەكەیان لەواقیعدا گشتگیر نەبووە، بەڵكوڕێژەی بووەو زیاتر باجەكان و دراوی كشتوكاڵی دەگرتەوەو چاكسازیەكانیان گرفتە بنەڕەتییەكانی نێو بنەڕەتی ئمپراتۆریەتی ڕۆمانی نەدەگرتەوە، وێڕای ئەوەش ئەوانە زۆر گرنگیان بەگرفتە دەرەكیەكانی بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی نەداوەو لەسەردەمی ئەوانەدا هەزاران جەرمانی سنورەكانی ئیمپراتۆرەكەیان بڕیوەو پاش دەستگرتن بەسەر ڕوبەرێكی فراوانی زەویەكاندا تیایدا سەقامگیربون.

ئەوەی زیاتردیارە ئەوەیە كە ئەو پاشایانە خۆیان دەرفەتیان بەو جەرمانانە دەدا تابێنە ناوخاكی ڕۆمانی بەبیانوی دابینكردنی دەستی ئیشكەری پێویست لەكشتوكاڵداو خۆپاراستن لەخراپەو مەترسییان بەوپێیەی لەسەرسنوری دەرەكی

ئیمپراتۆریەتەکەدا سەنگەریان گرتبوو، لەئەنجامی ئەوهەنگاوەدا ئەوجەرمانیانە گەشەیان کردو شانوشکۆیان بەهێز بوو و پاش ماوەیەك بوون بەڕگەزێکی هەرەشەکەر لەئیمپراتۆریەتەکەو بوون و مانەوەی ئیمپراتۆریەتەکەش.

لێرەوە ئیمپراتۆر دیقلدیانوس کارێکی ئەنجامدا کەپاشاکانی سەدەی سێیەمی زاینی ئەنجامیان نەدابوو، ئەوپێشڕەوی چاکسازی بوو لەوماوەی مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا، چاکسازیەکەشی جەختی لەسەرسێ ئامانجی سەرەکی:

١- بەهێزکرنی فەرمانڕەوا یان ئیمپراتۆر.

٢- ڕێکخستنەوەی دەزگای حکومی.

٣- نوێکردنەوەی سیستمی سوپا.

بۆبەدیهێنانی ئەوئامانجانەش دیقلدیانوس کەوتە سەقامگیرکردنی ئاسایش‌و نیزام لەبەشە جیاجیاکانی ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتداو شۆڕشە کڵپەسەندراوەکانی غالیاو میسرو ویلایەتی ئەفریقیاو بەریتانیای ملکەچکردن‌و ڕێی بەربەرەکان گرت تالەبەرەی ڕاین‌و دانوب پەل نەهاوێژن، هەرکەئەم کارانەی کرد لەساڵی ٢٩٧ز. هێرشی بردە سەر ئیمپراتۆریەتی فارسی‌و هەوڵیدا وڵاتی دوو ڕووبار بگێڕێتەوە، بەمە جارێکی دی سنوری ڕۆمانی لەڕژهەڵاتەوە تا ڕیاڕووباری دیجلە درێژبویەوە.

هەروەك سنوری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی گەڕایەوە بۆ باری ساڵی ١١٧ز. خۆی جگە لەیەك یان دوو هەرێم نەبێت، نەخشەی یەکەمی دیقلدیانوس پاراستنی ئیمپراتۆریەتی فراوانی ڕۆمانی بوو لەومەترسیانەی لەلایەن دوژمنەکانیەوە ئاڕاستەی دەکران، بۆیە هێزێکی جەنگی جێگۆڕکێی دامەزراند تالەهەرکاتێکدا بۆ هەرلایەك‌و بەپێی بارو خواست و نەخشەی ئیمپراتۆر هەنگاوبنێت.

لەڕاستیداخزمەت گوزارییەکان یان چاکسازییەکانی دیقلدیانوس بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر باری لەسەرەتاداو پاشان لەسەرمێژووی ژیاری بەجێهێشت، تەنها لەلایەنی سەربازی‌و جەنگی یان

مەیدانەکانی جەنگدا بەرتەسك نەبووبوویەوە، بەڵکوو خزمەت و چاکسازیەکانی زۆربەی مەیدانەکانی گرتەوە، لەنێو ئەوانەشدا چاکسازی کارگێری، چونکە دەزگای کارگێری لەشێوەیەکدا ڕێکخستەوە کە ئیتالیای لەو پایە چاك و بەرزەی سەردەمانی کۆنی خۆی بێبەش کرد.

هەروەك چاکسازی کارگێری دیقلدیانوس دیاردەی دووبەرەکی نێوان ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەت و ویلایەتەکانی(سناتۆ)ی لەناوبرد، دیقلدیانوس هەر زوو زانیبووی کە پایەی حەقیقی هێزی جیهانی ڕۆمانی لەڕۆژئاوادا نەماوەو هاتوەتە ڕۆژهەلآت، چونکە ویلایەتەکانی ڕۆژیو دانیشتوان و توانای دەستی ناو کشتوکاڵ و پیشەسازیو بازرگانییان زۆرە، ئەو هەنگاوەشی ڕێخۆشکەربوو بۆهەنگاونانی دواتری ئیمپراتۆر قونستەنتین، کاتێك پایتەختی نوێی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی گواستەوە بۆ ڕۆژهەلآت کە شاری نێقومیدیا بوو لەباکوری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك لەسەر دەریای مەرمەرە، ئەمە وێڕای خواستی ئیعتیبارە سەربازییەکان لەگواستنەوەی پایتەختی ئیتالیا لەڕۆماوە بۆمیلان کە ئەو شارە بوو بەسەر زۆربەی ڕێڕەوەکانی شاخەکانی ئەلبدا زاڵبوو، ئەمە وایدەکرد بەئاسانی سوپاکانی ئیمپراتۆریەت لەوێوە بۆ گالیا یان ئەڵمانیا بگوازرێنەوە تا ڕێ لەهەرهێرشێك بگرن یان هەرئاژاوەیەك دابمرکێننەوە.

لەگەڵ گۆڕینی پایتەختی جیهانی ڕۆمانیدا، دەزگای کارگێڕیش بەشێوەیەکی گشتگیرو جەوهەری ڕێکخرایەوە، چونکە دیقلدیانوس هەستی بەپێویستی بەدیهێنانی چارەسەرێك بۆ مەترسی زیادبوونی ژمارەی ویلایەتەکان کردبوو کە لەو دەرەنجامەوە چەند ڕەوتێکی جیاخوازی پەیدابوون، بۆیە ئیمپراتۆر بیری لەوە کردەوە ویلایەتە ڕۆمانییەکان و ویلایەتەکانی سەر بەدەسەڵاتداری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پێکەوە ببەستێتەوە، بۆیە ئیمپراتۆریەتەکەی بۆچوار بەشی کارگێری گەورە دابەشکردو لەسەر هەر بەشێکیش فەرمانڕەوایەکی گشتی کارگێری دنا کە نازناوی (ئۆگەستس) یان (قەیسەر)ی هەبێت و لەڕوانگەی یاسادانان و کرداریشەوە بەشدارو هاوکاری ئیمپراتۆر بێت لەفەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتدا.

دابەشکارییە کارگێرییەکانیشی لەسەر ئەم شێوازە دارشت:

١- **گاليا**: بەريتانياو گالياو ئيسپانياو بەشی ناسراو بەمەراكيش لەمڕۆدای لەخۆدەگرت.

٢- **ئيتاليا**: ناوچەكانی نێوان دانوبو دەريای ناوڕاست دەگرێتەوە وێڕای ئيتالياو ناوچەی درێژكراوەی جەزائيرو تونسو تەرابلوس.

٣- **ئەلبريا**: كە داشياو مەقدۆنياو وڵاتی يۆنانی دەگرتەوە.

٤- **هەرێمی رۆژهەڵات**: كە ناوچەكانی تری ئيمپراتۆريەتەكەی دەگرتەوە وەك تراقياو ئاسيای بچووكو شامو ميسری فيرعەنی.

ديقلديانوس بەشی هەرە گرنگی ئيمپراتۆريەتی ڕۆمانی بۆخۆی هێشتەوە كە مەڵبەندەكەی نيقۆميديا بوو، وێڕای هێشتنەوەی نازناوو مافو دەسترەويەكانی ئيمپراتۆريەتەكە لای ئەوانەی دواتری بەدوادا هاتو پەيوەست بەوەوە بەدينەدەكرا.

بەوجۆرە ئيمپراتۆريەتی ڕۆمانی لەڕووی ڕوانگەييەوە بۆچوار بەش يان هەرێمی گەورە دابەشبوو بوو كەچوار فەرمانڕوا حوكمڕانيان دەكرد، دوانيان بەرزترين پايەيان هەبوو و نازناوی ئۆگەستس يان وەردەگرت، دوانەكەی تريش پلەيان نزمتربوو و نازناوی (قەيسەر)يان هەبووو لەكاتی مردن يان پيربوونو بێتوانايی ئەوانەی يەكەمدا شوێنيان دەگرتنەوە، هيچكام لەوانە هيچ لەمافو دەستڕۆييەكانی ئيمپراتۆريان نەبوو.

ئيمپراتۆر دەسەڵاتی باڵای ناو دەوڵەتی هەبوو سەرپەرشتی كارگێڕی هەموو كاروباری دەوڵەتی دەكرد وێڕای ئەوەی سەركردەی باڵای هێزەكانی سوپا بوو، لێرەدا پێويستە تێبينی ئەوە بكەين كە لەگەڵ دابەشبوونی دەسەڵاتی كارگێڕيو بەشكردنی رۆڵەكانی نێوان ئيمپراتۆرو فەرمانڕوا پەيوەستەكانيەوە، بەڵام خودی ئيمپراتۆر خۆی بەتەنها بەبەهێزی مايەوە، پەيوەندييەكانی نێوان چوار هەرێمەكەش لەئاستێكی باشو تێگەشتن لەبارو رۆڵيان بوو، چونكە هەموو ئۆگستێك مافی هەبوو بەخاكی قەيسەری ژێر دەسەڵاتيدا تێپەڕبێت.

دیقلـدیانوس بـەوەوە نەوەسـتاو دواتـر پـەنای بـرد بۆدابەشـکردنی چـوار هەرێمەکە بۆحەڤدە یەکەی بچووک، هەریەك لەو یەکانـەش جێگرێکـی فەرمانڕەوایی گـشتی سـەرۆکایەتی دەکـردو چـەند ناوچـەو ویلایـەتێکی دەگرتـەوە، ژمـارەی ویلایەتەکانیش گەشتە سەد ویلایـەت، هەریەکـەیان سـێ کارگێری سـەرەکی هـەبوو کە یەکێکیان سەرپەرشتی دادوەری‌و دووەمیش سەرپەرشتی ئابووری‌و سێیەمیش سەرپەرشـتی لایەنـە کۆمەڵایەتییـەکان‌و مـاڵ‌و مـوڵکی تایبـەت بەپاشـاکانی دەکـرد، لەئـەنجامی ئـەو دابەشـکاریەدا فـەرمانڕەوایانی ویلایەتـەکان بوونـە بەرپرسـی ڕاسـتەوخۆ لەبـەردەم نوێنـەرانی فـەرمانڕەوای گـشتی هەرێمەکـەدا، ئەوانـەش بەرپرسی بـەردەم ئیمپراتـۆر دیقلدیانوس بـوون، ئیمپراتـۆریش دەسـەڵاتی تـەواوی بەسەریاندا هەبوو لەڕووی دانان‌و لابردنیانەوە.

ئیمپراتۆر بەو کارەی ویستی ئاسانکاری لەلێپێچینەوەی کارگێڕیـدا بکـات تـا بەڕێگەیەکی خێراترو وردتر لەجاران ئەنجام بدرێت، لەهـەمان کاتـدا لـەو ڕوانگـەوە هۆکارەکـانی دابەشبوون‌و گەندەڵی ناوچـەیی ئـەوکات لـەناوببات، چونکە چـەندین سەختی‌و نارەحەتی لەسەدەی سێیەمدا هێنابوویە ڕێی ئیمپراتۆریەتەکە.

دیقلـدیانوس لەڕوانگـەی ئـەو چاکـسازییانەوە هەوڵیـدا لەخۆبەسـتنەوە بەپاشکۆی ڕێکخستنە ڕووکەشیە کۆمارییـەکان خـۆی دەربـاز بکـات کـە تـەنها وەك خـەیاڵێك مابوونـەوە، بۆیـە خێـرا دیمەنـەکانی دەسـەڵاتی کۆمـاری لابـردو ئیمپراتۆریەت لەسـەردەمی ئەودا وەك پاشایەتییەکی خۆسـەپێنی ڕەهـا دەرکـەوت، مێژوونوس‌و نوسەرانیش هەوڵیانداوە چەند راڤەیەکی مەنتیقی بۆئەو کـارە بکـەن، (نورمان ف. کانتور) لەکتێبەکەیدا (مێژووی ناوڕاست) دەڵێت: دیقلـدیانوس لەبـەر بـەرفراوانی قەڵـەمڕەوی ئیمپراتۆریـەت بـەرەو ڕۆژهـەڵات پـەنای بـۆ ئـەو ئاراسـتەیە بردووە، چونکە کاریگـەری ئـەو قەڵـەمڕەوە تـەنها لەڕێکخستنەکانی دیقلدیانوسـدا بەرتەسـك نەبووبوویـەوە، بـەڵکو بـەرز ڕاگرتنـی وشـەی ئیمپراتـۆرو وەرگرتنـی دەسەڵاتی ڕەهای هاوشێوە بەدەسەڵاتی کیسراکانیش لەخۆدەگرت.

دیقلدیانوس گرنگی زۆری بەسوپا دەداو سوپا پایەی بنەڕەتی دەسەڵاتەکەی بوو، سیستمی سوپایی دیقلدیانوس پشتی بەو ئەندامانە دەبەست کە لەنێو گەلان و دەوڵەتانی ژێر دەسەڵاتی ڕۆمانیدا یان گەلانی دواکەوتەی بواری ژیاریدا وەك جەرمەنەکان بەسەرباز دەگیران، ئەو مەنتیقەی لەو ماوەیەدا بۆ بەسەربازگرتن جەختی لێدەکرایەوە، لەسەر ئەوە ڕاوەستابوو هەرچەندە پشکی بەسەرباز گیراو لەسوپای ئیمپراتۆر لەچوارچێوەی ژیاریدا کەم بێت و بەپێی بەرزو نزمی ئاستیان بەبەراورد لەگەڵ چوارچێوەی ژیاری ئیمپراتۆریەتدا، هەرچەندە پشکی کەم بێت هێندە گرنگی سەربازەکەو پلەوپایەی لەسوپای ئیمپراتۆریەتدا زیاد دەکات.

دیقلدیانوس دەیویست دەستەکانی پێکهاتوو لەبەربەرە بەکرێگیراوەکان لەچوارچێوەی سوپای ئیمپراتۆریەتدا کە دەوڵەتی فرەبەشی دەپاراست بەسەرباز بگرێت، زۆربەی جار بنکەی ئەو سوپایانەی لەنزیك پایتەختەکانی چوار فەرمانڕەوا گەورەکە دادەنا، ئەوان زۆربەی جار لەباری بزاوتێکی بەردەوامدا بوون تالەکاتی ڕوودانی هەر مەترسییەك لەهەر سنورێکی ئیمپراتۆریەتەکەدا لەوپەڕی ئامادەیدابن، لەئەنجامی ئەمەدا ژمارەی ئەندامانی سوپای ڕۆمانی لەو ماوەیەدا زیادی کرد، وێڕای ئەوەی دیقلدیانوس بەخششێکی زۆری دەدا بەهەر بەکرێگیراوێك کە بچێتە ناو سوپاوە، ئەو ڕێگەی کردەوە تاسەرباز پلەی بەرزبێتەوە تادەگەیشتە پلەی ئەفسەر، دواتر بۆ پلە جیاجیاکانی تریش تەنانەت بۆ پلەی سەرکردەی باڵای سوپا هەنگاو بنێت.

تاکە پێوەریش کە بۆ چالاکی گواستنەوەی پلەی سەربازێك بۆ پلەیەکی تر بەکاردەهات، بریتی بوو لەئاستی دلێری و ئەزموونی سەربازەکە لەجەنگداو تاچەندە هەوادارو دڵسۆزی ئیمپراتۆرە.

چاکسازییەکانی دیقلدیانوس بواری دارایی و باجیشی گرتەوە، ئەو چالاکییەکی بەرفراوانی بۆ دابەشکردن و دیاریکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئیمپراتۆریەت کرد بەجۆرێك کە ڕەچاوی پێوانی باجەکان بکات، ئەو هەنگاوەشی بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی هەژارەکان کرد تا لەتوندی و ستەمی قۆرخکارو بازرگانە قۆرخکارەکانی بارە سەختەکان بیانپارێزێت، چونکە ئەوان بەو کارەیان

دەستکەوتێکی زۆرو بێوێنە بەدەست بخەن، لەگەڵ گرنگی ئەو هەنگاوە چاکسازییەدا، بەڵام زۆبەی مێژوونوسانو نوسەران لەنوسینەکانیاندا جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەو هەنگاوە نەیتوانی چارەسەری پێویستو حەقیقی ئابووری بۆ باری سەختی دەوڵەتی ڕۆمانی بەدیبهێنێت، چارەسەرەکەشی بەو هەنگاوەی گرتیەبەر چارەسەرێکی ڕووکەشو ناڕیشەیی بوو.

هەنگاوی چاکسازی دیقلدیانوس لەسەر لێدانی دراوێکی دروستو چاك بوو کە گەل بەتایبەت بازرگانانو ئیشکەرانی باری دارایی لێ رازیبن، هەروەك چەندێتی شمەکی ئاڵوگۆڕکراوی ناو بازاڕ دیاریبکات، ئەمە وێڕای نرخ دانان لەسەر پێویستییە بنەڕەتییەکانو مووچەکان.

لەئەنجامدا دەکرێت بڵێین هەمووئەوکارانەی ئیمپراتۆر دیقلدیانوس لەبواری داراییو بازرگانیدا پێی هەستاوە، ئەوە بووە کەهەوڵی چەسپاندنو ئاسانکاری دەزگای باجەکان ئەنجام بداتو هەوڵی دەدا ڕێگربێت لەڕوودانی هەر تەنگژەیەکی دارایی کە دەکرا تەنگ بە ئیمپراتۆریەت هەڵبچنێت، یان ئاستی بازرگانی بەرزبکاتەوە چونکە ئاستی بژێوی لەداڕمانێکی گەورەدا بوو.

پێویستە ئاماژە بەوەیش بکەین کەچاکسازیە جیاجیاکانی ئیمپراتۆر دیقلدیانوس وێڕای گرنگییان لایەنی خراپەشیان هەبوو، چونکە ئەو چاکسازیانە دەوڵەتی ڕۆمانیان پابەندی چەند خەرجییەکی گەورە کردو بارێکی قورسیان لەسەر خەڵکەکەی دانا، لەکاتێکدا دارایی ئیمپراتۆر لەسەرەتاکانی سەدەی سێیەمەوە دووچاری توند بوو بوو، ئەمە بارەکەی لەهەمووڵایەنەکانی تری قەوارەی ئیمپراتۆریەتەوە خراپتر کردبوو.

*******************

# چاکسازییەکانی ئیمپراتۆر قونستەنتین

دیقلدیانوس تاسالی ٣٠٥ز. لەسەر کورسی دەسەلات مایەوە، لەو ساڵەدا نەخۆشی و تەمەن پیری ناچاریکرد تابیر لەوە بکاتەوە دەسەلات بۆ کەسانێتر بەجێبهێڵێت دوای ئەوەی ئەرکی خۆی بۆ رزگارکردن و بەهێزکردنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەجێگەیاند، لەگەڵ ئەوەی دیقلدیانوس وازی لەدەسەلات هێنا، چەند جەنگێکی ناخۆیی بەدرێژایی حەڤدەساڵ ڕوویداو تیایدا کەسایەتی قوستەنتینییە دەرکەوت کە توانی یەك بەیەك بەسەر دوژمن و ڕکەبەرەکانیدا زاڵببێت تاتوانی بۆ جاری دووەم لەساڵی ٣٢٣ز. ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یەکبخاتەوەو دوای ئەوە ئەرکی تەواوکردنی ئەو چاکسازییانەی گرتەئەستۆ کە ئیمپراتۆر دیقلدیانوس دەستی پێکردبوو.

بێگومان ئەو هەنگاوەی ئیمپراتۆر بەس نەبوو تانیشانەی دیاری ناو مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بێت، ئەگەرچی ئەو هەنگاوانە شان و شکۆیەتی لەمێژووی ڕۆمانیدا هەبوو، بۆیە ئەو کارانەی دواتر کە ئیمپراتۆر پێی هەستا وایکرد ببێتە هێمایەکی دیارو گرنگی ناو مێژووی ڕۆمانی، کارەکانیشی چەند کاریگەرییەکی ڕوونیان لەگۆڕینی ڕووی مێژوودا بەجێهێشت و بەرەو بەدیهێنانی گواستنەوەی لەجیهانی کۆنەوە بۆ جیهانی سەدەکانی ناوڕاست چوو، ئیمپراتۆر دوو هەنگاوی گرنگی نا کە یەکەمیان داننانی بوو بە ئایینی مەسیحییەتدا بەشێوەیەکی ڕەسمی، دووەمیش گواستنەوەی پایتەختی ئیمپراتۆریەت بوو لەڕۆمای کۆنەوە لەبەرەی (تیبر) لەئیتالیاوە بۆ ڕۆمانی نوێ کە لەبەرەی بسفۆردا بنیادی نابوو.

قونستەنتین لەگەڵ گەشتنی بەکورسی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر بوو بەو سیاسەتە چاکسازییانەی ئیمپراتۆر دیقلدیانوس داینابوو هەوڵیدا کۆتا ڕێکردەی چاکسازی بەشێوەیەکی قوڵترو چەسپاوتر تەواو بکات، تا ئەوەی هەندێ لەنوسەران و مێژوونوسان زۆربەی جار بەسەختی دەزانن جیاوازی لەنێوان کارەکانی ئەو دوو کەسایەتیەدا بکەن، پێویستە تێبینی ئەوە بکەین ئەو چاکسازییە کارگێڕییانەی دیقلدیانوس و قونستەنتین پێی هەستان لەسەر بنەمای جیاکاری نێوان دەسەلاتی جەنگی و دەسەلاتی مەدەنی بوون.

ئەمەش بەڕوونی و دیاری لەسیاسەتی فەرمانڕەوایی هەرێمەکاندا دەرکەوت و فەرمانڕەوایی ویلایەت تەنها لەکاروباری مەدەنی ئەوێ بەرپرس بوو، لەکاتێکدا سەرکردەی سەربازی سەرپەرشتی لایەنە جەنگییەکانی ویلایەتێک یان چەند ویلایەتێکی ئیمپراتۆریەتەکەی دەکرد، گرنگترین گۆڕانکاریش قونستەنتین پێی هەستا کارکردن بوو بەبنەمای فەرمانڕەوایی میراتگری، بەوە پایەی ئیمراتۆری لەبنەماڵەکەیدا بوو بەمیراتگری و پشتی بەستبوو بەسوپا لەلایەک و پاڵشتی ئایینی نوێ لەلایەکی ترەوە.

لەلایەنی سەربازیشەوە ڕێکخستنەکانی قونستەنتین بەرەو کەمکردنەوەی ژمارەی ئەندامانی دەستە سەربازیەکان دەچوو، هەروەک لەسیاسەتی دەرگا کردنەوە لەڕووی جەرمانەکاندا بۆ چوونە نێو ڕیزی سوپای ڕۆمانی وەک سەربازی نیزامی بەردەوام بوو، وێڕای ئەوەی قونستەنتین دەستپێکەرێکی چالاک بوو، بەلام لێهاتوویی کارگێڕیەکەی جێی گومان بوو، چونکە باجەکان و خزمەتی زۆرەملێکانی تایبەت بەچاکسازی ڕێگەکان و دانانی دامەزراوە گشتیەکانی زیادکردو باجە گومرگییەکانی چەندبارە کردو چینی پیشەگەرانی بردە پلەی کۆیلایەتی، چونکە پیشەو کارەکانی کرد بەمیراتی تاخاوەن کارەکان لەدەست توندی باجەکان ڕانەکەن، ئەمە لەکاتێکدا کە سەپاندی سزای لەسەر باج کۆکەرەکان لەشارەکاندا توندی کردەوە ئەگەر بهاتباو نەیان توانیایە ئەو باجە کۆبکەنەوە کە حکومەت داوایدەکرد.

سەبارەت بەجوتیارانیش یاسایەکی توندی دانا کە ئەو کەسانەی بەهۆی زۆری باج و بەرزبوونەوەی نرخەکانەوە قەرزار بوون، بەپێی ئەویاسایە قەدەغەبوو زەویەکانیان بەجێبهێڵن و بچن بۆ ویلایەتەکانی دی تاچەندبارێکی چاکترو هێورتری ئابووری بدۆزنەوە، ئەمە لەناو بردنی چینی جوتیارە ئازادەکانی پێشخست و نەوەکانی ئەم چینەی کرد بەکۆیلەی پەیوەست بەزەوی لێرەدا هیچ گومانێک نیە لەدامەزراندنی قوستەنتینیەو کردنی بەپایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قونستەنتین ژیرو وردەکاریەکی کاریگەر دووریو بەرچاوڕونیەکی دانایانەی هەبووە، دەکرێت بیرۆکەی گواستنەوەی پایتەخت بۆ ڕۆژهەڵات سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆئیمپراتۆر دیقلدیانوس کە لەشاری نیقومیدیا لەسەر کەناراوی ڕژهەڵاتی دەریای مەرمەرە دادەنیشێتو گرنگی تایبەتی پێدەداو تیایدا چەندین بینای جوانی دامەزراند، بەڵام بەختکردنەوەی قونستەنتین بۆگواستنەوەی پایتەخت بەشێوەیەکی ڕەسمی بەڵگەی دووربینیی وڕاستی تێگەشتنیەتی لەوبارودۆخە نوێیەی کە لەوکاتەدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی تێدابوو، هەروەك بەڵگەی بوونی دلێریو خاوەن بڕیاریەتی کەوای کردوە ئەوەی بیری لێکردەوە چەسپاودامەزراوبکات.

هەرچۆنێك بێت ئەو هۆکارانەی پاڵیان نا بەقونستەنتینەوە تائەوهەنگاوە یەکلاکەرەوەیە بنێن، ئیدی پاڵنەرە سەرەکیەکەی ئەوەبێت کە ئیمپراتۆر پێی وابووبێت سیاسەتە ئایینیەکەی و داننانی بەمەسیحیەتدا ڕێنادە لەڕۆما بمێنێتەوە کە پێگەی بتپەرستیە تاییری لەگواستنەوەی پایتەختی خۆی بۆ ڕۆژهەڵات کردبێت کە تیایدا ژمارەی مەسیحییەکانی زۆرە، یان پاڵنەری تری هۆکاری جەنگی یان سیاسی یان شەخسی بێت، گرنگ ئەوەیە قونستەنتین توانیویەتی بیرۆکەکەی خۆی لەخاکی واقیعدا بەشێوەیەکی ڕەسمی لەساڵی ٣٣٠ز.داجێبەجێ بکاتو لەشوێنی شاری کۆنی بیزەنتەو لەبەرەی سفۆردا پایتەختێکی نوێی دامەزراند.

ئەو ناوچەش کە پایتەختی نوێی تێدابوو نیمچە دوورگەیەك بوو کە لەباشورەوە ئاوی دەریای مەڕمەڕو لەڕۆژهەڵاتەوە ئاوی گەرووی بسفۆرو لەباکوریشەوە ئاوی (قۆچی زێڕین) دەورەیان دابوو، ئەمە کەشێکی سروشتی گەورەی بۆ شاری نوێ دابین کردبوو، دیارە پێگەی شارەکەش لەئاستێکی بەرزی هێزو پتەویدابوو، چونکە بەسەر ئەو گەروانەدا زاڵبوو کە دەریای ڕەشیان بەدەریای ناوڕاست دەبەستەوە، لەلایەکی تریشەوە سەختی هێرش بردنەسەریو داگیرکردنی بوو.

ئەمە لەپاڵ ئەوەی قوستەنتینیە مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی بوو، کە ببوو بەپێگەی بەیەکگەیشتنی ڕێگە بازرگانییە گەورەکانی یەکخەری دەریای ئیجەو دەریای ڕەش و باکووری ڕۆژئاوای ئەورپا بەئاسیاوە، ئیمپراتۆر هەوڵیدا ئەو شارە نوێیەی بەناوی خۆیەوە ناونرابوو بیکات بەڕۆمای دووەمو تیایدا کۆشکێکی ئیمپراتۆری و بازاڕێك و دادگاو بینای سناتۆو حەمامو یاریگایەکی گەورەی بنیادنا تائەوەی پاش ماوەیەکی کەم شارەکە وەك سەرچاوەیەکی هێزو سامان بۆ هەموو حکوومەتێکی سەدەی چوارەم تا ئێستاش دەرکەوت.

لەڕاستیدا کەس ناتوانێت لەنرخی ئەو هەنگاوەی ئیمپراتۆرو کاریگەری لەمێژوودا کەمبکاتەوە، چونکە دامەزراندنی قوستەنتینیە لەسەدەی چوارەمدا ڕووی مێژووی ئەوروپی بۆ هەزاران ساڵی دوای ئەو سەدە گۆڕی.

ئەگەر ئەو کارە نەبوایە پاپەویەت نەیدەتوانی بگاتە ئەو شکۆیەو گەورەییەی سەدەکانی ناوڕاست و ڕۆژئاوای ئەوروپاش لەو قەڵا پتەوەی بەردەم موسڵمانان بێبەش دەبوو و بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا دەهاتن، ئەمە وێڕای ئەوەی قوستەنتینیە بووبە قەڵایەك بۆ ژیاری یۆنانی ئەگەرنا شاڵاوی ڕەگەزە سلاقیەکان بۆنیمچە دوورگەی بەلقان لەدواتردا ڕیشەی ئەو ژیارەی هەڵدەکێشا و ڕووی پێشکەوتنی ژیاری ئەورپای نەدەهێشت و دەیکردە پاشکۆی خۆی.

********************

# ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەدوای قونستەنتین

لەگەڵ گەورەیی دەستکەتەکەی قونستەنتین، بەلام پاش مردنی لەساڵی ٣٣٧ز. دەستکەوتەکانی فەوتان و ئیمپراتۆریەتیش بۆ چەندین بەش دابەشبوو و سێ کوڕەکانی بەسەر خۆیاندا بەشیان کرد، بارەکەش وابوو تا قونستەنتینیۆس توانی جارێکی دی لەساڵی ٣٥٠ز. دا ئیمپراتۆریەتی دابەشبوو یەکبخاتەوە.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆریەت یەکخرایەوە، بەلام لەنیوەی کۆتایی سەدەی چوارەمدا لەکاتی توندبوونەوەی هەڵمەتی دوژمنان بۆسەر سنورەکانی بەرەو ڕووی لێکهەڵوەشانی خێرا بوویەوە، بەبێ ئەوەی هەوڵەکانی پاشاکانی ئەو قۆناغە وەك جولیان (٣٦١ز-٣٦٣ز)و جوفیان (٣٦٣ز-٣٦٤ز)و فالنز (٣٦٤ز- ٣٧٨ز) بتوانن ڕێ بەو مەترسیە بگرن یان ئەو ڕەوتی لێکهەڵوەشانە بوەستێنن کە دووچاری قەوارەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووبوو.

جا ئیمپراتۆر جولیان لەکاتی جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی فارسی لەساڵی ٣٠٣ز کوژراو جێگرەکەشی پەنای بردە بەر خواستی ئاشتی لەگەڵ فارس لەڕێگەی دەستبەرداربوون لەخاکی نێوان دوو ڕووبار بۆ فارس، ڤالنزیش خێرا لەبەرەی فارسیەوە هرایەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی قووت و لەجەنگی ئەدرنە لەساڵی ٣٧٨ز.بەرەو ڕوویان بوویەوەو تیایدا قوتە ڕۆژئاواییەکان توانیان بەسەر سوپای ڕۆمانیدا سەرکەون و ئیمپراتۆریش لەجەنگەکەدا بکوژن، کوژرانیشی بەخاڵی گۆڕینی پرمەترسی مێژووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دادەنرێت، چونکە هۆزەکانی قوتە ڕۆژئاواییەکان لەوکاتەدا بەرەو خاکی ڕۆمانی دەکشان، ئەمەش لەژێر فشاری هۆنە ئاسیاییەکاندا بوو.

ئەمە لەکاتێکدا کە کڵێسا لەبەهێزی ودەوڵەمەندی خۆیدا بووت تائەوەی مەسیحییەت لەسەردەمی ئیمپراتۆر ئێودسیۆس (٣٧٨ز-٣٩٥ز)دا بووبە ئاینی ڕەسمی، بەمەش سەرەنجامی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەبەر دەستی جەرمانەکان لەلایەك وپیاوانی کڵێسا لەلایەکی ترەوە مایەوە.

لەکاتی مردنی ئیمپراتۆر ئیۆدسیۆس لەساڵی ٣٩٥ز. بارەکە بەدابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی گەورە لەنێوان کوڕەکانیدا بۆدوو بەشی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی کۆتایی پێهات، بەشی ڕۆژهەڵاتی پشکی ئەرکادیۆسی کوڕە گەورەی بوو، بەشی ڕۆژئاوای پشکی هۆنریۆس بوو. دیارە ئەو دابەشکردنە بەئاسایی هات، چونکە بەشی ڕۆژهەڵاتی یۆنانی بەشێوەیەکی نیوەندی لەژیارو ئاراستەو خواستیو عەقڵیەتی لەبەشی ڕۆژئاوای لاتینی جیابوو، پێویست ناکات بەو جۆرە لەو دابەشکردنە بگەین کە دیمەنی دابەشبوونو لێکهەڵوەشانێك بێت کە دووچاری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو بوو پاشا ڕۆمانە چاکسازەکانی وەك دیقلدیانوسو قونستەنتین توانیان لێی تێبگەن.

بەڵام هۆکارەکانی لێکهەڵوەشان لەو هەڵانەی ئەوان زۆر بەهێزتربوو کە تەنها کارەساتی توشبووی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دواخست بۆ سەردەمێکی دواتر کە لەڕاستیدا سەردەمی ژیانی ئەوان نەبوو، بەمە دەکرێت بڵێین ئەوە دەستکەوتێکی گەورەیە بۆ ئەوان، وێڕای دەستکەوتە چاکسازییەکانی دیکەیان.

*********************

# (باسی سێیەم)
# (ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیو مەسیحییەت)

لەکۆتا ڕۆژەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا دەروونەکان ماندوو و بێزاربوونو لەئەنجامی ئەو ئەزموونە تالأنەنی لەو جیهانەدا تێپەڕدەبوو دڵەکان پڕ لەبێهیوایی بوونو خوازیاری حەسانەوەی داوی مەرگ بوون لەژیانێکی دیکەدا. لەوکاتەدا هەواڵی هاتنی کەسێکی بیست کەپێی دەوترا (یەسوعی مەسیح) کە موژدەی بەوە دەدا ئەم جیهانە سەرپێیو ڕابواردنو یانەی گاڵتەو سەختییەکانەو ئەوانەی بڕوادێننو کاری چاکە دەکەنو کەسانی بێهیوای وەك بێوەژنو هەتیوان لای پەروەردگاریان پاداشت وەردەگرن، ئەویش ئەوەیە کە لەڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوەدا لەگەڵ زاتی پیرۆزیدا یەك دەبن، ئەمەش لەگەڵ فرەخودایی پێشینەکاندا پێکیداداو خەریکبوو تێکدەشکا، پشتیوانانیشی هەستیان بەپێویستی یەکێتی کرد، بۆیە لەپشت ئەمەوە کڵێسای مەسیحی کە بەدەست ئازاری ستەمو چەوساندنەوەوە ماوەیەك دەینالأند ڕاوەستاو دواتر لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زاینیدا توانی ئیمپراتۆر قوستەنتین بێنێتە ڕیزی خۆی.

بەمەش سەرکەتنی گەورەی بەسەر دژەکانیدا بەدیهێنا، دوای ئەوە ئەمیش کەوتە چەوساندنەوەی هەموو ئەوانەی پێچەوانەی بیروباوەڕەکەی بوون تائەوەی پاش چەند نەوەیەکی کەم بوویە خاوەن دەسەڵاتی جیهانی ڕۆمانی. کاتێك سلاقو جەرمەنە بەربەرەکان هێرسشان بردە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیو ئیمپراتۆریەتیش هیچی پێنەکرا، کڵێسا باوەشی کردەوە بۆ ئەو هۆزە بتپەرستانەو هەر هەوڵێکی خستەکار تابۆلای خۆی ڕاکێشیان بکات، لەو کارەشیدا سەرکەوتوو بوو، بەڵام ئەورووپا کە لەبەرچاوی خەڵك وادیاربوو لەژێر ئالأی کڵێسادا یەککگرتووە، بەرەو دوو بەش دابەش دەبوو، چونکە دوو کڵێسا پەیدابوون، یەکێکیان لەڕۆژهەلأت کە بەتریکی قوستەنتینییە سەرکردایەتی دەکرد، ئەمە کڵێسای

ئیغریقی ئەرپەدۆکسی بوو، دووەمیش لەڕۆژئاوا کە ڕۆما مەڵبەندی بوو و بەکڵێسای کاپولیکی ناودەبرا، ئەمە ژیانی ئایینیو هێزی خۆیدا زمانی لاتینی بەکاردەهێنا کڵێسای گەورە لەبیری ڕزگارکردنی مرۆڤدا بوو لەو تاوانە گەورەی کە دایەو بابە گەورەیان ئادەمو حەوا ئەنجامیان دابوو، یەسوعی ناسریش جەستەی خۆی کردۆتە قوربانی تا ڕێخۆشکەری بۆئادەمیزاد بکات تا لەشوێنەوارەکانی ئەو تاوانە ڕزگاربێت.

لەسەر ئەم بنەمایە کڵێسا هات تا ئەو پەیامەی عیسا لەپێناویدا ڕاپەڕی بچەسپێنێتو مرۆڤ لەبەڵاو سەختی ئەو نەفرینە ڕزگار بکات، لەمەشدا پشتی دەبەست بەوەی کە دەوترا مەسیح دەسەڵاتداری وڵاتەکەی لەداوی خۆی بەپێغەمبەر بوتروس سپاردووە، لەهەمان کاتدا چەند دەستەیەکی تر بەناوی ئایینی مەسیحییەتەوە دروست بوون بەڵام بەخێرایی کڵێسای کاپولیکی قووتیدانو نەیهێشت گەشەبکەن بەو بانگەشەی کە ئەو تاکە دامەزراوەیەکە کە دەبێت دەسەڵاتی بەسەر خەڵکدا هەبێتو مەسیحو پێغەمبەرەکەی ئەو دەسەڵاتەیان پێداوە کە لەدەست بەتریکەکانی ڕۆما (پاپاکان)دا کۆبووبوویەوە ئەگەریش لەهەر بەشێکی تردا ڕکەبەرێکی هەبێت ئەوا دەچێتە مەیدانی کوفرەوە.

بەو پێناوە کڵێسا لەدەست نەوەکانی نەسرانیەتدا گرمۆڵە بوو و هەمیشەش تاوانە گەورەکەیانی بیر دەخستەوە، دەیووت تەنها بەگوێڕایەڵێ ئەو لەو تاوانە ڕزگاریان دەبێت، پاشان بەتێپەڕبوونی کات چەند پێناوێکی تریشی هێنایە کایە تا بەمەبەستەکەی بگات، کۆمەڵێك ڕێنمایی هێنایە کایە کە لەدەورو خولی بنەماکانی باوەڕی مەسیحیدا دەسوڕانەوە، چەند نوێژێکیشی داهێنا کە لەگەڵ بارە جیاجیا دەروونیەکانی مرۆڤدا دەگونجان، زنجیرە بۆنەیەکی کاریگەری ئایینیشی داهێنا کە گرنگترینیان بۆنەی (قداس) بوو، حەوت نهێنیەکەشی بۆ هەموو ئەوانە زیادکرد، ئەو حەوت نهێنییە لەگەڵ کڵێسادا بووبە دوو قەوارەی پەیوەست بەیەكو یەکگرتوو، حەوت نهێنیەکەش بریتین لە:

- نهێنی (الکهنوت).

- نهێنی (المعمومة).
- نهێنی (المیروت).
- نهێنی (اللأعتراف).
- نهێنی (المشحه).
- نهێنی (الزیجه).
- نهێنی (القربان المقدس).

جێی ئاماژەیە کە پیاوانی ئایینی وێڕای هێزو ڕێبەرایەتی ئایینی و ڕۆحی، هێزی ماددی و قسەڕۆی دنیایشیان بەدەستهێنا، هەرکەس کتێبەکانی مێژوویی تایبەت بەو ماوەیەو باسی هەژاران و کێڵگەو سامانەکان بەجۆرەکانییەوە بخوێنێتەوە، دەبینێت کارە دنیاییەکانی کڵێساو پیاوانی کڵێسا سادە یان کەم نەبوون، بەڵکو پێویستی زۆر بە کارگێڕی ئەو سامانەو ئەنجامدانی کاروبارە جیاجیا ئایینیەکان هەبووە، بۆیە لەو پێناوەدا حکوومەتێکی کڵێسای پێکهات کە پیاوانی چینە ئایینە جیاجیاکانی لەخۆدەگرت هەر لەبەرزترین ئاستەوە تا خوارترینیان.

تەنانەت پاپا کە لەلوتکەی ئەو پلانەدا بوو، یەکبوونی بنەڕەتی کارگێڕی ئەو حکوومەتە (ئەبرشی) لەدەست قسیسەکاندابوو، بەیەکگرتنی ئەبرشیەکان ئوسقوفیەت لەژێر چاودێری کارگێڕی ئوسقوفدا پێکدەهات، بەیەکگرتنی ئەمانەش هەرێم پێکدەهات کە سەرۆکی ئوسقوفەکان فەرمانڕەوایی دەکرد، بەو جۆرە تا دەگەینە پیگەی پاپایی کە لەکۆماری پایتەختدایەو سوپایەکی ئەو کارمەندانەی هەیە کە لەلقی جیاجیاکانی کارگێڕی شاری خوادا (کڵێسا) کاردەکەن. جا لەپیاوانی دادگاکانەوە تا پیاوانی خەزێنە تا پیاوانی کارگێڕی تا ئەنجوومەنی (کەردەلە) دەهات، کە پاپا خۆی دیاریدەکردن، ئەوانیش پاش کۆچکردنی پاپای پێشوو پاپای نوێیان دەستنیشان دەکرد.

لەپاڵ ئەو کارمەندانەی کە کڵێسایان لەئەستۆدا بوو، سوپایەکی تری پیاوان و ئافرەتان دەبینین کە خۆیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی دانابوو، ئەوانە رووهبانەکان

بوون کە لەبەشە جیاجیاکانی ڕۆژئاوادا وەك چەند لقو دەستەیەك هەبوونو هەندێکیان بەخێرایی بڵاووبوونەوەو لەخاکی ئەوروپادا بایەخیان زیادیکردو سامانێکی زۆریان بەهۆی بەخشینی چاکەکارانو باوەڕدارانەوە کەوتە دەست. دیارترینیان (بندکنیون)ە کان بوون کە بندکنین لەساڵی ١٥٢٩ز دا دایمەزرند.

هەروەها فرەنسکانو دۆمەنیکانەکان کە لەسەدەی سیازدەو لەو نێوەندی گەرموگۆری هەستی ئایینی لەدەروونی نەوەکانی ئەوروپادا دورکەوتنو هەموو ئەمانە قسەیان لەبارەی هەژاریو پاکیو گوێڕایەڵییەوە دەکرد. ئەو شتەی سەرسوڕهێنەرو نامۆیە دەرکەتنی دەستەو تاقمە چینایەتییەکانو ئەو پلانەیە کە لەوێوە خەڵکی لەژێر تیشکی ئەوانەدا دابەشدەبوو. جا پیاوانی ئایینی ئەکلیرۆس کە دوو لق بوون لەچینی بالآدا بوون لقەکانی تریش بۆ دوو لق دابەش دەبوون، پیاوانی ئایینیو خەڵکی دی، کۆتا دانەشیان بۆ دوو لق دابەش دەبوو، خانەدانەکان کە چینی دووەمی ناو کۆمەڵگەیان پێکدەهێنا، چینی گشتیش کە بەچینی سێیەم ناودەبرانو زۆرینەی خەڵکی هەژارو ئاسایی لەخۆدەگرت.

*********************

# لەدانپیدانانەوە بۆ پێکدادان

ئێمەچاک دەزانین مەسیحییەت لەسەدەی یەکەمی زاینی لەفەلەستینی عەربیدا دەرکەوت و مەسیح (علیه السلام) لەسەردەمی ئیمپراتۆر ئۆگەستس(٢٧پ ز-١٤ز) لەدایك بوو، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش لەوکاتەدا بەدەست بۆشاییەکی گەورەی ڕۆحییەوە دەینالاند کەئاینە بتپەرستیەکانی ناوی پڕیان نەکردبوویەوە. مەسیحییەتیش لەسەرەتاداوە لەنێو دەستەو تاقمەکانی خواروو(هەژاران)دا بلاوبوویەوە، بەتایبەت کۆیلەکان، بەلام هێندەی نەبرد لەماوەی دواتردا چویەوە نێو نێوەندە کۆمەلایەتیە جیاجیاکانو بەشەکانی ئیمپراتۆریەتەکەوبووبەهێزێکی گەورەی سیاسیو کۆمەلایەتی.

چەندهۆکارێك لەوبلاوبوونەوەیەدا بەشداربوون، لەوانە فراوانبوونی ئیمپراتۆریەتەکەو پەیوەستی بەشە جیاجیاکان بەیەکترەوە بەهۆی ڕێگە پەیوەندییە بەهێزو چاکەکانو بازگانیەکی چالاکەوە، وێڕای زالبوونی زمانی لاتینیو زمانی یۆنانی لەبەشی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتدا، ئەمە کاری موژدەدەرانی ئاینی نوێی ئاسان کردبوو، سەرای ئەمانە ڕێکخستنی وردی کلێسا کە گەورەییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (ئەبە) یەکەمینەکانی کلسابەتایبەت قدیس پۆلسو قدیس بوترس.

جێی تێبینیە ئیمپراتۆریەت لەسەرەتادا گرنگیەکی وای بەچالاکی مەسیحیەکان نەداو بەدەستەیەکی بچوکی ئاینی دادەنان کەوەك دەستەبچوکەکانی دیکە وابن، بەلام ژمارەی مەسیحیەکان کەزیادی کردو بوونیان بەهێزێی ڕێکخراو، پاشاکانی ڕۆمانی لەدژیان وروژاندو کەوتە لێدانوچەوساندنەوەی مەسیحیەکانو پەیرەوی سیاسەتی سەرکوتکردن بەرامبەر بەمەسیحیەکان، ئیمپراتۆر نیرۆن تاوانباری کرن بەسوتاندنی ڕۆمالەسالی ٦٤ز ولەبەرامبەر ریاندا سیاسەتێکی توندی گرتەبەر.

مەسیحیەکان لەسەردەمی ئیمپراتۆر دمیتیانوس لەسالی ٩٦ز. دا بەرەوڕووی هەلمەتێکی دیکەی چەوساندنەوەو سەرکوتکردن بوونەوە. سەدەی سێیەمی

زاینیش سەردەمی چەوساندنەوەو کوشتو بڕی مەسیحیەکان بوو، ئەمەش کاری یەك یان چەند ئیمپراتۆرێکی سەدەکە نەبوو، بەڵکو هەموویان وابوون، مەسیحیەکان لەسەردەمەکانی پاشایان سبتیەسیوس سیفیروس(١٩٣ز-٢١١ز)و دیکیوس (٢٤٩ز-٢٥١ز)و دیقلدیانوس(٢٨٤ز-٣٠٥ز)دا بەرەو ڕووی چەوساندنەوەبوونەوە.

پاڵنەرە سەرەکییەکان لەپشت ئەم هەڵمەتانەی چەوساندنەوەو کوشتوبڕەوە بریتییە لە ئامادەنەبوونی مەسیحییەکان بە بەخوادانانی ئیمپراتۆرو چوونە نێو ڕیزەکانی سوپای ئیمپراتۆری و جەختکردنەوەیان لەسەر ئەوەی تەنها دەسەڵاتێك بەسەریانەوە کتێبی پیرۆزو گوێڕایەڵی خوایەو بەس، بۆیە پاشاکان ئەوەیان بەمەترسییەك دەزانی کە هەڕشە لەدەسەڵاتی ڕەهاو ئیمپراتۆریەتی فرە بەشیان دەکات. لێرەوە دەسەڵاتە ڕۆمانییەکان وەرگرتنی مەسیحییەتیان بەتاوان دەزانی لەڕووی دەوڵەتدا، بۆیە کۆبوونەوەکانی مەسیحییەکانیان قەدەغە کردو شاڵاوی چەوساندنەوە لەدژیان ڕێکدەخرا، تەنها هەندێك لەفەرمانڕەوا توندوتیژە ناسراوەکان بەخۆسەپێنییان دژب ەمەسیحیەکان هەڵمەتی چەوساندنەوەیان ئەنجامنەداوە وەك نیرۆن کەمەسیحیەکانی ڕۆمای وەك خۆراكو سوتەمەنی دەهێنا بۆ ئەو ئاگرە گەورەی کە لەساڵی ٦٤ز. کردیەوە، بەڵکو لەو هەڵمەتە چەوساندنەوانەدا دەستەیەك لەپاشا چاکسازەکانیش کەوا ناسرابوون بەسووربوونییان لەسەر پەیڕەوکردنی یاسا وەك تراجانو هادریانو ئەنتۆنیوس بیوسو مارکۆس ئورلیوس بەژداریان کرد.

لەکۆنترین ئەو بەڵگەنامانەش کە سەرەتای سەردەمی چەوساندنەووەی مەسیحیەکان نیشان دەدەن، ئەو نامەیە کە بلینی بچووکی فەرمانڕەوای بیتنیا ناردی بۆ ئیمپراتۆر تراجان (٩٨ز-١١٧ز) کە تیایدا ئەوە نیشان دەدات لەهەموو ئەوانەی گومانییان لەسەرە خۆشبووە دوای ئەوەی قوربانییان بۆپەیکەری

ئیمپراتۆر کردووە، لەکاتێکدا ئەوانەی لەسێدارەداوە کە ئەو کارەیان نەکردووە. ئیمپراتۆر تراجانیش بەنامەیەکی دەستخۆشی کردن لەو کارەی وەڵامی داوەتەوە.

وادیارە ئەوچەوساندنەوەش ئەنجامێکی ڕەنگ دانەوەیی و پێچەوانەیی لێکەوتەوە، چونکە گیانی دلێری و خۆڕاگری و باوەڕێك کە شەهیدە مەسیحییەکان پێی بەرەو ڕووی سەرەنجامیان دەبوونەوە، بوویە جێی سەرسوڕمانی زۆربەی ئەوانەی ئامادەی وەرگرتنی ئایینی نوێ بوون.

بەمجۆرە سەدەی سێیەم بوو بەهێزی مەسیحییەت بەجۆرێك بوو بەهێزێکی مەترسیدار لەئەنجامی زۆربوونی ژمارەی شوێنکەتەکانی ئەمە ئیمپراتۆر دیقلدیانوسی هاندا تا لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمدا زیادەڕەوی لەسەرکوتکردنیان بکات، بەتایبەت کە زیادکردنی قەڵەمڕەوی مەسیحییەت لەنێو پیاوانی سوپادا بوویە هەڕەشە بۆ لەناوبردنی هەواداری سەرباز بۆ ئیمپراتۆریەت. دیقلدیانوس چەند مەرسومێکی دەرکرد کە تیایدا نوێژی مەسیحییەکانی قەدەغەکردو فرمانیکرد تا کڵێساکانیان بڕوخێنن و کتێبەکانیان بسوتێنن و قسیسەکانیان بگرن و بەیەکجارەکی لەپیشە حکوومیەکاندا دەریانبکەن، ئەمەو چەندین لێپێچینەوەی تری توندی وا کە وای لەمەسیحییەکان کرد بەماوەی کۆتایی دەسەڵاتەکەی بڵێن (سەردەمی شەهیدان).

دیقلدیانوس بەو سیاسەتەی دیویست کڵێسا ناچاربکات ملکەچی دەوڵەت بێت و وەك دەستەو ڕیکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی تری ناو دەوڵەتی ڕۆمانی لێبکات، چونکە بوونی کڵێسا وەك دەستەیەکی سەربەخۆ یان وەك دەوڵەتێك لەناو دەوڵەتدا کارێکی پێچەوانەی ئەو بنەمایە کەمینەبوو کە سیستەمەکەی دیقلدیانوسی لەسەر وەستابوو چاکسازی پێدەکرد کە دەیوت دەبێ هەموو هاووڵاتیان ملکەچی دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەت بن.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ستەمی پاشاو فەرمانڕەواکان تاکە مەترسییەك نەبوو کە لەو ماوەی مێژووەیاندا هەڕەشەی لەمەسیحییەت دەکرد، بەڵکو ئایینی

نوێ دەبوو لەهەمان کاتدا بەرەو ڕووی هەڕەشەیەکی تر ببێتەوە، پێدەچێت زیادەڕەوی نەبێت ئەگەر بڵێین زۆر لەستەمی پاشا ڕۆمانییەکان مەترسیدارتر بووبێت، ئەویش مەترسی (غەنوسیەکان) بوو کە دەیانویست ڕێنماییەکانی مەسیحییەت تێکەڵ بەبیروڕا میتافیزیکییەکانو فەلسەفەی ئەفلاتوونی نوێ بکەن، ئەمە وێڕای ئەو هێرشەی جولەکەکان کە بەرەو ڕووی مەسیحییەت بوویەوە.

بەڵام باری مەسیحییەکان لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زاییندا گۆڕاو ئیمپراتۆر قوستەنتین هێزێکی ڕێکخراوی ئایدۆلۆجی لەمەسیحییەتدا بەدیکرد کە دەکرا لەململانێی دژ بەرکەبەرەکەی لەسەر دەسەڵات بەکاریبهێنێت، بۆیە لەساڵی ٣١٣ز. دا مەرسومی میلانی دەرکرد کە تیایدا دانی نا بەوەی مەسیحییەت وەك ئایینەکانی تری ناو ئیمپراتۆریەتەکە یەکسان بێت، دواتریش وەك هەنگاوێکی تری ڕێی بەرزکردنەوەی پلەوپایەی مەسیحییەت خۆیشی بووبە مەسیحیو هەژموونی بەسەر هەموو ئیمپراتۆریەتەکەدا چەسپاند، وێڕای ئەو چەوساندنەوەی لەسەر جولیان (٣٦١ز-٣٦٣ز)دا بەرەو ڕووی مەسیحییەت بوویەوە، بەڵام لەگەڵ کۆتایی سەدەی چوارەمدا بووبە ئایینی ڕەسمی خاوەن هەژموون بەسەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا کە بەهەموو توانایەکییەوە هەوڵی بەرزڕاگرتنی دەدا.

تا ئەو کاتەش کڵێسا ببویە هێزێکی ڕێکخراوو خاوەن هەژموونو بەردەوام دژ بەدەوڵەت خەباتی دەکرد، بەڵکو هەوڵیدەدا بەپێی بارودۆخو خواستەکانی خۆی ڕێکبخاتو چەند ڕووبەرێکی فراوانی گرتبوویە دەستو قەڵمڕەوی ئوسقوفەکانی زیادیکردبوو، بەتایبەت لەماوەی ئەو بارگرژیانەی دوچاری ژیانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوا ببونەوە، چەند هەوڵێکی مژدەبەری گەورەشی لەنێو بەربەرەکاندا بەخەرجدا کە چەند ئەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوەو زۆربەیان لەماوەی سەدەی چوارەمو پێنجەمی زایینیدا بوون بەمەسیحی.

کڵێسای ڕۆما لەماوەیەکی کەمدا بەرەو ئەوە دەچوو ڕۆڵی دەسەڵاتداری لەجیهانی مەسیحیدا بگرێتە دەستو بیانووی ئەو چاوچنۆکیەشی بەپیرۆزیە

تایبەتەکەی دەهێنایەوە، چونکە دوو لەگرنگترین کەسەکانی مەسیحییەت لەدوای مەسیح کە بوترس و پۆلس بوون دایانمەزراند، تائەوەی کلێسا پیرۆکەیەکی سەرەکی گرتە خۆی کە ئەویش ئەوەبوو ئوسقوفی ڕۆما جێگرەوەی بوترسی یەکەمینی حەواریەکان و جێگرەوەی مەسیحەو خۆی بەمیراتگری پلەو پایەی مێژووی ڕۆمای پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دادەنێت، پاشان پێویستە گرنگییەکەی لەگەڵ گرنگی سیاسی و ئابووری ڕۆمادا بگونجێت، وەك چۆن کلێسای ڕۆما یەکبوونی خۆی دەناسی، لەکاتێکدا کلێسای ڕۆژهەلاتی گیرۆدەی دەست دابەشبوونە یەك لەدوای یەکەکان بوو.

دارمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕۆژئاوادا یاریدەدەربوو تا کلێسای ڕۆما لەکارتێکەرە سیاسییە ڕاستەوخۆکانی پاشاکانی ڕۆما دووربکەوێتەوە. ئەمە وایکرد قەوارەیەکی تایبەتی هەبێت کە بەپێپەڕبوونی کات سەربەخۆییەکەی زیادی دەکرد، بەپێچەوانەی کلێسای قوستەنتینیە کە ملکەچی تەواوی دەسەلاتی پاشاکان بوو، وێڕای ئەوەش دەرکەوتنی کۆمەڵێك بیریار وەك کامبروس و ئۆگەتسس و بەدوادا هاتنی چەند کەسایەتییەکی بەهێز بۆ سەر کورسی دەسەلات وەك لیۆی یەکەم و گریگۆری یەکەم یاریدەدەربوو تا شانوشکۆی کلێسای ڕۆما بەرز بکاتەوەو گرنگییە کلێسای و ڕۆحییەتە مەسیحییەتەکەی زیادبکات تا ئەوەی سەرۆکی ئوسقوفەکانی ڕۆما بەپاپا دەناسراو هەموو ئوسقوفەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپی لەسەدەی پێنجەمی زاینیدا دانیان بەدەسەلاتیدا دەنا.

جێی ئاماژەیە کلێسا لەماوەیەکی کەمی مێژووی خۆیدا کەوتە دەست وەردانە کاروباری سیاسی، کاتێك ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕۆژئاوادا دارما، کلێسا تاکە دامەزراوەی ڕێکخراوبوو کە هەولیدا بۆشایی سیاسی پڕبکاتەوەو کاروباری ولاتانی ئەورووپی بگرێتەدەست، نموونەی دەستوەردانی پاپاکان لەکاروباری سیاسیش، ئەو دانوستانانەن کە پاپا لیۆی یەکەم (٤٤٠ز-٤٦١ز) لەگەڵ ئەتیلا لەکاتی کۆتا گەمارۆدانی ڕۆمادا ئەنجامیدا، دەستتێوەردانەکەی پاپا دوای ئەوەبوو

کە ئیمپراتـۆر پـەنای بـۆ بـردو بانگهێـشتی کـرد تـا ڕۆمـا ڕزگـار بکـات. پاپـا گیلاسیۆسی یەکەمیش بیردۆزە ناودارەکەی خۆی دانا (بیردۆزەی دوو شمشێرەکە) کـە لەسـەر بنـەمای بـوونی دوو هێـزی وا دامـەزرابوو کـە جیهانیـان بەشـکردووە، دەسەڵاتی سیاسیش (دەسـەڵاتی ئیمپراتـۆر)، دەسـەڵاتی ئایینی (دەسـەڵاتی پاپـا)، بیردۆزەکە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەسەڵاتی دووەم (ئایینی) گرنگترو بەهێزترە لەڕووی بەرپرسیارێتییەوە، چونکە پاشاکان بەپێی ئەو بیردۆزەیە نەوەی کڵێسان.

پاپاکان بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو دەوڵەتی تایبەتی خۆشیان دامەزراند کە بەدەوڵەتی پاپـەوی ناسرابوو، ئەمـەش لەنێوەنـدی ئیتالیادا بـوو، ئـەو دەوڵەتـە تـا دامەزرانـدنی یـەکبوونی ئیتـالی لـەنێوەی دووەمـی سـەدەی پێشوو بـەردەوام بـوو و سوپای تایبـەتی خـۆیو دادگـاو خەزێنـەی تایبـەت بـەخۆی هـەبوو، ئـەو دەوڵەتـە لەئـەنجامی فـشاری پاشـا بێزەنتییـەکانو پاشـا لۆمباردییەکانـدا ناچـاربوو لەگـەڵ پاشا فرەنجەکاندا پێوەندی ببەستێتو داوای بەرگرییو پارێزگاریکردنییان بکات.

لەگەڵ هاتنی سەدەی هەشتەمی زاینیدا پاپەویەت کەوتە داوای دەسـەڵاتداری جیهانی سیاسیو ئایینی، لەمەشدا پشتی بەبەڵگەنامەی (قوستەنتین) بەستبوو کە ئەوەی دەگەیاند ئیمپراتۆر قوستەنتینی یەکەم دەستبەرداری دەسەڵاتەکانی خـۆی لەبەشی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتەکەیدا دەبێت بۆ پاپاو پاپا مافی هەیە تاج بدات بەئیمپراتۆر یان وەریبگرێتەوە بەو پێیەی ڕێبـەری دەسـەڵاتی ئایینیو دنیاییشە، هـەروەك ئـەو بەڵگەنامەیـە دان بەڕێبـەری کڵێـسای ڕۆمـا بەسـەر هـەموو کڵێـساکانی تردا دەنێت، ئەو بەڵگەنامەیە بۆ ماوەی نزیکـەی حـەوت سـەدە چەکێکی بـەهێزبوو بەدەست پاپاکانەوە، لەو ماوەشدا پاپا هێزێکی سەرەکی بوو تا تاج بدات.

پاشـاکانو بڕیارەکـانی بێبەشـبوون لـەمافی هـەر دەسـەڵاتدارێکی هەڵگـەڕاوە لەڕووی ڕێبەرەکەیدا دەربکات، پاپا ستیڤنی دووەم لەساڵی ٧٥٤ز. دا تـاجی کـردە سـەر بیبنـی سـێیەمی پاشـای فرەنجـە، پاپـا لیـۆی سـێیەمیش تـاجی کـردە سـەر

شارلەمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان لەساڵی ٨٠٠ز. دا. پاش مردنی شارلەمان دیدی دەســەڵاتداری پاپــەوی چــەند لایــەنێکی وردو تونــدتری وەرگــرت، بەتایبــەت لەســەردەمی پاپــا نیقـۆلای یەکەمـدا (٨٥٨ز-٨٦٧ن)، بـەڵام پاپەویـەت بـەردەوام پێویـستی بەپاڵپـشتی پاشـاو سـەرکردەکان هـەبوو تـا پێگـەکانی خـۆی لـەئیتاڵیا بچەسپێنێت تا خانەدانە نەیارە ئیتالییەکانی لابدات. جا بۆ نموونە ئوتۆی گەورە توانی پاش دەرکردنی پاپا، پاپا بگێڕێتەوە بۆپایەکەی خۆی، بەرامبەر بەوە پاپا لەساڵی ٩٦٢ز. دا تاجی کردە سەر وەك ئیمپراتۆری ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە دواتر بەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز ناسرا.

بـەڵام پەیوەنـدی پاپـاو ئیمپراتۆریـەت خێـرا دارمـاو ململانێـی هـەردوولا لەسـەردەمی ئیمپراتـۆر هیـزی چوارەمدا (١٠٥٦ز-١١٠٦ن) گەشـتە لوتکـە وێـڕای قەڵـەمڕەوە فراوانەکـەی کڵێـسا گـیرۆدەی دەسـت دەسـتێوەردانی پاشـاکان بـوو لــەدانان و دیــاریکردنی پاپاکانــدا، چــونکە سیــستمێکی دیــاریکراو نــەبوو بـۆ هەڵبژاردنی پاپاکان، ئەوەش دەرفەتی بۆئەو دەستێوەردانە دەکردەوە کە زۆربەی جار دەبوو بەململانێیەکی بەردەوامی نێوان هێزە جیاجیاکان.

لـەپێناو ڕزگـاربوون لـەو بـارەو بـەهێزکردنی پێگـەی پاپەویـدا لەسـەدەی یانزەهەمـدا لـەناو کڵێـسادا بزوتنەوەیـەکی چاکسازی دەرکـەوت کـە بەبزوتنـەوەی (کلـۆنی) ناسـرا، ئەمـەش لـەناوی (دێـری کلـۆن لـە فەرەنـسا) وە هـاتووە، یـەکێك لەکلۆنییـەکان کـە هیلدبرانـدبوو لەئەنجوومـەنی پاپەویـدا پێگـەی سـەرکردایەتی دەگرتە دەست، پاشان بوو بەپاپا بەناوی گریگۆری حەوتەمەوە (١٠٧٣ز-١٠٨٥ن). پاپـای نـوێ وەك پـشتیوانە کلۆنییـەکانی بـڕوای بەدەسـەڵاتداری پاپـەوی و گرنگی گرتنــە دەســتی دەســەڵاتی دنیــایی هــەبوو، بــۆ بــەدیهێنانی ئەمــەش چــەند چاکـسازییەکی ئەنجامـدا، لەوانـە پێـشنیاری سیـستمی نـوێ بۆهەڵبـژاردنی پاپا لەساڵی ١٠٥٩ز، کە بەوپێیە پاپا لەلایەن ئەنجوومەنی (کرادلە)وە هەڵدەبژێررا، بەمەش پاشاکان دەرفەتییان بۆ نەما تا دەستوەردەنە هەڵبژاردنی پاپا.

ساڵێك دوای ئەوە بڕیاریدا كە نابێت پیاوانی ئایینی هاوسەرگیری بكەن، ئامانجیشی لەو بڕیارەی ئەوەبوو ڕێگە نەدات بەوەی ماڵو موڵكی كڵێسا لەڕێگەی میراتگیرییەوە بگوازرێتەوە، لەساڵی ١٠٧٥ز.دا پاپا گریگۆری حەوتەم بڕیاریدا مافی دەسەڵاتی دنیایی لەدانانان بەدیاریكردنی پیاوانی ئایینی لەخاكەكەیدا لەكاربخرێت، چونكە پێشتر پیاوی ئایینی نوێ خاتەمو سولجان لەلایەن ئیمپراتۆر یان پاشا یان سەركردەی ناوچەییەوە دیاریدەكرا. ئەو بڕیارە ئیمپراتۆر هنری چوارەمی بێزاركردو داوایكرد لە (ورمز) كۆبوونەوەیەكی كڵێسایی ئەنجام بدرێت، تیایدا بڕیاریدا پاپا گریگۆری حەوتەم لەساڵی ١٠٧٦ز. دا لاببات، پاپاش بەرامبەر بەوە بڕیاری لابردنی ئیپمراتۆرو سەربەستبوونی خەڵكو گوێڕایەڵی نەكردنی ئیمپراتۆری دەركرد، سەركردە نەیارەكانی ئیمپراتۆریش دەرفەتەكەیان قۆستەوە تا لێی هەڵگەڕێنەوە، بەتایبەت لەهەرێمی سەكسۆنیا كە جێی مەبەستو خواستو هەوڵە فراوانخوازییەكانی ئیمپراتۆربوو لەسەر حسابی دەرەبەگەكانو پیاوانی گەورەی ئایینی.

لەبەردەم ئەو بارودۆخەدا ئیمپراتۆر هینری چوارەم ناچاربوو ملكەچی خۆی بۆ پاپا ڕابگەیەنێتو لەساڵی ١٠٧٧ز دا چوو بۆ ئیتالیاو لەبەردەم قەڵای كانوسادا وەستا پاپا لەو قەڵایەدا بوو، تا سێ ڕۆژ بەبەرگی خۆیو لەسەر پێ لەسەرمای توندی زستان لەوێ وەستا، ئینجا پاپا دەرفەتی پێدا تا بچێتە ژوورەوەو بەچەند مەرجێكی قورس لێخۆشبوونی پێبەخشی.

ڕووداوی دیاری كانوسا كە دواتر بوو بەنموونەی ناو مێژوو، هێمایەكی ملكەچبوونی دەسەڵاتی دنیایی بوو لەبەردەم دەسەڵاتی پاپەویدا، ئەو ڕووداوە نەبوویە هۆی بەرقەراربوونی ئاشتیو تەبایی نێوان هەردوولا، بەڵكو ئیمپراتۆر هنری چوارەم ناكۆكییەكانی ناو سەربازگە نەیارەكەی خۆی قۆستەوەو سەرلەنوێ چوویە ململانێ لەگەڵ پاپاداو بڕیاری بێبەشبوونی لەڕوودا دەركردو داوای لەسەركردە ئەڵمانەكان كرد تا ئیمپراتۆرێكی نوێ هەڵبژێرن، ڕۆدۆلف كە لەلایەن

سەرکردەکانەوە وەك ئیمپراتۆری نوێ هەڵبژێردرا، خێرا لەساڵی ١٠٨٠ز. دا لەجەنگێکی لەگەڵ هنری چوارەمدا کوژرا، هنری چوارەمیش دوای ئەوە چوویە ناو ئیتالیاو لەساڵی ١٠٨٤ز. دا خودی رۆمای گرت، ئەگەر پاڵپشتی نۆرمانی بۆپاپا نەبوایە، ئەوا پاپا بەدیلی دەکەوتە دەست ئیمپراتۆر، پاشان پاپا لەگەڵ لەگەڵ هاوپەیمانە نۆرمانەکانیدا ڕایکرد بۆسالرنو لەباشووری ئیتالیاو لەساڵی ١٠٨٥ز. دا مردوو وەسیەتی بۆجێگرەکانی کرد تا دژ بەهنری چوارەم درێژە بەململانێ بدەن.

وێڕای ئەوەی ئیمپراتۆر هنری پێنجەم دژ بەئیمپراتۆری باوکی (هنری چوارەم) هاوپەیمانی بەست، بەڵام کاتێك دەسەڵاتی ئیمپراتۆری گرتە دەست، ئەویش ئامادەنەبوو بەرهەمخوازی عەلمانی لەئیمپراتۆر بکشێنێتەوەو تەنها لەکۆتایی دەسەڵاتەکەیدا گەیشتە ڕێککەوتنێك لەگەڵ پاپادا کە بەڕێککەوتنی (ورمز) ناسراوەو لەساڵی ١١٢٢ز. دا بەستراو جەختی دەکردەوە لەسەر پێویستی ئامادەبوونی ئیمپراتۆر یان نوێنەرەکەی لەنێو ئاهەنگی هەڵبژاردنی ئوسقوفەکان لەئەلمانیا، هەروەك ئیمپراتۆر لەلایەن خۆیەوە بەڵێنیدا ماڵو موڵکی دەستبەسەرداگیراوی ماوەی ململانێی لەگەڵ کڵێسادا بگێڕێتەوە بۆ کڵێسا.

سەبارەت بە بەرهەمخوازی عەلمانیش بۆ دوو بەشی دابەشکرد، بەشێکی لەدەست پاپادا بوو کە بەشە ئایینەکەیەو بەشی دووەمیش کە بەشی دنیاییە لەدەستی ئیمپراتۆریەتدا بێت، ڕێککەوتنەکە بەشێوەیەکی گشتی لەبەرژەوەندی پاپادا بوو، چونکە بوویەهۆی کورتکرنەوەی دەسەڵاتی پاشاکان بەرامبەر بەئوسقوفەکانو دابەزاندنی ئەو باجانەی بەسەر زەوییەکانی کڵێسادا سەپابوون.

لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆر فریدریك باربارۆما (١١٥٢ز-١١٩٠ز) کورسی ئیمپراتۆریەتی گرتە دەست، قۆناغێکی نوێی ململانێی نێوان هەردوولا دەستپێکرد، پاپەویەت سووربوو لەسەر پێویستی ملکەچی فریدریك بۆپاپا، چونکە ئەو تاج دەکاتە سەری، فریدریکیش چاوی لەو سامانە زۆرەی ئیتالیا بوو

کە بەهۆی جەنگە خاچپەرستییەکانەوە زیادیکردبوو، بۆیە ئیمپراتۆر فریدریک لەساڵی ١١٥٨ز. دا هەڵمەتێکی فراوانی بردە سەر ئیتالیاو توانی لەساڵی ١١٦٢ز. دا میلان بگرێتو هەژموونی خۆی بەسەر چەند بەشێکی تری ئیتالیادا بسەپێنێت.

کاتێك شارە ئیتالییەکان ویستییان لەدژی هاوپەیمانی ببەستن، ئیمپراتۆر لەساڵی ١١٦٧ز. دا جارێکی دی گەڕایەوە بۆئیتالیاو ڕۆمای گرتو پاپا ئەسکەندەری سێیەمیش ناچاربوو لەشار ڕابکات، بەڵام خێرا بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون لەڕیزی هێزە سەربازییەکانیدا ئیمپراتۆر ناچاربوو لەئیتالیا پاشەکشە بکات، بەمە شارە ئیتالییەکان ئامادەنەبوونی خۆیان قۆستەوە تا هێزەکانی ئیتالیا ڕێکخەنو لەدژی ئیمپراتۆر تا ئاراستەیان بکەن، ئیمپراتۆر جارێکی دی لەساڵی ١١٧٤ز. دا گەڕایەوە بۆئیتالیاو لەنزیك میلان تووشی شکستێکی سەخت بوو، لەو ئەنجامەدا بەڵێنیدا جارێکی دی دەستوەرنەداتە کاروباری پاپەویەتو کڵێساوە.

بەوجۆرە پاپەویەت لەململانێی لەگەڵ دەسەڵاتی دنیاییدا (دەسەڵاتی پاپەویەت) وەك هێزێکی زاڵو خاوەن هەژموون دەرچوو، بەڵکو دەسەڵاتەکەی لەسەردەمی پاپا ئەبوسنتی سێیەم (١١٩٨ز-١٢١٦ز)دا گەشتە لوتکە، ئەو بەگوڕوتینەوە ئەو پێشنیارانەی کڵێسای گرتەبەر کە جەختی لەوە دەکردەوە دەسەڵاتی سەرزەوی بۆ فەرمانڕەواکانو لەئاسمانیش بۆ قەشەکانەو پاشاکان بۆدەسەڵاتداری جەستەکانو قەشەکانیش بۆدەسەڵاتداری گیانەکان دەبنو دەسەڵاتی پاپا وەك خۆرو دسەڵاتی ئیمپراتۆریەتیش وەك مانگ وایەو دەبێت لەخۆرو تیشك وەربگرێت، وەك چۆن پاشاکان دەسەڵاتییان لەپاپاکانەوە وەردەگرت.

بەوجۆرە کڵێسا بووبە هێزێکی گەورەی پتەو بەهێزو خەزێنەیەك کە لەخەزێنەی هەر پاشایەکی تری ئەورووپی ئەوکات دەوڵەمەندتر بوو، چەندین پاشای ئەورووپاش دانییان نا بەشوێنکەتەیی خۆیان بۆپاپا، لەوانە پاشای

ئینگلتەراو ئەراگۆن‌و پورتوگال‌و سویدو دانیمارك‌و پۆڵەنداو چەندێکی دی، هێزی ترسێنەری دادگاکانی پشکنین ئامێرێکی کارا بوون لەدەست پاپاوە تا لەهەرکەسێك بدەن کە لەدەسەڵاتداری دربچن‌و ڕەخنە لەکارەکانی بگرن، جا لەسەردەمی پاپا ئەنوستنی سێیەمدا ئەو دادگایانە هەزاران (ئەلبیجینسی)یان لەباشووری فەرەنسادا سووتاندن، هەروەك پاپاویەت چالاکی دۆمەنیکان‌و فرەنسیسەکانی ملکەچی تەواوی پاپاویەت دەکرد.

پاش مردنی ئیمپراتۆر هنری چوارەم پاپا دووبارە کەوتە دەستوەردانە هەڵبژاردنی پاشاکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز، بەڵام جارێکی دی ململانێی نێوان هەردوولا لەسەردەمی ئیمپراتۆر فریدریکی دووەمدا (١٢١٢ز-١٢٥٠ز) نوێ بوویەوەو پەیوەندی لەگەڵ پاپا گریگۆری نۆیەمدا (١٢٢٧ز-١٢٤١ز) دارماو ململانێی نێوانیشیان بۆماوەی (١٥) ساڵ بەردەوام بوو، فریدیکی دووەمیش هێرشی بردە سەر میلان‌و ڕۆماو پاپا ناچار بەجەنگ بوو و بڕیاری بێبەشکردنی لەڕووی ئیمپراتۆردا دەرکرد.

پاپا ئەنوسنتی چوارەمی جێگرەوەشی درێژەیدا بەململانێی لەگەڵ ئیمپراتۆرداو بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو ئەو کوڕە پاپەویەی لەلیۆن لەساڵی ١٢٤٥ز. دا بەسترا، فریدریکی سەرکۆنە کردو بەوە تاوانباری کرد کە ملهوڕو لادەرەو پێویست ناکات کەس ملکەچی بێت، پاپەویەت جەنگێکی خاچپەرستی دژ بەئیمپراتۆر ڕاگەیاندو لەساڵی ١٢٤٨ز. دا لەنزیك پارما ئیمپراتۆر شکستیخواردو دوو ساڵ دوای ئەوەش مرد.

دوای مردنی ئیمپراتۆر فریدریکی دووەم ئەڵمانیا دووچاری چەند ململانێیەکی ناوخۆیی بوویەوەو ئیمپراتۆرێکی واش لەماوەی بیست ساڵ دواتردا نەهات، پاپەویەتیش هەموو ئەمانەی لەبەرژەوەندی خۆیدا قۆستەوەو هەژموونی خۆی بەسەر ئیتالیادا سەپاند، بەڵام پاپەویەت لەسەدەی دواترو لەگەڵ گواستنەوەی پێگەی خۆی بۆشاری ئەفنیۆنی فەرەنسی شانوشکۆی خۆی

لەدەستدا، چونکە لەوێ پاپاکان ملکەچی پاشاکانی فەرەنسا بوون، بارەکەشی دوای دابەشبوونی نێو ریزەکانی لەساڵی ١٣٧٨ز. دا بەهۆی هەڵبژاردنی دوو پاپا لەیەك کاتدا باری دارما، پاپایەکیان ئیتالی و ئەوی دیکەش فەرەنسی بوو، لەئەنجامی ئەمەشدا پاپەویەت شانوشکۆی خۆی لەنێو خەڵکدا لەدەستداو کۆری کۆنستانت توانی بەهەڵبژاردنی مارتنی پێنجەم (١٤١٧ز-١٤٣١ز) یەکبوونی پاپەوی خۆی بگێرێتەوە.

بەڵام پاپەویەت لەسەدەی پانزەیەمدا بەرەورووی لێشاویکی بزووتنەوە ئایینیە چاکسازییەکان و ژمارەیەك قەوارەی سیاسی نەتەوەیی بوویەوە کە بوونە بەربەستێك لەبەردەم دەستوەردانی لەکاروباری وڵاتانی ئەورووپادا، بەڵکو کۆرە کڵێساییەکانیش هەوڵیاندا سنوور بۆ دەسترۆیی پاپەوی دابنێن و پاپاکان ملکەچی قەڵەمرەوی خۆیان بکەن ئەو هۆکارانەو چەندێکی دی ڕێخۆشکەربوون بۆبەرپابوونی بزوتنەوەی چاکسازی ئایینی لەئەورووپا.

*********************

## *کڵێسا:

ڕۆما لەمێژووی کڵێسادا هەر لەسەدەی دووەمی زایینییەوە پێگەیەکی تایبەتی داگیرکردووەو توانیوویەتی پێگەی ڕێبەری بگرێتە دەست بەوەی پایەی سەرۆکی ئوسقوفەکانی ڕۆما میراتی پێگەی قدیس بوترسە، چەند هۆکارێك بەشداربوون لەکەڵەکەبوونی ئاراستەکانی کڵێساو دانانی تایبەتمەندییەکانیدا دیارترینییان بریتین لە:

١- ئەو لاوازییە سیاسییەی کە لەماوەی سەدەی چوارەمی زایینی لەنێوەندەکانی ئیمپراتۆریەتدا کەڵەکەبوو، لەکاتێکدا کڵێسای بێزەنتی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ملکەچی پاشاکان و خواستەکانیان بوو.

٢- ئەو فەرهەنگە ژیارییە ئەمرەی کە ڕۆما بۆی بەجێهێشتبوو و پلەوپایەی دیاری ڕۆشنبیریشی، تا ئەوەی لەمژدەبەری ئایینی مەسیحی لەبەرەکانی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتدا ڕۆڵی دیاری هەبوو.

سەدەی چوارەمی زایینی دەستکەوتی وەرگێڕانی تەواوی (ئینجیل)ی لەسەر دەستی قەشە (جیرۆم) لەڕۆما بەخۆیەوە دی‌و بوو بەپەیامی گرنگی ناساندنی ئایینی مەسیحییەت لەچوارچێوەیەکی فراواندا، ئەمە وێڕای ئەو چالاکییانەی کۆمەڵێك لەپیاوانی دیاری ئایینی خستیانە گەڕ وەك قدیس (ئەمبرۆز) (٣٤٠ز-٣٩٨ز) کە پایەی سەرۆکی قەشەکانی میلانی لەساڵی ٣٧٤ز. بەدەستهێناو توانی بەرگری لەپایەی کڵێساو گرنگی ڕۆڵی کاراو دڵنیای بکات، یان قدیس ئۆگەستین (٣٥٤ز-٤٣٠ز) کە گرنگییەکەی لە(ئەمبرۆز)ی مامۆستای کەمتر نەبوو، ئەو چەندین هەڵوێستی دیاری بەرامبەر بەخاوەن بیروباوەڕە جیاجیاکان هەیە، ڕوخانی ڕۆما لەساڵی ٤١٠ز. لەسەر دەستی قووتە ڕۆژئاواییەکان کاریگەری ڕوونی لەسەر ئۆگەستین هەبوو تا کتێبی (شاری خودا) لەماوەی نێوان (٤١٣ز-٤٢٦ز)دا بنوسێت‌و تیایدا بەرگری ئایینی مەسیحییەکان بکات بەرامبەر بەتۆمەتەکانی بتپەرستان لەبەرامبەریدا بەو پێیەی ئەو بەرپرس بێت لەڕووخانی ڕۆما.

بەهۆی ئەو ڕێنماییە نەوازشیانەی کە بانگەوازی بۆدەکرد، ئاماژە بەوە دەدات کە مەسیحییەت چەمك و مەبەستی پاراستنی یەکبوونی کۆمەلگەو دەسەلاتی بەها چاکەکان و بوونی بەختەوەری تیایدا لەخۆگرتووە، ئەم مەبەستەش ناکرێت ڕەخنەی لێبگیرێت یان دەستکاری بکرێت. لەکاتێکدا لۆمەو تۆمەت پێویستە دژ بەئاینی بتپەرستی ئاراستەبکرێت کە قوڕبەسەری و لاوازی خستە جەستەی ئیمپراتۆریەتەوە.

کتێبەکەی ئۆگەستین تەنها بەرگری لەمەسیحییەت نەکرد، بەڵکو چەندین لایەنی نەزەری لەسەر چەمکی مێژوو و بزوتنەوەکەی بەپێی ئاینی مەسیحییەت نیشانداوەو جەختی لەوە دەکردەوە کە دسەلات دەبێت مەسیحی بێت، چونکە بڕوابوونە بەخوای تەنها لەپێناو وەستانی لەپاڵ چاکەدا لەململانێی بەردەوامی دژ بەخراپەدا.

پاپا لیۆی یەکەم (٤٤٠ز-٤٦١ز) ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەبەرزڕاگرتنی پلەوپایەی قدیسی ڕۆژئاواییدا لەبەر ئەو هەڵوێستە دلێرانەی لەبەرەو ڕووبوونەوەی چەندین کێشەدا گرتیەبەر، کە گرنگترینییان ئەو ڕۆڵە دیارەیە کە لەدانوستانەکانی لەگەڵ (ئەتیلا) بینی و ڕازیکرد تا لەشاری ڕۆما پاشەکشە بکات. هەروەك بەشێوەیەکی دیار بەشداریکرد لەکەمکردنەوەی زیانی داگیرکاری وەندالەکان بۆ ڕۆما لەساڵی ٤٥٥ز. دا.

پاپا گلاسیۆسی یەکەمیش (٤٩٢ز-٤٩٦ز) لەوانەی پێشتری گرنگی کەمتری نییە، چونکە بیردۆزەی (دوو شمشێرەکە) هەیە کە تیایدا ئاماژە بەوە دەدات دەسەلاّن بۆ دووبەش دابەشبووە (گیانی و دونیایی)، دەسەلاتی گیانیش لەپێشترو گرنگترە، چونکە دەسەلاتدارانی دنیایی ملکەچی دەسەلاتدارانی گیانین، چونکە گیانییەکان لەبەر پەیوەندییان بەخواوە زیاتر دەمێننەوە. لەسایەی ئەو وێرانییەی لەسەر دەستی قووتە ڕۆژئاواییەکان و هەڵمەتە یەك لەدوای یەکەکانی هۆزە لۆمباردیەکان و بلاوبوونەوەی دەردو نەخۆشییەکان تووشی شاری ڕۆما بوو، ڕۆڵی

پاپا گریگۆری یەکەم (٥٩٠ز-٦٠٤ز) دەرکەوت و توانی بەرگری رۆما بکات لەرووی لۆمباردییەکاندا دوای ئەوەی لەساڵی ٥٩٣ز. دا پەیماننامەیەکی لەگەڵیاندا ئیمزاکرد، دوای ئەوەی دەسەڵاتە سیاسییەکان هەر رۆڵێکی کارای ناو رۆمایان لەدەستدا، کاریشی کرد بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی کاپولیکی لەنێوان قووتە رۆژئاواییەکان و لۆمباردییەکان و ئینگلیزو سەکسۆنەکاندا.

کڵێسا لەسەرەتای کاریەوە کەوتە دنیا نەویستی و ساکاری و کاری بەو چەمکانە دەکرد کە ئایینی مەسیحی جەختی لێدەکردەوە، کڵێسا رێکخستنە سەختەکان و یەکە گەورەکانی نەدەزانی، جا کڵێسا لەسەرەتایەوە تەنها ئوسقوف و قسیس و شوماسی هەبوو، بەڵام بڵاوبوونەوەی فراوانی مەسیحییەت و کەڵەکەبوونی ئەو سامانەی پیشکەشی دەکرا بۆ یارمەتیدانی هەژران، وێڕای ئەو زەوییە فراوانانەی لەلایەن پاشاکانەوە وەك دیاری لەپێناو بەدەستهێنانی بەرەکەت و سەرکەوتن بەرازیکردنی پیاوانی ئایینی پێشکەشی کڵێسا دەکرا، کاری مانەوەی سیستمی کۆنی قورس کردو باری نوێ گرنگی دەرکەوتنی چینێکی نوێی کارمەندانی سەپاند بۆکارگێڕی ئەو ماڵومولکانەو رێکخستن و دابەشکردنیان و کارکردن تیایاندا.

بەهۆی کاریگەربوون بەرێکخستنە زاڵە کارگێڕییە رۆمانیەکان کڵێسا چەندین چوارچێوەی سیستمی بیرۆکراتی لەکاردا وەرگرت تائەوەی پایەیەکی نوێی ئایینی کەوتە بەرچاوی خەڵك کە بریتیبوون لە (بەتریك) و پێنج بەتریك لەبەتریکە سەرەکییەکانی جیهانی ئیسلامی دانران کە بریتیبوون لە (رۆما، قوستەنتینیە، ئەنتاکیە، بەیتولمەقدیس، ئەسکەدەرییە) ئەوانیش بۆچەند ویلایەتێك دابەش دەبوون و سەرۆکی ئوسقوفەکانیش کاروبارەکەی بەرێوەدەبرد، ئەمەش دابەشبوونیکی تری لێدەکەوتەوە کە ئوسقوف بەرێوەی دەبرد، ئەویش دابەش دەبوو بۆ (ئەبرەشیان) کە قسێك بەرێوەی دەبرد.

ژیانی پیاوانی ئایینی فرەجۆری بەخۆیەوە دی و دەستەیەکیان رووبانکردە پەیرەوی ژیانی ئاسایی خۆیان لەروانگەی بەشداریکردن لەژیانی گشتی یان چالاکی سیاسیدا، هەندێکی دیش جەختیان لەسەر پەرستشەکان و کاروباری

ئایینی دەکردەوە تا گەیشتنە ئاستی کەنارگیری ڕەهبانییەت و دوورەپەرێزی لەهاوسەرگیری، هەوڵی سەرەکی ئەمانە جەختکردنەوەبوو لەموژدەبەری ئایینی مەسیح لەبەرە جیاجیاکاندا، بەلاّم گەشەسەندنی دواتری قورسییەکان لەو فرەجۆرییەدا بەخۆوەدی، چونکە کۆڕو کۆنگرە ئاینییەکان مەرجیان دانا تا پیاوانی ئایینی نەریتە یەکلاکەرەوەکان بگرنەبەر تائەوەی لەسەدەی سیانزەی زایینییەوە پیاوانی ئایینی بەتەواوەتی لەهاوسەرگیری بەدووربوون.

ئوسقوفەکان لەدامەزراندنی کڵێسا ئاینییەکاندا ڕۆڵێکی کارایان بینی و سودیان لەسروشتی پەیوەندییان بەفەرمانڕەوایانی بەشەکانەوە وەردەگرت تایارمەتی دارایی بۆبنیادنانیان وەربگرن، بۆیە ڕۆڵی گرنگی سەرپەرشتی و کارگێڕییان گرتە دەست، تەنانەت لەدەستبەسەراگرتنی ئەو سەرچاوە داهاتییانەی کە دەڕژانە ناو خەزێنەکانی کڵێساوە. قسەکانیش بەپشکێکی دیاریکراوی دەستکەوتەکانی کڵێسا ڕازیبوون، بەلاّم جەختکردنەوەی یەکەکان لەبەشە جیاجیاکانی ئەوروپا گرنگییەکی زیاتری بە (قس)ەکان بەخشی و ئیدی ڕۆڵی پەیوەندی نێوەندییان لەنێوان گەورە پیاوانی ئایینی و خەڵکی کارکەری هەرێمەکاندا دەبینی تائەوەی چەندین مەرجی قورس و یەکلاکەرەوە بۆدانانی (قس) دانران لەوانە مەرجی زانست و تەمەن، بەلاّم جێی باسە ئەم کارە نەبوویە هۆی ئەوەی چەند قسێکی نەزان و گەندەڵ دەرنەکەون.

جیاوازی و ناکۆکی مەزهەبی تائاستێکی دوور ڕۆڵی هەبوو لەقوڵکردنەوەی ئاستی جیاوازی و دابەشبوونەکانی نێوان بەتریکە مەسیحییەکانداو بزوتنەوەیەکی دژ بەپەرستشی وێنە پیرۆزەکان (ئایقۆنەکان) لەقوستەنتنییە بلاّوبوویەوەو ماوەی نێوان ٧٢٦ز تا ٨٤٣ز. گرتەوە، چەند هۆکارێکی ئایینی و سیاسیش لە دەرکەوتنی ئەو بزوتنەوەدا بەشدار بوون، چونکە ئەو تەنگوچەڵەمەو ململانێ سەختانەی تووشی خەڵك ببوون، کاریگەری قوڵیان هەبوو لەئاراستەکردن بەرەو ڕاڤەی ئایینی بۆئەو دیاردانە، ئەگەرچی ئەوانە تەنها تورەیی خوا بۆبەندەکانی نیشان دەدەن، چونکە بەندەکان لەڕێگەی ڕاست و ڕەوا لایانداوە، بەوە خەڵکی

بەدوای بەرەکەتی جێدەستی قدیسەکان و خۆڵی دەوری گۆڕەکان و وێنەکانیاندا دەگەڕان و داوای شیفا و سەرکەوتن و بردنەوەو ڕەزامەندییان لەوێنەکانی مەسیح و مەریەمی عەزرا دەکرد.

قوستەنتینییە بەرەنگاربوونەوەی نێوان دوو قەڵەمڕەوی بەخۆیەوە دی، یەکەمییان گەشتنی ئەو پاشا بنەڕەتییانەبوو کە دەگەڕانەوە بۆئاسیای بچووک و ئەرمینیا کە بەهۆی کاریگەری کەش و هەوای ئەوێوە دژی هەر دیاردەیەکی ڕازاندنەوە یان چوون بەرەو پیرۆزدانانی وێنەی قدیسەکان بوو، ئەوانە یارمەتی و پاڵپشتی سوپایان هەبوو بەو پێیەی یەك یەك بنەڕەتییان هەبوو. دووەمیش لەگەڵ پیرۆزکردنی وێنەی قدیسەکاندا بوون و پێیان وابوو کاریگەری ڕۆحی ئەوە دەگاتە پلەیەکی بەرزو گرنگی لای هەموو ئەو کەسانەی خوێندەوارییان نییە، ململانێکە ئەوکات توندتر بوویەوە کە پاپا قوستەنتینی یەکەم لەڕۆما وەرگرتنی وێنەی فلیبکوسی ئیمپراتۆری بێزەتنی بەرپەرچدایەوەو ئامادەنەبوو لەسەر دراوی ڕۆمانی هەڵکۆڵدرێت و ناوی ئیمپراتۆر لەنوێژەکانی ناو کڵێسادا لابرا.

مەزهەبی کاثولیکی لەڕۆما لەساڵانی ١٠٥٤ز. هوەو لەماوەی پاپا لیۆی نۆیەمدا (١٠٤٩ز–١٠٥٥ز) دەرکەوت، دەسەڵاتی کڵێسای ناو ڕۆماش لەڕوانگەی میراتگری قدیس بوترسەوە بوو کە بەنزیکترین هاودەمی سەیدی مەسیح دادەنرێت، لێرەوە پاپا بووبە خاوەن قەڵەمڕەوی ئایینی و سیاسی بەسەر هەموو پاشاو گەورەکانی ئەورووپای ڕۆژئاواییەوە کە لەمەشدا ماڵ و سامان و زەوی بەرفراوان پاڵپشتی بوو تائەوەی دەکرێت بڵێین لەو ماوەو سەردەمەدا گەورەترین دەرەبەگی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست بوو و ململانێی نێوان دەسەڵاتی ئایینی و سیاسی لەبەهێزترین شێوەکانی خۆیدا کەوتە سەرروو بەپاشاکانیشەوە هەمووانی وەك چەند ژێردەستە یان هاوڵاتییەکی مەسیحی سەیر دەکرد کە لەکڵێساوە بەرەکەت و چاکەو ڕەزامەندی و وەربگرن، بەمە تەنها چەند شوێنکەوتەیەکی ملکەچن، لەکاتێکدا پاشاکان بەهەموو توانایەکیانەوە هەوڵیاندەدا دەسەڵات و سەربەخۆیی خۆیان بچەسپێنن.

کۆبوونــەوەی ســامانی زۆر لای پاپــا، کاریگــەری ڕوونـــی خـــۆی هـــەبوو لـــەزیادبوونی قەڵـــەمڕەوو دەســـەڵاتیدا تائـــەوەی پێگـــەی پاپـــەوی لەشـــکۆدا زۆر لەکۆشکی پاپاکانی ئـەوروپا گـەورەتربوو، ئەمـە وێـڕای ژمـارەی بـەرفراوانی ئـەو کارمەندانـەی لەخزمـەتی پاپـاداو جێبـەجێکردنی بڕیـارو فرمانەکانیـدا بـوون، ئەگەریش پاشاکان ڕۆماو مێژووی گەورەی ڕۆمایان بۆمایەوە، ئەوا کڵێسا گەورەیی ژیاری ڕۆمانیو پەیڕەوی دەزگای کارگێڕی وردو یەکلاکەرەوەی بۆمایەوە.

دیمەنـەکانی خراپـەو گەنـدەڵیو لاوازی لـەبونیادی گشـتی کـارگێڕی کڵێسـادا بەرەبەرە لەسەرەتاکانی سەدەی یانزەهەمدا دەردەکـەوتنو چـەندین دەسـتێوەردانی زۆر وردی وردەکـاری کڵێسـاو پایـەی پاپـایش دەرکـەوتن تائـەوەی بوویـە جێـی ململانێـی نێـوان خـاوەن قەڵـەمڕەوان تائاسـتێك دەکـڕدراو دەفرۆشـرا، لەکاتێکـدا دیاردەکانی خۆشگوزەرانیو گەنـدەڵیو پاڵدانـەوەی کـارگێڕی لـەو سیفەتانە بـوون کە لەگەڵ چالاکییەکانی کارگێڕی کڵێسادا بوون. کڵێسا لەو دەردەسەریەی ڕزگـاری نەبوو تائەوەی پاپا لیۆی نۆیەم هاتو بڕێك لەشانو شکۆو لەسـەرخۆیی پێشـویی کڵێسای گێڕایـەوە، پاپـا گریگـۆری حەوتـەمیش سـووربوو لەسـەر سـەربەخۆیی قەڵـەمڕەوی کڵێساو بەتـەواوەتی دژ بەهـەر دەسـتوەردانێکی کاروبـاری بـوو لەلایـەن دامەزراوەی سیاسییەوە، ئەمە وێڕای هەوڵی فراوانکردنی قەڵەمڕەوی بەسەر خاکی ئیتالیادا.

لەململانێی نێوان کڵێساو ئیمپراتۆریەتدا پەیوەنـدی پێکهـاتوویی نێـوان پاپـا گریگـۆری حەوتـەمو هنـری چـوارەمی ئیمپراتـۆری ئـەڵمانیا دەردەکـەوێت کـە پاپـا لەساڵی ١٠٧٥ز. دا بڕیارێکی دەرکرد کە بەو پێیە دەبوو ئیمپراتۆر دەستوەرنەداتە دانانی پیاوانی ئایینی یان کاروباری هەرێمەکانـەوە تائـەوەی ئیمپراتـۆریش پـەنای بردە بەر کۆمەڵێك لـەپیاوانی لـەکۆڕی (ورمـز) لەسـاڵی ١٠٧٦ز. تابڕیارێـك دەربکـەن بەو پێیە پاپا لەپایەکەی لاببەن. بەرامبەر بـەوە پاپـا بڕیـاری بێبەشـکردنی کڵێسـای لەڕووی ئیمپراتۆرو دەرکردنی لەئەندامێتی مەسیحییەتدا دەرکـرد، بەمـە ئیمپراتـۆر

خۆی چوو بۆ رۆما بۆلای پاپاو پۆزشی بۆهێنایەوە تا لێی خۆش بێت. مێژوونووسان بەو رووداوە دەڵێن (کابوسا) کە ئاماژەیە بەسەرکەوتنی کڵێسا بەسەر دەسەڵاتەکانی ئیمپراتۆردا.

دواتر کڵێسا توانی قەڵەمڕەوی خۆی بەسەر واقیعی سیاسیدا بڵاوبکاتەوە. ئەمەش لەرێی کەسایەتی پاپا ئوربانی دووەمەوە (١٠٨٨ز-١٠٩٩ز) کە بانگەوازی دەکرد بۆئەنجامدانی هەڵمەتی خاچپەرستی بۆسەر رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەمەش لەکۆنگرەی کلێرمۆنتی ساڵی ١٠٩٥ز. دابوو، پاپا لەهەڕەشەی پاشاکانی ئەورووپا لەبێبەشکردنی مەسیحی دەستینەگرتەوەو هەڕەشەی کرد لەفلیپی یەکەمی پاشای فەرەنساو ولیەمی دووەمی پاشای ئینگلتەرا، ئەمە وێرای پەیوەندی خراپی لەگەڵ هنری چوارەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا.

بەپێی هەوڵەکانی دەرچوون لەدەسەڵاتداری کڵێسا، ئیمپراتۆر فریدریك باربروسا، هەوڵیدا دەستبگریت بەسەر ئیتالیادا، بەڵام پاپا ئەسکەندەری سێیەم (١١٥٩ز-١٨٨١ز) توانی لەساڵی ١١٧٦ز. دا بەسەر ئیمپراتۆردا زاڵبێت، پاپا ئەنوسنتی سێیەمیش (١١٩٨ز-١٢١٦ز) هەموو پاشاکانی بەشوێنکەوتەی خۆی داناو هیچی دی، بەڵام ئەو بارودۆخە لەبەرژەوەندی کڵێسادا نەمایەوەو فلیپی وەسیمی پاشای فەرەنسا (١٢٨٥ز-١٣١٤ز) توانی سەرکەوتن بەسەر پاپا یونیگاسی هەشتەم (١٢٩٤ز-١٣٠٣ز)دا بەدەستبهێنن، بەمە قۆناغێك دەستپێکرد کە پاپا بۆ دەرەوەی رۆما دوورخرایەوە، ئەمە لەماوەی نێوان ساڵانی ١٣٠٥ز. تا ١٣٧٨ز. دا بوو، هاووڵاتیانی مەسیحی لەوەوە تێگەشتن کە کڵێسا هێندەی بووە بەدامەزراوەیەکی سیاسی و مەبەستی قۆرخکردنی قەڵەمڕەو ماڵ و سامان و دەسەڵاتە، هێندە خاوەن دەسەڵاتی رۆحی نییە.

********************

# دەرکەوتنی دێر

ئەو سەردەمەی کە قەڵەمڕەوەی مەسیحی بەرەبەرە لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا زیادی دەکرد، سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی ئایینی بەخۆیەوە دی کە لەسەرەتادا لەکڵێسا جیابوو، بەڵام هێندەی نەبرد کە بوو بەبەشێکی بنەڕەتی سیستمی کڵێسایی، لەڕاستیدا دەکرێت بڵێین ڕیشەی ژیانی دنیا نەویستی و کەنارگیری لەبنەڕەتە یەکەمینەکانی مەسیحییەتدا هەبووە، جا کتێبی (العهد الجديد) ئاماژەی هاندانی خەڵکە بۆ کەنارگرتن بۆ پەرستش بەپێی توانایان، ئەمە وێڕای وتەکانی قدیس پۆلس لەسەر هاندانی خەڵك بۆ هاوسەرگرتن کە بەپایەیەکی گرنگی پایەکانی ژیانی دنیانەویستی و ڕوهبانییەتی دەزانی.

ئەگەر پێشتر باسی چەند دڵسۆزێکمان کردبێت کە لەژیان دوورکەوتینەوە بۆ ژیانی ئایینی لەسەرەتاکانی سەردەمی مەسیحییەتدا، بەڵام دەکرێت بڵێین ئەوە ڕەنگێکی ژیانی ئایینی بوو کە لەپێش سەدەی شەشەم لەڕۆژهەڵاتی مەسیحیدا شتێکی باو بووە، لەمەوە تێدەگەین ژیانی دێری لەبنەڕەتدا ڕۆژهەڵاتی بووە، بەڵکو بەهێزترین کارگێڕی ڕۆژهەڵات بووە بۆ سەر مەسیحییەت.

ژیانی دێرەکان پشت دەبەستێت بەژیانی کانارگیری و تێڕامان و سەرەتاکانیشی لەسەدەی سێیەمی زایینی لەمیسر دەرکەوتن. سەرهەڵدانیشی بەچەند دەستپێشخەرییەکی تاکەکەسی چەند پیاوێکی ئایینی بوو وەك جۆرە ناڕەزاییەك لەچەند هاوڕێیەکیان کە دەستیان وەردەدایە کاروباری دنیایی و سیاسی، بەوجۆرە ئەشکەوتەکان و لوتکەی شاخەکان چەندین کەنارگیری لەخۆدەگرت کە خۆیان بۆ پەرستشی خوا یەکلاکردبوویەوە، ئەو هۆکارانە تاکە هۆکاری ئەو ڕێبازە نەبوون، بەڵکوو هەندێکیان لەدەست چەند کێشەو ڕاوەدوونانێك پەنایان بردە بەر شاخەکان و هەندێکی دیکەش بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و ناودەرکردن بەکەسی چاك و پاك ئەو کارەیان دەکرد.

ئەم بیرۆکەیە لەسەر دوانەگیری جەستەو گیان وەستاوەو بەیەکگرتنی ئەو پەیوەندییە باوەڕدار لەپێناو گەشتن بەپلەی پاکبوونەوەی گیانی دەستبەرداری پێویستییەکانی جەستەیی دەبێت، بۆ ئەمەش پشت دەبەستن بەچەند وتەیەکی قدیس بوترس کە جەخت دەکاتەوە لەسەر گرنگی وەلانانی ئارەزووەکان و رۆچوونە ناو کاروبارە هەستییەکان، بەڵکوو باوەڕداری چاك بەپێی وتەکانی قدیس بوترس دەبێت بەهەموو پێکهاتەکانیەوە بەرەو پەرستشی خوا بچێت، هەندێ لەروهبانەکان کۆمەڵێك لەدنیا نەویستانیان کۆدەکردەوە تا لەپەرستاگاکانیاندا کارو پەرستش بکەن بەو واتایەی خۆدابڕین بۆ خوای گەورە بەبێ کاری بەسوود نابێت، لەوانە ئەنتۆنی و باخومیوس بوون، لەکاتێکدا باسیل کاری دەکرد بۆ ڕێکخستنی کاروباری دێرەکان، ئەو ئاماژە دەدات بەگرنگی بەشداریکردن لەپەرستش و کاری خۆبەخشی بەکۆمەڵدا.

لەسەدەی چوارەمی زاینییدا بیرۆکەی دێرەکان بەهەوڵی ئەپناسیۆس برایە ناو ئیتالیا، بەڵام لەماوەی سەدەی شەشەمی زاینییدا لەسەر دەستی قدیس بندکت ئینجا بڵاوبوویەوە، ئەم کەسە کەوتە ڕێکخستنی کاروبارەکانی و دەرهێنانی لەچوارچێوەی کەنارگیرییەوە بۆ بواری کارکردن و بەشداریکردن و هەستکردن بەکێشەکانی کەسانی دی، خاڵی هەنگاونانیشی لەو دێرە ئەژمار دەکرد کە خۆی لە (مۆنت کاسینۆ) لەساڵی ٥٢٩ز. دایمەزراند تا بوو بەنموونەیەکی سەرمەشق. وێڕای ئەو ژیانە ساکارو دنیا نەویستییەی بزووتنەی دێری لەسەری دامەزرابوو، بەڵام بەرەو گەیشتنە گەندەڵی و لێکهەڵوەشانی بنیادە گشتییەکانی دەچوو، بەتایبەت ئەو بارودۆخە هەموو ئەورووپای گرتبوویەوە، بەتایبەت دوای کۆتایی هاتن بەئیمپراتۆریەتی شارلەمان، بەوجۆرە بزووتنەوەی چاکسازی لەسەر دەستی چەند پیاوانێکی ئایینی دەستپێکرد کە دیارترینیان بزووتنەوەی کلۆنی کە (ولیام تەقی) لەشاری کلۆنی لەساڵی ٩١٠ز. دایمەزراند.

ئەو بنەڕەتانەی لەسەری دامەزرابوو بریتیبوو لەیەکخستنی پەیوەندی لەگەڵ کڵێساو زیادەی کاتی پەرستش لەگەڵ ڕێگری تەواوی هەر پەیوەندییەك کە دەبوو لەگەڵ بەرە عەلمانییەکاندا بێت، پاشان دێڕەکان سەر بەبزووتنەوەکی بڵاوبوونەوەو هەندێجار ژمارەیان دەگەشتە دووسەد دێڕ. جێی ئاماژەیە کلۆنییەت بەرەهایی بۆ چاکسازی دێڕو دامەزراوە پەیوەستەکانی بەس نەبوو، بەڵکو لەسەدەی یانزەهەمدا بەرەو ئەوە دەچوو کاربکات لەپێناو چاکسازی باری خودی کڵێسادا.

ئەو ماوەی بوژانەوەی کە بزووتنەوەی کلۆنی پیایدا تێپەڕبوو زۆر درێژەی نەکێشاو خێرا بوو بەقوربانی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و ڕۆچوونی پیاوانی گەورەی لەناو خۆشییەکانی ژیان و کۆکردنەوەی پارەو سامانداو، دوای ئەوەی بزووتنەوەیەکی نوێ سەریهەڵدا کە جۆرە چاکسازییەکی تێدابوو، ئەویش بزووتنەوی کامالدۆلی بوو لەساڵی ١٠٧٢ز. دا کە کڵێسا دانی پێدانا، ئەمەش ئەندامانی بزووتنەوەی کلۆنی کەنارخست و دەرفەتی کۆبوونەوەی پێنەدان مەگەر لەکاتەکانی نوێژدا نەبێت، لەپاڵ ئەمەشدا بزووتنەوەی کارمیتر زیانیە لەساڵی ١٠٨٤ز. دا دەرکەوت کە جەختی دەکردەوە لەسەر دنیانەویستی بەشێوەیەکی وردو یەکلاکەرەوە.

سەدەی داونزەهەمی زایینی دەرکەتنی بزووتنەوەیەکی سترسیانی بەخۆیەوە دی، لەسەروو هەمووشیانەوە قدیس برنارد (١١٠١ز–١١٥٣ز) کە هەوڵیدەدا گرنگی کارکردنی روهبانەکان لەکارە کشتوکاڵییەکاندا بخاتەڕوو لەپێناو دابینکردنی خۆراکی پێویست بۆیان، تا ئەوەی چەند دێڕێك تایبەتمەندی بەرهەمهێنانی چەند دەستکەوتێکی کشتوکاڵییان هەبوو، بەڵام ئەو بزووتنەوەیە بەرەو ڕووی گەندەڵی بوویەوە وەك چۆن دووچاری بزووتنەوەکانی تریش ببوویەوە.

بزووتنەوەی دێڕی بەردەوام چەندین بزووتنەوەو ڕێکخراوی نیشاندەدا کە دیارترینییان لەماوەی سەدەی سیانزەهەمدا بزووتنەوەی فرنسکانی بوو کە کڵێسا لەساڵی ١٢٢٣ز. دا دانی پێداناو لەچەندین دەوڵەتی ئەورووپی وەك ئیسپانیاو بەریتانیاو هەنگاریادا بەشێوەیەکی فراوان بڵاوبوویەوە، یان بزووتنەوەی دۆمەنیکانی کە لەسەر بنەڕەتی موژدەبەری مەسیحی دوور لەبیری هەرتەقە کاری

دەکردو پشتی دەبەست بەشێوەکاری ئامۆژکاری‌و جەختکردنەوە لەوەی هەژاری گیانەکان پاك دەکاتەوە، لەساڵی ١٢١٢ز. دا یەکەم دێری کرایەوە.
ئەوەی ئەو دوو بزووتنەوەیە لەیەکتر جیادەکاتەوە ئەو هەوڵە ڕوونەیە کە لەپێناو بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت لەنێو هۆزی مەغۆلییەکانی ئاسیادا خرایە گەڕ، وێڕای کاریگەری ئەو ڕۆشنبیرییە باڵایەی کە لەسەرهەڵدانی زانکۆ زانستییەکانی نێو ئەورووپا وەریگرتبوو.

*******************

# (باسی چوارەم)

# (بەربەرەکانو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی)

# شانشینە جەرمانییەکان

پێشتر ئەوەمان ڕوونکردەوە کە چۆن لەکۆتاییەکانی سەدەی سێیەمو سەرەتاکانی سەدەی چوارەمەوە دیاردەکان ئەوەیان پێدەوتین کە ڕووی مێژووی کۆن بەرەو ڕووی گۆڕانێکی زۆر بووەتەوە، چونکە داننانی ڕەسمی قوستەنتین بەئایینی مەسیحییەتدا بەهەنگاوێکی وادادەنرێت کە دیدە خراپەکانی دواتری خۆی هەبێت، بەڵکو ئەو ڕووداوەیە کە گرنگی زیاتری لەمێژووی ئەورووپاو لەماوەی نێوان دەرکەوتنی ڕۆماو بەدیهێنانی سەرکردایەتییەکەی لەلایەكو نێوان دەرکەوتنی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی لەلایەکی دیکەوە داڕنیوە.

هێندە بەسە بڵێین ئەو دانپێدانانەو بڵاوبوونەوەی ئاشتیانەو خێرای مەسیحییەت بەڵگەی ئەوەیە پاڵپشتو بنەمایەکی گەورەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بەرەو ئەوە دەچێت لەبەردەم بیروباوەڕێکی نوێو ڕاوبۆچوونێکی نوێدا دابڕمێت کە ئامانجی هەموویان ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤو نێوان فەرمانڕەوایانو هاووڵاتییانو نێوان خەڵکان خۆیانە لەسەر چەند بنەمایەکی تەواو جیاواز لەوانەی جیهانی کۆن.

گواستنەوەی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش لەڕۆماوە بۆ قوستەنتینییە کاریگەرییەکەی لەگۆڕینی ڕوخساری جیهانی کۆندا لەوی پێشوو کەمتر نییە، چونکە هاوسەردەمانی ئەو ماوە مێژووییە- وەك نوسینە مێژووییەکان دەخەینەڕوو-هەست بەوە دەکەن کە ڕابردوو بەرەو داڕمان چووە، تا لەشێوەیەکی نوێدا بچنە ناو ئەو جیهانە نوێیەی تەنگی پێهەڵچنیونو دیاردەکانی لەو دیاردانەی پێشتر جیاوازن کە خەڵك لەسەریان ڕاهاتووە، خەڵکی لەدەوری ئەو دیاردانە کۆبوونەوە تا ببینن ڕۆمانی لانکەی پاشا گەورەکانو شاری ئەمرو پێشەوای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو دروشمی ژیارو شارستانییەت ببێتە هێمایەکی بەربەریەتو

دواکەوتەیی لەکتوپڕێکدا بەرەو ڕووی دواکەوتن بێتەوە دوای ئەوەی پاشاکان بەجێیانهێشت، لەکاتێکدا پاشاکان لەکەناراوەکانی بسفۆر شارێکی نوێیان بنیادنا (قوستەنتینییە) تا وەك ئەوەی بنیاتنەرەکانی دەیانویست ببێتە شاری ڕۆمانی نویٚ کە بەتەنها شیاوی ئەوەبێت گەورەیی و شکۆی ڕۆمای کۆن بەمیرات بگرێت. ئەو مۆرکە میراتگرییەی کە حکومەتەکەی ئیمپراتۆر قوستەنتینی ڕۆمانی هەیبوو پەیوەندی هەیە بەو ڕووداوانەوە بەجۆرێك لەو سەردەمە نوێیەدا ئیمپراتۆریەت پشتی بەمافی میراتگری دەبەست.

وێڕای پاڵپشتی خواو پیاوانی کڵێسا، بەوجۆرە ئەو قۆناغە سەرهەڵدانی هزرێکی بنەڕەتی بەخۆیەوە دی کە بەردەوام ژیاری یۆنانی ڕۆمانی کە هاووڵاتی گەڕابوو جیادەکردەوەو پاش قوستەنتین هاووڵاتییانی چەوساوەی دوو پێگەی ئازادی جیهانی یۆنانی و ڕۆمانی دەرفەتیان بۆکرایەوەو بیرۆکەی هاووڵاتیبوون هات بەو واتایەی هەموو ئەندامانی ئیمپراتۆریەت لەشوێنکەتەییان بۆ ئیمپراتۆریەت یەکسانن، ئەو دیاردانەو چەندین ڕەوت و ڕووداوی دی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی سێیەم و سەرەتاکانی سەدەم چوارەم لەسەر شانۆی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەرکەوتن، زۆربەی مێژوونووسانیان والێکردووە تا پێیان وابێت ئەورورپا لەو ماوەیدا بەقۆناغی گواستنەوەیەکی گەورەدا پێپەڕبووە کە لەسەردەمە کۆنەکانەوە هاتووەتە سەدەکانی ناوەڕاست، پێدەچێت ئەو گەشەسەندن و گۆڕانانە مێژوونوسێکی وەك (بیوری) یان هاندابێت تا پێی وابێت دەسەڵاتی قوستەنتینی گەورە خودی سەرەتای سەردەمێکی نوێیە هەروەك بۆ دەسەڵاتداری ئۆگەستینی گەورەی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتەکەش وایە. دیارە سەدەکانی ناوەڕاست ژیارو قەوارەی خۆیان لەسێ بنەڕەتی سەرەکییەوە وەرگرتووە:

- فەرهەنگی کلاسیکی بەشێوەیەکی گشتی و ڕۆمانی بەشێوەیەکی تایبەت.
- مەسیحییەت و کڵێساکەی.

- جەرمانەکان.

جەرمانەکان بەشێك بوون لەو جیهانە بەربەریە فراوانەی لەزۆربەی لاکانییەوە چواردەوری ئیمپراتۆریەتی رۆمانییان دابوو و کاریان کردە سەر گۆڕینی ڕێڕەوو داهاتووی ئەو ئیمپراتۆریەتە، کاتێك لەنیوەی سەدەی دووەمەوە کەوتنە هێرشبردنە سەر ئەو ئیمپراتۆریەتە، لەڕاستیدا دەکرا ئیمپراتۆریەتی رۆما لەرۆژئاوا زیاتر تەمەنی بکردایەو لەسەرخۆ بمردایە، وێڕای ئەو لێکهەڵوەشانە ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسییەی دووچاری ببوو، ئەگەر بهاتبا و هێرشی بەربەرەکان نەبوایە کە ئیمپراتۆریەتی رۆمانییان بەرەو مەرگە دڵنیاکەی پێشخست.

جێی ئاماژەیە وشەی (بەربەری) بەو واتایەی ئەمڕۆ بەکاری دێنین هاوواتای (دڕندەیی) ناگەیەنێت، بەڵکو مەبەستی پێی قۆناغێکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی هۆزانییە کە دواتر بەرەو قۆناغی سەقامگیر شانشینیو بنیادنانی دەوڵەتی سنوردارو چەسپاو نەچوبێت، جا کۆمەڵگەی بەربەری زیاتر لەپشت بەستنی بەپەیوەندی هاوولاتیبوونی نێوان ئەندامانی پشت بەپەیوەندی خوێن دەبەستێت، وێڕای ئەوەش ناکرێت بڵێین ئەو گەلە بەربەرییانەی چواردەوری دەوڵەتی رۆمانییان دابوو بەشێوەیەکی خراپو سلبی ژیاونو پێویستییان بەبنەڕەتگەلێکی ژیاری هەبووە، چونکە ئەو گەلانە لەڕاستیدا چەند نەریتێکی ژیانی تایبەت بەخۆیان هەبووە.

ئەو گەلە بەربەرییانەش زۆر جیاوازبوون، جا لەباشووردا بەربەر لەرۆژئاوای ئەفریقیا بوون. لەرۆژهەلات چەند گەلێکی فارسیو لەباکوورو باکووری رۆژهەلاتیدا کیتیەکانو سارماسییەکانو هۆنو بولگارو ئاڤارو مەجەری مەغۆلو تورکەکان هەبوون، لەرۆژئاواشدا سلاڤو جەرمانو کلت هەبوون.

گەلە شوانکارە ئاسیاییەکان لەسەرەتادا زۆر لەسنوری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دووربوونو لەنێو دەشتەکانی ئاسیادا دەژیانو پشتیان بەئاژەڵو ولاخ دەبەستو لەشوێنێکەوە بۆ لەوەڕگایەکی دی بەپێی بارودۆخی بارانو کەشو هەوا شوێن گۆڕکێیان دەکرد.

سەختی ئەو بارودۆخە چەند گەلێکی ئاسیایی ناچارکرد تا چەند شالاوێکی بەهێزو وێرانکەری تالانو بڕی ئەنجام بدەن، ئەورووپاش کەوتە بەر ئەو هەڵمەتانە، چونکە دەشتەکانی باکووری دەریای قەزوین دەرگایان لەبەردەم گەلە شوانکارە ئاسیاییەکان (بەتایبەت هۆزە هۆنەکان) کردەوەو توانییان لەوێوە دزە بکەنە ناو ئەورووپاو دواجار کەشێکی ترسو تۆقاندن لەنێو گەلانی سەر سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا کەوتەوە.

یەکەمین قوربانییەکانی ئەو ڕەگەزە ئاسیاییانەش سلاڤەکان بوون کە لەو ناوچەی ئەمڕۆ بەناوەڕاستی روسیا ناسراوە نیشتەجێبوون، ئەو سلاڤانە لەسەرەتاکانی سەدەی ناوەڕاستدا بەهۆی فشاری ڕەگەزە ئاسیاییەکانی دی لەسەریان لەباشووری ڕۆژئاواو فشاری ڕەگەزە جەرمانییەکا لەباکوورەوە دووچاری چەندین سەختیو ناڕەحەتی بوونو زۆرێکیان تووشی کۆیلایەتی بوون تائەوەی وشەی (کۆیلە) لەزۆربەی زمانە ئەوروپییەکاندا لەناوی سلاڤ پێکدەهات. لەگەڵ ئەوەشدا سلاڤەکان تاویان دایە کشتوکاڵکردنو بەرەبەرە لەبەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا بڵاوبوونەوە تا کردیان بەبەرەیەکی سلاڤی.

کلتەکانیش (کە ڕۆمانییەکان پێیان دەوتن غانیەکان) لەسەرەتادا دارستانەکانی باکووری ئەوروپا تا شاخەکانی ئەلب لەرۆژهەڵاتیان گرتبوو، پاشان دوای ئەوە بزووتنەوەیەکی فراوانخوازی گەورەیان ئەنجامداو تیایدا هەڕەشەی لەناوبردنیان لەکۆماری تازەپێگەشتووی ڕۆما کردو بەشاخەکانی ئەلبدا چوونە ناو ئیتالیاو لەڕووباری ڕاینەوە چوون ناو ئەو خاکەی دواتر پێی دەوترا (گالیا) هەروەك هەڵمەتیان بردە سەر دوورگە بەریتانییەکان، بەمە کلتەکان لەپێنج سەدی پێش زایندا ناوچەیەکی فراوانیان لەدەستدابوو کە لەنێوەندی ئەڵمانیا تا بەلقانو زەریای ئەتڵەسی دەچوو.

لەوکاتەی قەیسەر هێرشی بردە سەر گالیا، جەرمەنەکان کلتەکانیان لەبەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕاین دەرکردو تاکە شتێك ڕێی لەجەرمەنەکان دەگرت تا هێرش بەرنە سەر گالیا گرتنی گالیا بوو لەلایەن ڕۆمانەکانەوە، پاشان ڕۆمانەکان

لەسەدەی یەکەمی زاینیدا بەریتانیایان گرت، بەمە کلتەکان تەنها ئیرلەندایان بۆمایەوە تا تیایدا سەقامگیربن و بمێننەوە.

ئەو ئاستە بەرزە ژیارییەی رۆمانەکان پێی گەشتبوون، کاریگەری روونی خۆی هەبوو لەسەر سروشتی روانین بۆ گەلانی دی، بەتایبەت گەلە دراوسێکانیان کە بەدڕندەیی و لاوازی و دواکەوتەیی وەسفیان دەکردن، پێدەچێت سیفەتی هەرە زاڵی ئەوکات لەناونانی بەربەرەکاندا کە بەسەر گەلانی دەرەوەی سنووری ئیمپراتۆریەت دەوترا ئەوەبێت، بەڵام سروشتی پێکدادانی راستەوخۆو بەرەو رووی یەکتربوونەوەکانی نێوان رۆمان و جەرمەنەکان وایکرد بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەستی جەرمەنەکان بێت، جا ئەگەر ئەمە بەئیعتیبار وەربگرین ئەو ئەدەبیاتە مێژوویەی لەرۆمانەوە ماوەتەوە جەختی لەسەر ئەو ئاراستەیە کردووەتەوە.

چەندین مێژوونووس کۆمەڵێك تێروانینییان لەسەر نشینگەی بنەرەتی جەرمەنەکان هێناوە، ئاماژەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە لەکەناراوەکانی دەریای بەلتیقەوە بەرەو ناوچەی گەمارۆدراوی نێوان رووباری ئەلب و رووباری راین لەباشوورەوە کشاون، لەکاتێکدا دەستەیەکی تریان پێیان وایە ئیسکەندەناڤیاو دانیمارك نشینگەی سەرەتایانە، مێژوونووسانێکی دی جەخت لەو دەکەنەوە کە ئەوانە بەبنەڕەت ئاریەکانی کیشوەری ئاسیان، گومانێکی دی هەیە کە دانیشتوانی کەناراوەکانی دەریای قەزوین بن و بەرەو حەزی رووباری ئەودرو حەوزی رووباری ئەلب کشابن.

ئەو ناوچەی جەرمەنەکانی تێدا سەقامگیر بوو جێی خواستەکانیان نەبوو، بەتایبەت سەرما ژیانی سەخت کردبوون، خواستی ئەوەشیان هەبوو لەڕووبارەوە بپەڕنەوە بۆ دەوڵەتی رۆمانی و ئەو خواستەش نەدەکرا هەڵبوەشێنرێتەوە یان چاوی لەسەر لابەرن، چونکە لەوێ دەرفەتی کارو ماڵ و سامان و ژیانی خۆشگوزەرانی هەیە، بەڵام هێزە رۆمانییەکان رێیان بەپەڕینەوەیان نەدا، ئەمە وای لەهۆزە جەرمەنییەکان کرد بەرەو چەند ناوچەیەکی دی بچن و بەدوای ناوچەی بەپیت و دەوڵەمەندو ئاووهەوای مامناوەندا بگەڕێن.

لەنێوەندی ئەو گەڕانەدا لەنێوخۆیاندا پێکیاندادەدا، بەڵام دواجار هەندێکیان توانییان لای ڕووباری ڕاین کە سەرسنووری ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووسەقامگیربن، چەند هۆزێکی دیکەشیان لای ڕووباری دانوب سەقامگیربوون. جا بۆ نموونە هۆزەکانی وەندالە جەرمانییەکان لەبەرەی ڕووباری دانوب و هۆزە قووتەکانیش لەکەناراوی دەریای ڕەش و ئینگلیزو سەکسۆنەکانیش لەباکووری ڕووباری ڕاین سەقامگیربوون.

ماوەی سەقامگیری هۆزە جەرمانییەکان هێندەی نەخایاند کە خێرا بوونە فشارێك لەسەر سنووری ڕۆمانی، بەڵکو بەرەو ڕۆژئاوا چوونیان زیاتر بوو. ئیدی لێشاوی هۆزە جەرمانییکان هەڵمەتی دەبردە سەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا دوای ئەوەی گەرووی نێوان شاخەکانی ئۆرال و دەریای قەزوینییان تێپەڕاند بەهۆی ئەو فشارە توندەی بەرەو ڕووی بوونەوە لەئەنجامی کشانی هۆزە هۆنە وێرانەکەرەکان هۆزە قووتەکان و وەندالەکانیش بەهەموو توانایەکیانەوە بەرەوە سنووری ڕۆمانی کشان. وێڕای ئەو یەك ڕەگەزو بنەڕەتییەی هۆزە جەرمانییەکانی کۆدەکردەوە، بەڵام لەڕاستیدا لەنێوخۆیاندا گیرۆدەی دەست دووبەرەکی و ململانێ بوون، تائەوەی بنەڕەتی ناونانی جەرمان هێندەی ناولێنانێکی گالیەکانە بۆیان و بەواتای دراوسێ دێت، زادەی زمانی ناوچەیی خۆیان نییە، ڕۆمانەکانیش ناوەکەیان لەگالەکانەوە وەرگرت و بەکاریانهێنا.

ساکاری و سادەی ژیانی هۆزی جەرمەنەکانی گرتبوویەوەو دیمەنە ئاڵۆزە ژیارییەکانیان نەدەزانی، بەڵکو ژیانی سەرەتایی خەسڵەتی زاڵی ناو کۆمەڵگاکانیان بوو. جا لەسەر ئاستی دیاردەی تاکەکەسی ڕیش و قژەکانیان بەردەدایەوەو پێستی ئەو ئاژەڵانەیان دەپۆشی کە جەستەیانی لەسەرما دەپاراست، لەکاتێکدا خۆراکیان لەسەر ڕاوی ئاژەڵان و چەند بەرهەمێکی کشتوکاڵی بوو کە لەچوارچێوەیەکی زۆر سنورداردا بەرهەم دەهات. لەئەنجامی ناسەقامگیریشدا بۆ بنیادنانی بیناکانیان پشتیان دەبەست بەئەو شمەکانەی بەردەست کە لەبەرگ و گەڵای دارەکان تێنەدەپەڕی و دیوارەکانیشیان لەقووڕ دروست دەکرد.

بەوپێیەی ژیانی خێڵەکی و گواستنەوە پیشەیان بوو بۆیە جەرمانەکان پشتیان بەئابووری گۆڕینەوە بوو بەتایبەت لەئەسپ و ئاژەڵدا، ئەمەش لەژێر سایەی ژیانێکی سەختدا بوو کە وای لەتاکی جەرمانی دەکرد بەهێزی و توندی بوێت، دەستکەوتیش بەشێك لەو گیانەی پێکدەهێنا کە جەنگاوەری جەرمانی هاندەدا، لەکاتێکدا ڕێکخستنەکان لەسەر پەیوەندی ڕەگەزو خزمایەتی وەستابوو، خێزان بنەڕەت و پەیوەندی هەرە گرنگی پێکهێنانی دوڵەتە، پاشان پشت بەخێڵ دەبەسترا.

ئەو بارودۆخە نائاساییەی کە جەرمەنەکانی تێدا دەژیا وایلێکردن ژیانی سەرکێشی و تاودانە ناو مەترسییەکان بەپیرۆز ڕابگرن، کەسی جەنگاوەریش لەناو کۆمەڵگەدا پایەی باڵاو گرنگی هەبوو. لەپێناو بەدەستهێنانی داننان بەپیاوەتی تەواویشدا تاکی جەرمانی دەبوو کۆمەڵە تاقیکردنەوەیەکی سەخت ئەنجام بدات تا بچێتە باری دەرچوونەوە، کۆمەڵگەی جەرمانیش بۆ سێ چین دابەش ببوو، خانەدانەکان، ئازادیخوازەکان، کۆیلەکان، خانەدانەکان لەسەرەوەی هەرەمی کۆمەڵایەتیدا بوون و پشکی گەورەی ناو جەنگەکان لەسەر شانی ئەمانە بوو، بەڵام لەکاتی ئاشتیدا هەموو پێناوێکی خۆشی و تەمبەڵی و ڕابواردنیان هەبوو.

سەرەتا خێزان یەکەی سیستمی جەرمانی پێکدەهێنا و باوك دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر ژن و منداڵەکانیدا هەبوو تائەوەی مافی هەبوو لەژیان بێبەشیان بکات، لەچەند خێزانێکی هاوخوێنیش خێڵ پێکدەهات، پاشان دواجار لەچەند کۆمەڵە خێڵێك دەوڵەت پێکدەهات، تەنها کەسە ئازادەکان و خانەدانەکان مافی خاوەن زەوی بوونییان هەبوو، لەکاتێکدا هەموو ئەندامانی خێزان بەشێوەیەکی هاوبەش لەتاوانی ئەندامێکی خێزانەکەدا بەشداربوون، لەکاتی کوشتنیشدا دەبوو کەسوکاری کوژراوەکە تۆڵەی بسێیننەوە مەگەر ئەوەی بکوژەکە پارەیەکی جێی ڕەزامەندی لەجیاتیدا بدات بەکەسوکاری کوژراوەکە.

جەرمانەکان بەپێی بنیادی کۆمەڵایەتی بۆ سێ چین دابەشببوون. (خانەدانەکان، ئازادەکان، کۆیلەکان). خانەدانەکان چینی جەنگاوەر بوونو شێوە ڕێزێکی تایبەتییان هەبوو و ئەندامانی کاری کشتوکاڵیان نەدەکردو لەکاتی ئاشتیدا سەرقاڵی خواردنو خەوتنو ڕاوچێتیو ڕابواردن بوون، لەکاتێکدا ئەرکی کۆمەڵگە دەکەوتە سەر ناجەنگاوەرانی دیکەی ژنو منداڵو کۆیلەکان. کۆیلەکانیش ڕۆڵی گرنگی خزمەتی ناوماڵیان نەبوو (وەك کۆیلەی ڕۆمانی)، بەڵکو تەنها سەرقاڵی کشتوکاڵ بوونو چەند پارچە زەوییەکیان بەسەردا دابەش دەبێتو لەکۆتایی وەرزەکەدا پشکێکی کەمیان پێدەدرا، ئازادەکانیش باری ژیانیان زۆر لەکۆیلەکان باشتر نەبوو.

لێرەدا پێویستە تێبینی دوو خاڵ بکەین، یەکەم ئەوەیە ئازادی موڵکداری دوو شتی پەیوەست بەیەك بوون کە لەکۆمەڵگەی ڕۆمانیدا هاودەم بوون، دووەمیش ئەوەیە کە خانەدانەکان پەیوەست بوو بەشەرەفمەندی کەسی لەدایکبوو میراتگریەوە نەوەك بەپێی موڵکداری زەوی. جەرمەنەکان لەسەردەمەکانی یەکەمیاندا ژیانی شارەکانیان نەدەزانی، بەڵکو لەچەند گوندێکی پەرشو بلاوی نێو دارستانەکاندا دەژیان، لەکاتێکدا خانووەکانیان لەچەند کوخێکی لەقوڕو گەلا دروستکراو پێکدەهات.

جەرمانەکان لەسەر ئەوە ڕاهاتبوون جلی سادەی پێستی ئاژەڵان لەبەر بکەنو مووی سەرو ڕیشیان بەربدەنەوە، هەندێجار پیاوەکان بەشێوەی پەلکە قژەکانیان شۆڕ دەکردەوە، خۆراکیشیان زۆر سادە بوو و لەشیرو میوەو گۆشتی ڕاوو دانەوێڵە پێکدەهات، جەرمانەکان لە نۆشکردنەوەدا تەنها ئاوجۆیان دەزانی.

هەر گوندێك ئەنجوومەن یان کۆمەڵیەکی هەبوو کە لەپیاوانی ئازادی گوند پێکدەهات، لەکاتێکدا گوندەکان لەیەکتر دوورو کەنارگیر نەبوون، بەڵکو پەیوەندی بەردەوام لەڕێگەی ڕووبارەکان یان ڕێڕەوەکانی نێو دارستاندا لەنێوانیاندا هەبوو، ئاستی سامانداریش لای جەرمانەکان زۆربەی جار لەئاستی بوونی ئەسپو ئاژەڵو

ژمارە زۆرییان دەوەستا، ویڕای ژمارەی ئاژەڵە ماڵییە بەسودەکان، ئەوەش جێی سەرسوڕمانە جەرمانەکان بەباشی شارەزی دراوە ڕۆمانییەکان بوون، هەروەك قاپ و قاچاخی زێڕو زیویان دەناسییەوە، بەلاّم هەرگیز بیران نەدەکردەوە لەوەی لەمامەڵەی بازرگانیدا ئاژەڵەکانیان بەدراوی ڕۆمانی بگۆڕەنەوە کە لەسەر شێوەی ئاڵوگۆڕی شمەك بەشمەك وەستابوو.

ڕێکخستنی سیاسی جەرمەنەکان زۆر سادەبوو لەگوندێکی مارك پێکدەهات، مارك بچوکترین یەکەی سیاسی جەرمەنەکان بوو، پاشان سەدی دەهات کە یەکەیەکی سیاسی گەورەتر لەگوند بوو، دواتر هەرێم یان بەڕێوەبەرایەتی دەهات و لەچەند سەدییەکی چەند گوندێك پێکدەهات، لەهەموو ئەمانەشەوە ئەو دەوڵەتە هۆزایەتییە پێکدەهات کە دواتر بەناوی شانشینی ئۆرایخ ناودەبرا کاتێك سیستمی پاشایەتی لەنێو جەرمانەکاندا پێشکەوت.

دەوڵەتی جەرمەنی کۆمەڵەیەکی گشتی هەبوو کە هەموو ئەندامە جەنگاوەرەکانی دەگرتەوەو تەنها لەکاتی جەنگ یان کۆچکردندا دەبەسترا. هەروەك چەند کۆمەڵەیەك یان ئەنجومەنێکی هەرێمەکان و سەدیەکانی لەسەر پێوانی بچوکتر هەبوو لەخانەدان و ئازادەکان پێکدەهات، بەلاّم لەکاتی ئاشتیدا بۆ لێدوان لەمەڕ باس و خواسە مەدەنییە گشتییەکان کۆدەبوونەوە.

لەسەروو هەر گەلێکی جەرمەنیدا سەرکردە هەبوون کە پاشا یان خانەدان نەبوون، بەڵکو تەنها سەرکردەی هەڵبژێردراو بوون و گەلەکانیان لەبەر بوونی سیفەتی ڕێبەری و لەهەموویان گرنگتر سیفەتی دلێری هەڵیاندەبژاردن، لەکاتی جەنگیشدا سەرکردەیەکی ناسراو بەدلێری و پێشرەوی سەرکردایەتی دەگرتە دەست، ئەو کەسە دەسەلاّتگەلێکی تایبەتی فراوانی هەبوو کە بەکۆتاییهاتن بەجەنگ کۆتایی پێدەهات، ئەگەریش جەنگەکان درێژخایەن یان یان شێوە بەردەوام بوونایە، ئەوا ئەو سەرکردەیە دووبارە هەڵدەبژێردرایەوە.

پاشان بارەکە گەشەی سەندو لەدوای مردنی کوڕەکەی هەڵدەبژێردرا، ئەمە بەرەبەرە بووبەهۆی بەرپابوونی سیستمێکی پاشایەتی میراتگری نێودەوڵەتان و کۆمەڵە جەرمەنییەکان. پاشا جەرمانییەکانیش لەو سەرەتایانەدا تەنها سەرکردەی سەربازی بوون و بەس، بەبێ ئەوەی دەسەڵاتێکی ڕەهای یاسادانان یان سەپاندنی سزایان هەبێت، ئەوەش ئەو باس و خواسەیە کە نەریتی زاڵی نێوان جەرمانەکان و بەمیراتگیراو دیاری دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ تاکێك یان سەرکردەیەك مافی گۆڕینی ئەو بارەی هەبێت.

ئەگەر هەندێ لەمێژوونووسان حەزدەکەن کۆمەڵگە یەکەمینە جەرمانییەکان بەوە وەسف بکەن کە دیموکراتی بوون، ئەوا پێویست ناکات وا لێی تێبگەین سیستمی دیموکراتییان لەدەسەلاتدا گرتوەتەبەر، چونکە کۆمەڵگەی جەرمانی لەسەر بنەڕەتی جیاکاری کۆمەڵایەتی نێوان چینە جیاجیاکانی نەوەستابوو، بەڵکو مەبەست لەوە بوونی چەند بنەمایەکی وایە کە بەڵگەی ئاراستەیەکی دیموکراتییە لەنێو کۆمەڵگەی جەرمانیدا وەك هەڵبژاردنی سەرکردەکان و جیاکاری باس و خواسەکان لەچەند دادگایەکی گشتی وا کە نیمچە سەربەخۆییەکیان لەدەسەڵاتی فەرمانڕەوا هەبوو.

بەخستنەڕووی ئەو بارەی جەرمەنەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەوانە لەڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا ساکارو سادە بوون و ئەوەش وای لێنەکردوون بیر لەهەر دژایەتی یان چاوچنۆکییەك بەرامبەر بەدەوڵەتی دراوسێیان (ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی) بکەنەوە، بەڵکو ڕۆمانەکان بەرامبەر ئەو قەوارە ساکارەی لەپاڵیاندا دەژیا هیچ چاوچنۆکییەکیان نەبوو، تەنها شتێك هەردوولا دەیانویست ژیانی ئارام و سەقامگیری وڵاتی خۆیان بوو، بۆیە ئەو تێڕوانینە ڕاست نییە کە دەڵێت ڕۆما هەر لەسەرەتاوە لەدەست ترسی مەترسی جەرمانی دەژیاو جەرمانەکان لەسەرەتای کاریانەوە چاویان لەشاڵاو بردنەسەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و لەناوبردنی بووە، بەڵکو بەڵگە هەیە کە ئەوە دەسەلمێنێت ساڵانی نێوان

دەسەلاتی نێوان قەیسەرو مارکۆس ئورلیوس (٥٠پ. ز-١٨٠ن) بەشێوەیەکی گشتی بارێکی ئاشتی بەخۆیەوە دیوەو پەیوەندی نێوان رۆمان و جەرمەن ئاشتیخوازانە بووە، هەروەك هۆزە جەرمانە سەنگەرنشینەکانی سەرسنووری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەوماوەدا لەبارێکی رِوونی ئارامش و سەقامگیریدا ژیاون.

ئەو بارەش لەکۆتاییەکانی سەدەی دووەمەوە بەرەو گۆڕان چوو کاتێك کۆمەڵگەی جەرمانی بەرەو ڕووی جۆرە فشارو ڕاڕاییەك بوویەوەو جۆرە جوڵەیەکی پێدا، چونکە سلاڤەکان و ڕەگەزە رۆژهەڵاتییەکانی دیکەش لەبەرەی رۆژهەڵاتەوە فشاریان لەسەر جەرمانەکان دادەنا، لەکاتێکدا ژمارەی جەرمانەکان ڕوو لەزیادبوو و ڕێگەی ژیانیان سەخت و تەنگەبەر بوو، لێرەوە جەرمانەکان چاویان بەچواردەری خۆیاندا گێڕاو هیچ زەوییەکی دەوڵەمەنیان نەدۆزییەوە، بەڵکو تەنها زەوییەکی هەژراو وشکی وابوو کە دارستانەکان دایانپۆشیبوو، وێڕای دواکەوتەییان و کەوتنە ژێر ڕەحمەتی سروشت و بارە قورسەکەی کە لافاوی مەترسیداری هەبوو، هاودەم بەنەبوونی و قات و قڕی و برسێتی کە بارێکی سەختی نەبوونی پێویستی ڕۆژانەی وەك خواردن و خواردنەوەی تووش کردن، ئەمە پاڵنەر بوو تا بکەونە بزاوت، بەوجۆرە جەرمەنەکان بەرەو خاکی ئیمپراتۆریەتی جەرمانی دەچوون، سیستمی سەقامگیرو سامان و دارایی زۆرو ژیاری ڕازاوەی ئەو ئیمپراتۆریەتە جەرمەنەکانی بەرەو لای خۆی ئاراستەکرد.

هەڵوێستی خراپی جەرمانەکان لەڕووی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا لەسەردەمی ئیمپراتۆر مارکۆس ئورلیوسەوە (١٦١ز-١٨٠ن) گۆڕا، کاتێك چەند دەستەیەکی جەرمانی هاوپەیمانییان لەگەڵدا بەست وەك مارگونی و قەوازی تا هێرش ببەنە سەر بەرەی بەرزاییەکانی دانوب لای دانونیا.

وێڕای ئەوەی تەنگەژەکە بەلەناوبردنی مەترسی ئەو هێرشبەرانەو تێکشکاندنی هێزەکەیان کۆتایی پێهات، بەڵام هەڕەشەی جەرمانەکان بۆ سەر سنووری ئیمپراتۆریەت لەوە بەدوا نەوەستاو هێندەی نەبرد لەسەدەی سێیەمی

زایـــینی و لەســـەردەمی ئیمپراتـــۆر کاراکـــالا (٢١١ز–٢١٧ز) مەترســـییان بـــۆ ئیمپراتۆریـەت دروسـتکرد کاتێـك قووتـەکان لەباشـوور لەکـەناراوەکانی دەریـای بەلتییـەوە پێشڕەوییان کـردو سارماشـییەکانیان دامـاڵین و هێرشـیان بـردە سـەر هەرێمی داشیا لەسەر دانوب و پەنجا ساڵ لەبەلقان کاولی و کوشت و بڕیان ئەنجامدا تائەوەی ئیمپراتـۆر کلۆدیوسـی دووەم (٢٦٨ز–٢٧٠ز) لەنیسۆس لەساڵی ٢٦٩ز. تێکیشکاندن.

لەڕاسـتیدا ئـەوەی زیـاتر لێـرەدا مەبەسـتمانە لەهـەموو ئـەو ماوانـەی ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی و قووتەکانـدا پاشـان ڕۆمانـەکان لەگـەڵ زاڵبـوون و بـەهێزی زیاتریان بەسەر قووتەکانـدا پێیان باشبوو لەگەڵ قووتەکانـدا ئاشتەوایی ببەستن، بۆیە دەستبەرداری هەرێمی داشیا بوون بۆیان و سوپای ڕۆمانی و کارمەندان لەسەر بـەڵێنی ئیمپراتـۆر ئورلیـان لـەوێ پاشەکـشەیان کـرد، لـەوێ قووتـەکان وەسـتان و دەسـتبەرداری تـالان و بـڕی بـوون و کەوتنـە بـەر کاریگـەری مەسـیحییەت و ڕەوتـە ژیارییـەکانی دی نـاو ئیمپراتۆریـەت، ئەمـە ڕێخۆشـکەر بـوو تـا یەکـەم شانـشینی جەرمانی لەناو سنووری ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا دابمەزرێت.

جێـی ئاماژەیـە ئـەو مەترسـییەی لـەو ماوەیـەدا ڕووی لەدەوڵـەتی ڕۆمـانی کردبوو، تەنها شالاوی قووتەکان نەبوو، بەڵکو ئەڵمان و فرەنج و باڤاری و سەکسۆن و ئورنجی و فریزییەکانیش چەندین هەڵمەتی جیاجیایان بردە سەر تا رۆڵی یەکەمی بزووتنەوەی کۆچبەری جەرمانی لەساڵی ٣٠٠ز. کۆتـایی پێهات و ماوەیـەکی نـوێی پەیوەندی ئاشتی و ئارامی نێوان رۆمان و جەرمان دەستپێکرد.

لـەو مـاوە نـوێی ئاشـتیەدا ڕۆچـوونی جەرمەنـەکان بـۆ نـاو سـنووری ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی نەوەسـتا بـەڵام پـاش گـۆڕینی مۆرکـە تونـدە هێرشـبەرییە جەنگییەکـەی بۆ کشانی لەسـەرخۆو ئاشتی و ئارامانـە درێـژەی بەکشانی خۆیداو ئیمپراتۆریەتیش دەرگای بۆ جەرمەنەکان کردەوە تا وەك سەرباز لەچەند یەکەیەکی جەنگیدا بەرکاریان بهێنن بەرامبـەر بـەوەی چەند داگیرگـەو زەوییـەکیان پێبدات تا لەناو سنووری رۆمانیدا تیایدا بژین، تا ئاستێك گـەورە ئەفسەرانی دیاری سوپای ڕۆمانی لەو ماوەیەدا بەڕەچەڵەك جەرمانی بوون.

لەڕستیدا بەکارهێنانی جەرمەنەکان لەسوپای ڕۆمانیداو دەرفەتپێدانیان تا بەشێوەیەکی ئاشتی بژین، کارێکی نوێ نەبوو، بەڵکو پێشتر هەبوو ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی ئیمپراتۆر ئۆگەستس، بەڵام لەسەدەی سێیەم و چوارەمدا دیدێکی گشتگیرو بەرفراوانی لەخۆدەگرت، کاتێک پەیوەندی ڕۆمان لەلایەك و جەرمەنەکانی نێوانیان لەلایەکی دیکەوە گەشتە هاوسەرگیری و کارلێکی کۆمەڵایەتی، ئەمە کاریگەری قووڵی بۆ داهاتووی ڕووداوەکان بەجێهێشت، بەوجۆرە ناکرێت بڵێین سنووری سیاسی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەدەی چوارەمدا جیهانی ڕۆمانی و بەربەری لێکجیادەکاتەوە، چونکە هەرکامیان کەوتبووە بەر کاریگەری ئەوی دی.

بەهاتنی ساڵی ٣٧٥ز. هەڵمەتە جەرمانییەکان بۆ سەر سنووری ڕۆمانی سەرلەنوێ گەڕانەوەو مۆرکێکی نوێیان وەرگرت، جا تائەو کاتەش ئەو هەڵمەتانە چەند چالاکییەکی پچڕ پچڕی جەنگی بوون کە پەیوەندییەکی ڕوون لەنێوانیاندا نەبوو، پلانێکی کۆکەرەوە یەکینەدەخستن، هێندە بەس بوو هۆزێك بەرەو ڕووی فشاری هۆزێکی دی بێتەوە یان ناوچەیەکی جەرمان تووشی قات و قڕی یان کەمی خۆراك بێت، یان سەرکردەیەکی چاوچنۆکیان خاڵێکی لاوازی لەسنووری ڕۆمانیدا بەدی بکردایە تا هێرشێکی لاوەکی بباتە سەر خاکی ئیمپراتۆریەت.

بەڵام هەڵمەتی بەرەبەرەکان لەساڵی ٣٧٥ز.ەوە شێوەی چەند شاڵاوێکی گەورەی وەرگرت و ئەمەش تا ساڵی ٥٦٨ز. بەردەوام بوو، نزیکەی دوو سەدە کە تیایدا زۆرێك لەکۆمەڵە جەرمانییەکان توانییان چەند هەرێمێکی گرنگی ڕۆمانی ببڕن و چەند شتانشینێکی نوێ لەنێو ئەو هەرێمانەدا دابمەزرێنن، ئەمە گۆڕانێکی تەواوی بەسەر جیهانی کۆندا هێناو ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستی ڕوونتر کردەوە.

باشتر وایە پێش ئەوەی هەریەك لەڕەگەزە جەرمانییە جیاجیاکان بهێنین، ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو ڕەگەزانە لەچەند کۆمەڵێکی خاوەن هێزو زیندوێتی

پێکدەهاتن، بۆیە چاویان لەژیاری پەرشوبلاو و لاوازی جیهانی کۆن بوو، لەگەڵ ئەمەشدا گیانێکی نوێو ڕاو بۆچوونو سیستمی نوێ هەبوو، ڕاست نییە بڵێین جەرمانەکان دژ بەژیاری ڕۆمانی بوونو بەرپرسیارن لەوێرانکردنی ئەو ژیارەدا، چونکە ژیاری ڕۆمانی پێش شاڵاوە جەرمانییەکان پەکی کەتبوو بەرەو لێکهەڵوەشان دەچوو، ئەوکات جەرمانەکان لەڕێگەی هەڵمەتی کتوپڕی خێرایان لەڕێگەی کشانی هێمنانە لەسەر خۆ بەرەو ناو ئیمپراۆریەتی ڕۆمانی کشان لەوانەیە ڕاستتر ئەوەبێت قسە لەسەر کاریگەری ڕاستەوخۆی هەڵمەتەکانی جەرمان بۆ سەر جەستەو قەوارەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بکەینو هەمیشە گرنگی ئەو جەرمەنانە لەمێژوو ژیاری رۆژئاوای ئەوروپادا بەیاد بهێنینەوە.

*******************

# قووتە ڕۆژئاواییەکان

بنەڕەتی هۆزە قووتەکان دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی سەر بەرەی دەریای بەلتیق کە لەماوەی سەدەی دووەمی زاینییەوە لەنشینگەی خۆیانەوە بەرەو کەناراوەکانی باکووری رۆژئاوای دەریای ڕەش کشاون، بەڵام بەسەر دوو بەرەدا دابەشبوون و قووتە ڕۆژهەڵاتییەکان بەرەو دەشتەکانی باشووری ڕوسیا کشان و قووتە رۆژئاواییەکانیش بەرەو ناوچەی ترانسلڤانیای بەلقان چوون و لەبەرەکەی تری ڕووباری دانوبدا سەقامگیربوون، ئەمەش بەپێی ئەو پێشنیاری هەڵبژاردنەی کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی داینابوو.

قووتەکان لەسەر نەریتە جەرمانییەکان سووربوون و هەردەم دەستیان پێوەدەگرت تا ئەوانەش کە دەچوونە ناو ئیمپراتۆریەت و وەك سەربازی هەڵگەڕاوە یان کارەکانی تریشیان دەکرد ژمارەیان زۆر کەمبوو.

ڕۆچوونی قووتەکان سەرەتای کۆچی ئەو گەلانە بوو کە چەند شوێنەوارێکی گەورەیان لەکیشوەری ئەوروپیدا بەجێهێشت، بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەدەن قووتەکان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتدا بەئاشتی ژیابن و لەوێ لەباشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا زەوییەکی فراوانیان هەبووبێت، دواتر پێویستیان بەزەوی دیکە کەوتووەو ئەوەش لەگرنگترین هۆکارەکانی کۆچەکانی گەلان بووە، ئەوانە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕۆژهەڵات چەند پەیوەندییەکی چالاکی بازرگانییان بەستبوو و ئایینی مەسیحییەتیشیان لەو ڕێگەوە وەرگرت، بەڵام لەساڵی ٣٧٥ز. دا لێشاوی هۆنەکان لەئاسیاوە هات و ڕۆچوونە نێو ناوچەکانی دون و دەنیرو شکستێکی سەختیان تووشی قووتە ڕۆهەڵاتیەکان کرد، پاش ئەوەی هۆنەکان توانییان قووتە ڕۆژهەڵاتییەکان ملکەچ بکەن، چالاکی جەنگی خۆیان ڕووکردە قووتە ڕۆژئاواییەکان و ئەوانیش داوایانکرد لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕۆژهەڵات تا دەرفەتیان پێبدات لەدانوب بپەڕنەوەو لەنیمچە دوورگەی بەلقان سەقامگیربن.

ئەوانیش داواکەیان وەرگرتن و قووتە ڕۆژئاواییەکانیش لەساڵی ٣٧٦ز.دا لەڕووباری دانوب پەڕینەوەو لەچەند بەشێکی بولگاریای ئەمڕۆدا سەقامگیربوون. ژمارەی ئەوانەش کە لەڕووباری دانوب پەڕینەوە بەپێی سەرچاوە مێژوویەکان نزیکەی یەك ملیۆن کەس بوو، ئەمەش شتێکە ئاساییە، چونکە ئیمپراتۆریەت پێشتر سیاسەتی لەوجۆرەی پەیرەو کردووە.

دەرکەوتن و سەقامگیربوونی قووتە ڕۆژئاواییەکان لەبەلقان چەند کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر داهاتووی ئیمپراتۆریەتەکە دروستکردوو خێرا بەهۆی پەیڕەوکاری کارمەندانیان و باج کۆکەرەوەکان بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەندی قووتە ڕۆژئاواییەکان و ئیمپراتۆریەت تێکچوو لەو ئەنجامەدا قووتەکان بوونە سەرسەختترین دوژمنی ئیمپراتۆریەت و بەرەو باشووری بەلقان کشان و لەساڵی ٣٧٨ز.دا لەنزیك ئەدرنە شکستێکی گەورەیان دووچاری هێزەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کردو لەجەنگەکەشدا خودی ئیمپراتۆر ڤالینت کوژرا، دوای ئەو جەنگە قووتە ڕۆژئاواییەکان لەقوستەنتینییە نزیك دەبوونەوە، بەڵام ئیودۆسی یەکەمی ئیمپراتۆری یەکەم (٣٧٩ز-٣٩٥ز) توانی بەدەستبەرداربوون و هەندێ جاریش بەهێز لەمەترسییان کەمبکاتەوەو چەند زەوییەکی نوێی بەپێی ناوچەگەلێکی جیاجیای بەلقان پێبەخشین.

پاش مردنی ئیمپراتۆر ئیۆدۆسیوس (٣٩٥ز) ئیمپراتۆریەتەکە لەنێوان کوڕەکانیدا دابەشبوو و ئەرکادیۆس (٣٩٥ز-٤٠٨ز) لەڕۆژئاوا فەرمانڕەوایی دەکردو هۆنریوس (٣٩٥ز-٤٢٣ز) لەڕۆژئاوا فەرمانڕەوایی دەکرد. هەروەك براش دژبەیەکتر بوون و بەتەواوەتی سەرقاڵی ئەو دوژمنایەتییە بوون کە بەڕوونی لەپیلاندانانە سیاسییەکانیان دژ بەیەکتر دەردەکەوێت، بۆیە حکوومەتی قوستەنتینییە هەوڵیدەدا هەڵمەتەکانی قووتە ڕۆژئاواییەکان بەرەو بەشی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بێت و لەدژی خەڵکی کۆدەکردەوە. قووتەکانیش فشارێکی گەورەیان لەسەر سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوایی دروستکردبوو و

دواجار ناچاربوو هێزەكانی لەدوورگەی بەرتانیاوە بانگ بكاتەوە تا بەرەو ڕووی فشاری قووتە ڕۆژئاواییەكان ببێتەوە، بەڵام ئەوەش نەبوویە ڕێگرو قووتەكان لەساڵی ٤٠٩ز بەسەركردایەتی ئەریك چوونە ناو خودی ئیتالیاو بۆ ساڵی دواتریش ڕۆمایان گرتو تالآنیان كرد.

جێی باسە ژمارەیەك كۆیلەكان لەكاتی هێرشەكەی ڕۆمادا چوونە نێو سوپاكەی ئەریك، هەروەك جەرمەنەكانی نێو ڕیزەكانی سوپای ئیمپراتۆری زۆربەیان چوونە ناو سوپاكەی ئەریكەوە. چەند ڕۆژێك تالآنو بڕی ڕۆما بەردەوام بوو، لەو ماوەدا ژمارەیەكی زۆری خانەدانە ڕۆمانەكان كوژرانو ژمارەیەكی دیكەشیان بەدیل گیرانو كران بەكۆیلەو ژمارەیەكی زۆری دانیشتوانی شارەكەش بەرەو بەلقانو باكووری ئەفریقیا ڕایانكرد.

ئەریكیش بەئاراستەی دوورگەی سقلیەو دواتر باكووری ئەفریقیا درێژەی بەكشانی خۆی دەدا، بەڵام مردنی خێرا لەهەمان ساڵدا ئەو نەخشەی لەناوبردو قووتە ڕۆژئاواییەكانیش بەڕەزامەندی ئیمپراتۆر هۆنوریوس بەرەو باشووری گالیا چوونو لەوێ لەساڵی ٤١٩ز. لەسەر خاكی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی یەكەم شانشینی بەربەرییان دامەزراندو شاری تۆلۆزی فەرەنسییان كرد بەپایتەختی ئەو دەسەڵاتەیان.

ملكەچی ئەو شانشینە بۆ ئیمپراتۆریەت شێوەیی بوو،چونكە لەڕاستیدا بەتەواوەتی سەربەخۆ بوو، قووتە ڕۆژئاواییەكان ٣/١ی خاكی ئەو شانشینەیان دەست بەسەراگرتو لەنێو خۆیاندا دابەشیانكرد. ئەو شانشینە لەكۆتاییەكانی سەدەی پێنجەمو سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینییدا تا پشت شاخەكانی برانس فراوان بوو و شاری تۆلیدۆی ئیسپانی كردە پایتەختی نوێی شانشینە فراوانبووەكە.

*******************

# وەندالەکان

لەو کاتەوەی قووتە ڕۆژئاواییەکان لەگالیا شانشینی خۆیان دامەزراند، کۆمەڵێکی دیکەی هۆزە بەربەرییەکان ڕۆچوونە نێو نیمچە دوورگەی ئیبریا، ئەو یەکێتییە هۆزایەتییەش هۆزەکانی سویڤی و وەندالەکانی یەکدەخست، ئەوان ڕۆچوونە نێو باشوور لەناوچەی دواتر بەناوی ئەوانەوە ناونرا (ڤاندەلوسیا) (ئەندەلوس)، لێرەوە شالاویان دەبردە سەر باکووری ئەفریقیا و لەساڵی ٤٣٩ز. دا دەستیان گرت بەسەر ئەو ناوچە فراوانەداو شانشینی وەندالیان دامەزراند.

بەوجۆرە دەوڵەتی بەربەری دووەم لەسەر خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دامەزراو شاری قرتاجەی کرد بەپایتەختی خۆی، وەندالەکان دەستیان گرت بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئەوێداو لەگەڵ ئەوەشدا درێژەیاندا بەهەڵمەتەکانییان بۆ سەر ئیتالیاو لەساڵی ٤٥٥ز. دا شاری ڕۆمایان تالانکرد.

ئەو بارە سەخت و خراپەی ڕووبەڕووی وەندالەکان بوویەوە ناچاری کردن تا هەوڵ بدەن دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەو ناوچانەی پێی گەشتوون بسەپێنن دوای ئەوەی خاکی ئەروپایان بەجێهێشت، لەڕاستیدا ئەوان دەیانویست باری لاوازی و بۆشایی سیاسی بقۆزنەوە تا لەهەرێمەکانی باکووری ئەفریقیای ئیمپراتۆریەتدا فراوانخوازی بکەن و توانییان بەتەواوەتی دەستبگرن بەسەر مەغریب و جەزائیردا، بەڵکو هەوڵیاندا بچنە ناو خاکی توونس کە گرنگی زۆری لەخەزێنەی خۆراکییەوە هەبوو بەتایبەت لەدانەوێڵەدا بنەڕەتی بوو بۆ مەڵبەندی ئیمپراتۆریەت، وەندالەکان توانییان بچنە ناو خاکی تونس و لەساڵی ٤٣٩ز. دا دەستیانگرت بەسەر شاری قرتاجەدا، بەرامبەر بەو هێزو چالاکییە سەربازییە توندە ڕۆمانەکان ناچاربوون دان بنێن بەدەسەلاتی وەندالی بەسەر بەرەی ڕۆژئاوایی باکووری ئەفریقیادا، ئەمەش بەئیمزاکردنی پەیماننامەی ساڵی ٤٤٢ز، بەڵکوو پەیوەندییەکە گەیشتە ئەوپەڕ بەوەی سەرۆکی وەندالەکان وەك پاشایەکی سەربەخۆ دابنرێت.

وەندالەکان توانییان هێزێکی سەربازی لێدەری وا دابمەزرێنن کە قسەی بالأی لەهەموو بوارێکدا هەبێت بەتایبەت لەدوو بواری زۆر گرنگدا، جا لەسەر ئاستی هەڵسوکەوتی ناوخۆیی توندیو ڕەقییان هەبوو بەتایبەت لەگەڵ هاوولأتییانی ڕۆماندا، بەڵکو زۆرجار دەست دەگیرا بەسەر ماڵو موڵکیاندا، لەسەر ئاستی ئاینیش گاڵتەیان بەکڵێسای کاپولیکی دەکردو تاویان دابووە چەوساندنەوەو ئازارو فشاردان لەسەر پیاوانی ئایینی.

هەروەك وێڕای ئەوە وەندالەکان چالاکی بەرزی دەریاییان هەبوو کە بەردەوام لەگەشەسەندندا بوو بەشێوەیەك هەڕەشەی بۆ سەر ڕۆمای پایتەخت دروست کردبوو، ئەوان توانییان لەساڵی ٤٥٥ز. دا بچنە ناو ڕۆماو کوشتاری خەڵکەکەی بکەن، هەڵمەتەکەشیان بۆسەر ڕۆما بەو بانگەشەیە بوو کە ئەوان چوون بەدەم بانگەوازی بێوەژنانی ئیمپراتۆر ڤانتنیانی سێیەم دژ بەپلانگێڕان، لەڕاستیدا ئەگەر دەستتێوەردانی پاپا لیۆی یەکەم نەبوایە تا داوا لەجنسریکی سەرکردە بکات، ئەوا پایتەخت بەتەواوەتی وێران دەکرا، ئەگەریش سوارە جەرمانەکان توانییان بەسەر هێزە بزاوت سەختە ڕۆمانەکاندا سەرکەوتن بەدی بێنن، هۆکاری ئەمجارەیان لەسەر کاری دەریایی وەندالەکان بوو، چونکە کەشتییە بچووکە وەندالییەکان دەیانتوانی جموجوڵ لاکردنەوەی خێرایان بەدەوری کەشتییە قورسو هێواشەکانی ڕۆمانیدا هەبێت.

بەمردنی جنسریك لەساڵی ٤٧٧ز. دا، وەندالەکان چوونە نێو تەنگەژەیەکی سەختەوە، بەتایبەت ململانێ لەسەر میراتگری دەسەلأت بەشێوەیەکی ڕوون خۆی بەسەر واقیعی ژیانی سیاسیدا سەپاند، ئەمە وێڕای ئەوەی نایانتوانی لەگەڵ دانیشتوانی سەرەکی ولأتدا کارلێك بکەن، ئەمەش بەهۆی ئەو توندیو هێزەی بەسەر دەسەلأتیاندا چەسپابوو، لەسەر ئاستی چەوساندنەوەی ئایینی بێت یان توندی وەرگرتنی باجەکان بێت. ئەمە وێڕای ئەو باری تەمبەڵییەی لەنێو ڕیزەکانی جەنگاوەراندا کەڵکە ببوو و سەرقاڵی ژیانی خۆشیو گەڕان بەدوای زۆرکردنی ماڵو سامانیان بوون، ئەمە ڕێخۆشکەربوو تا دەوڵەتەکەیان لەساڵی ٤٣٥ز. داو لەسەر دەستی یلزاریۆس سەرکردەی ڕۆمانی بڕوخێت دوای ئەوەی یلزاریۆس فرمانی لەئیمپراتۆر جستنیان وەرگرت، بەوجۆرە باکووری ئەفریقی کەوتەوە ژێر دەسەلأتی ڕۆمانی.

# بەرگەندیەکان

لەحەوزی ڕووباری (رون) لەنیوەی سەدەی پێنجەمی زاینییدا شانشینێکی دیکەی بەربەری دەرکەوت و شاری لیۆنی فەرەنسی کردە پایتەختی خۆی، ئەویش شانشینی بەرگەندیا بوو کە لەنێوان سالانی (٤٣٣ز-٤٥٧ز) دامەزرا، وێڕای بچووکی قەبارەکەی، بەلام پێگەیەکی گرنگی ستراتیژی هەبوو و خاکێکی کشتوکالی دەوڵەمەندی لەباشووری فەرەنسای ئێستادا هەبوو، بەدامەزرانی ئەو شانشینەش پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و باکووری فەرەنسا پچڕاو دەسەڵاتداری ڕۆمانی لەچوارچێوەی سنووری ئیتالیای ئێستادا بەرتەسک بوویەوە، بەرگەندییەکان وەك هۆزە بەربەرییەکانی دیکە دەستیان گرت بەسەر زەوییە کشتوکالییەکاندا، بەلام مۆرکی ڕۆشنبیری ڕۆمانییان وەرگرت و زمانی لاتینی لەنێوانیاندا بلاوبوویەوە.

ئەو شانشینە دواتر ڕۆڵێکی گەورەی لەژیانی سیاسی فەرەنسا و پەیوەندی نێوان فەرەنساو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆزدا بینی، بەتایبەت لەماوەی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمی نوێدا.

ڕەچەڵەکی بەرگەندییەکان دەگەڕێتەوە بۆ نیمچە دوورگەی ئیسکەندەناڤیا، یەکەمین دەرکەوتیشیان لەدۆلی راین لەسەدەی سێیەمی زایینیدایە، پەیوەندییان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕێگەی هەلزنین لەڕێی ڕووبارەوە بۆ کارکردن لەپێناو بەدەستهێنانی دەرفەتی باشتری ژیان دەستیپێکرد، زۆرێکیان کەوتنە کاری بەکرێگیراوی لەسوپای رۆمانیدا، هەروەها بەرگەندییەکان لەبەرەی ڕۆژهەلاتی ئەلمانیاشدا سەقامگیربوون.

بەلام بزاوتی هۆزە قووتە ڕۆژئاواییەکان و وەندالەکان بەرەو بەرەکانی رۆژئاوا بەهۆی پالنانی هۆزە هۆنەکانەوە، وای لەبەرگەنییەکان کرد داوای مۆلەت لەئیمپراتۆر هۆنۆریوس بکەن تا ڕێیان پێبدات بچنە ناو ئیمپراتۆریەتی رۆمانییەوە و لەباشووری گالیا نیشتەجێبوون، بەلام دواتر خواستی فراوانخوازییان

پەیداکردو لەئەنجامدا پێکدادانێکی گەورەو قوورسی نێوان هەردوولا ڕوویدا، بەڵام ئەوە کاری نەکردە سەر سەقامگیربوونیان لەناوچەکەدا.

گۆڕانی هەرە گرنگ لەباری هاریکاری بەرگەندی ڕۆمانی بۆ ڕیگری هۆزەکان تێپەڕی، بەڵکوو یارمەتییەکی گرنگ و ڕوونیان لەجەنگی دەشتەکانی کەتەلۆنیا لەساڵی ٤٥١ز. پێشکەش بەسوپای ڕۆمانی کرد، بەرامبەر بەمە ڕێیان پێدرا تا لەبەرەی باشووری ڕۆژهەڵاتی گالیا نیشتەجێبن، ئەوانیش توانییان فراوانخوازی بکەن و شانشینەکەیان ناوچەی باکووری ئیسپانیاش بگرێتەوە. دەسەڵاتەکەیان زۆر درێژەی نەکێشا تا ئەوەی بەرەو ڕووی چاوچنۆکی فرەنجەکان بوویەوەو شاکلۆفس توانی بیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە لەساڵی ٥٠٧ز. دا ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی کلۆفسەوە.

*********************

# هۆنەکان

لەگەڵ دامەزراندنی دەسەڵاتی قووتە ڕۆژئاواییەکانو وەندالو بەرگەندییەکاندا، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەو کاتەدا لەقۆناغێکی سەختو گرنگو دەردناکدا دەژیا. ئیمپراتۆر ڤالانتاینی سێیەمیش (٤٢٥ز-٤٥٥ز) کەسێکی لاواز بوو، بۆیە دەسەڵاتی حەقیقی لەدەست ئەپنیوسی وەزیردا بوو کە مێژوونووسان پێی دەڵێن (کۆتا ڕۆمانی گەورە). ئەپنیوس هەوڵیدا ئیمپراتۆریەت بپارێزێتو هەموو پێناوێکی بەردەستی بەکاردەهێنا، هاوکات پەنای بردە بەر گرژی یەکتردادانی بەربەرەکان، ئەو مەترسیە گەورەش کە هەڕەشەی لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەکرد-لەنیوەی سەدەی پێنجەمی زایینیدا- هۆنەکان بوون، ئەمانە لەژێر ڕێبەری (ئەتێلا)دا یەکیانگرتو دەستیان گرت بەسەر مەجەردا، لەوێشەوە چەند هەڵمەتێکی درێژخایەنیان بۆ سەر بەلقانو ئاسیای بچووک ئەنجامدا تائەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتی سەرانەی پێدەداو دیاریو خەڵاتی بۆ دەنارد.

لەساڵی ٤٥١ز. دا هێزەکانی هۆنەکان بەڕێبەری ئەتێلا چوونە ناو گالیاو پاش گەمارۆیەکی درێژخایەن دەستیان گرت بەسەر شاری (ئورلیان)دا. لەوێوە ئەپنیوس توانی لەگەڵ بەربەرەکاندا دژ بەئەتێلا هاوپەیمانیەتییەکی پتەو بەهێز ببەستێتێ ئەتێلای ناچارکرد تا لەئورلیان پاشەکشە بکات، دوای ئەو لەنزیك شاری (تروا) جەنگێکی گەورە لەنێوان هەردوولادا ڕوویداو تیایدا سوپاکەی ئەتێلا تێکشکا، لەپاڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا قووتە ڕۆژئاواییەکانو وەندالو فەرەنجەکانیش دژ بەئەتێلا دەجەنگان، قووتە ڕۆژهەڵاتییەکانیش لەگەڵ سرماتیو سلاڤەکاندا هاودەمی هۆنەکان بوون، ئەوەش کۆتا سەرکەوتنی ڕۆمانەکان بوو و نەیانتوانی بەرهەمەکەی بخۆن، چونکە شوێنکەوتەییان بۆ بەربەرە هاوپەیمانەکانیان زیادیکرد.

لەساڵی ٤٥٢ز. دا ئەتێلا هێرشێکی بردە سەر ئیتالیا، بەڵام ڕۆمای نەگرت، بەڵکوو بەو دیاریو خەڵاتانەی بۆی نێردرا ڕازی بوو، ئەتێلا بۆ ساڵی داوتر مردو

خێرا دەسەڵاتەکەی دارماو هۆنەکان لەگەڵ دانیشتوانە ناوچەییەکاندا تێکەڵ بوون و لەسەدەی حەوتەمی زاینییەوە بوونێکی وایان نەما کە جێی باسکردن بێت.

زانایانی ڕەگەزناسی خەریکە لەسەر ئەوە یەکدەنگ بن کە هۆنەکان لەڕەگەزە تورکییە مەغۆلەکانن، بەهۆی بزاوتی خێراو سووکی باری سوارەکانیانەوە توانیویانە زۆر خێرا بگەنە چەندین بەرەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا تائەوەی بەخێرایی گەشتنە شورەی گەورەی چین، بەڵام لەگەڵ هێزەکانی ئیمپۆاتۆری چینی (یوتی)دا پێکیاندا داو یوتی توانی لەساڵی ١٢٨پ. ز. دا بەسەریاندا سەرکەوێت و ئەوانیش بەشوێن پێی خۆیاندا بەرەو ناوچەکانی دەشتی ڕووسی و کەناراوەکانی دەریای قەزوین بگەڕێنەوە، قەڵەمڕەوی هۆنەکان لەو ناوچەدا لەماوەی نیوەی دووەمی چوارەمی زایینیدا بوو، هەندێ لەمێژوونووسانیش ئاماژە بەوە دەدەن کە هۆنەکان لەسەدەی پێنجەمی زایینی لەساڵی ٤٢٥ز. ەوە لەناوچەکانی بولگاریا سەقامگیربوون.

هۆنەکان لەبزاوتی ئەسپ سواریاندا بەرەو ئامانجەکانیان پشتیان بەهێزو خێرایی دەبەست تائەوەی شمەکی ئەندامەکانییان زۆر کەم و سادە بوو، لەهەموو ئەمانە گرنگتر ئەو باری وێرانی و کاولکارییە بوو کە لەشارو ناوچەکانی سەر ڕێیاندا ئەنجامیاندەدا، زیاتریش پشتیان بەژیانی گواستنەوەو کۆچبەری بەردەوام دەبەست، ڕۆڵی کاراو هەرە گرنگ لەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕێبەری (ئەتێلا) کە توانی کۆیان بکاتەوەو هێزێکی یەکگرتووی لێپێکهێنان تا ئامانجەکانیان بەدیبهێنن.

هۆنەکان چەند ڕەگەزێکی جیاجیای بەلگارو ئاڤارو ئالان و سلاڤیان لەخۆدەگرت، وشکی و ڕەقییەك کە دووچاری هۆنەکان ببوو کاریگەری گەورەو گرنگی هەبوو لەدەرکەتنی باری کشان بەرەو ناوچە ڕۆژئاواییەکان، ئەمەش لەسەدەی چوارەمی زاینییدا ڕوویداو کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر پاڵپێوەنانی گەلە جەرمانییەکان بۆ کۆچکردن بەرەو ڕۆژئاواو هەنگاونان بۆ پەڕینەوە لەڕووباری دانوب و ڕووباری راین لەترسی ئەو وێرانییەی پەیوەست بەهۆنەکان بوو، ئەوەش هۆکارێکی ڕۆخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو.

توندی هۆنەکان بەڕێبەری ئەتێلا هێزو توندی ئەوانی بەرامبەر بەویلایەتە ڕۆمانییەکانی حەوزی خوارووی دانوب لەنێوان سالآنی (٤٣٠ز-٤٣٣ز)دا زیادکرد. ئەمە ئیمپراتۆر ئیودۆسیۆسی دووەمی ئیمپراتۆری دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی ناچارکرد تا سەرانەیەکی سالآنە بدات بەرامبەر بەوەی هێرش نەبەنە سەر خاکی ولآتەکەی و چالاکی خۆیان بەرەو ڕۆژئاوا ئاراستە بکەن ئەتێلا لەساڵی ٤٤٧ز. بەرەو ڕۆژئاوا بەئاراستەی دانوب پێشڕەوی کردو (مواشیاو تراقیاو ئەلبیریاو بانوبیا)ی وێرانکرد، هەروەك لەساڵی ٤٥١ز. دا هێرشی بردە سەر گالیا. هۆنەکان لەزۆربەی شارەکانی گالیادا وەك (تریف، میتز، تروی، شالۆن)و چەندین شاری تری گرنگیدا تالآنیان ئەنجامداو خەڵکەکەیان لەپێش هاتنی سوپای ئەتێلای هۆنی ڕایانکرد تا ڕزگاریان بێت پاش ئەوەی هەواڵی توندیو دڵرەقی هۆنەکانیان لەخەڵکی شارەکانی دی بیستبوو.

لەبەردەم هەڵمەتی دڕندانەو دڵرەقیو هێزی هۆنەکاندا ئیمپراتۆر ڤالنتاینی سێیەم نەیتوانی بۆ وەستاندنی ئەو هەڵمەتە وێرانکەرە هیچ کارێکی چاك بکات، سەرکردەی سەربازەکانیش (ئیتیوس) هەڵیدا بۆ ڕێگری هۆنەکان شتێك بکات، بەڵام خێرا زانی هەرگیز سەرکەوتوو نابێت، بۆیە هەوڵیدا بەرگری لەگالیا بکات.

جێی ئاماژەیە ئەو دیاردەی تایبەتو شیاوی گرنگی پێدانەو لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی ڕوون دەردەکەوێت هاوپەیمانی قووتە ڕۆژئاواییەکانە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا، ئەمەش بۆ بەرپەرچدانەوەی مەترسی هۆنەکان بوو، هاوپەیمانان توانییان لەساڵی ٤٥١ز. لەشالۆن ڕێگری ئەو شاڵاوە بکەنو تووشی شکستی بکەن، پێویستیشمان بەڕوونکردنەوەی ئاستی گرنگی ئەو جەنگە یەکلاکەرەوی ناو مێژوو نییە کە بەڕزگارکەری ڕۆژئاوای ئەورووپا لەدڕندەیی هۆنەکان دادەنرێت، ئەو هۆنانەی لەڕاینەوە هەستان تا لەژێر ڕێبەری ئەتێلادا لەساڵی ٤٥٢ز. دا هەڵمەتێکی کتوپڕ ببەنە سەر ئیتالیا، هێندەی نەبرد ڕۆما خۆی لەبەردە مەترسییەکی نوێی سەختو توندا بینییەوە، ئەمە وای لەپاپا لێو کرد تا

خۆی بچێت بۆلای ئەتێلاو لەگەڵیدا دانووستان ببەستێت، ئەتێلاش لەبەر چەند هۆکارێکی سەربازی پاشەکشەی کرد، هۆکارەکان پەیوەندییان هەبوو بەئاستی تواناو ئامادەسازی سوپاکەی بۆ پێشڕەوی بەرەو پێشەوە، بەڵکوو دەستگرتن بەسەر ئیتالیادا دەستی کێشایەوەو لەساڵی ٤٥٢ز. لەئیتالیا پاشەکشەی کرد، پاش ئەوەی بەڵێنی وەرگرتنی سەرانەیەکی ساڵانەی وەرگرت، هێندەی نەبرد ئەتێلا لەساڵی دواتری پاشەکشەکەدا (ساڵی ٤٥٣ز) لەبانونیا مردو دەسەڵاتەکەی کۆتایی پێهات.

منداڵەکانی هەوڵیاندا وڵات لەنێو خۆیاندا دابەش بکەن، بۆیە کەوتنە گرنگیدان بەململانێی نێوان خۆیان تا خاکی زیاتری دەسەڵاتەکەی باوکیان بگرنە دەست، گەلانی تری ژێر دەستەی هۆنەکانیش دەرفەتەکەیان قۆستەوەو ڕاپەڕین و لەجەنگی (ندیۆ) لەساڵی ٤٥٤ز. شستیان تووشی کورانی ئەتێلا کرد، بەمە ئیمپراتۆریەتی هۆنەکان پێش پێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر مەرگی ئەتێلادا داڕماو کۆتایی پێهات.

********************

# قووتە ڕۆژهەڵاتییەکان

قووتــە ڕۆژهەڵاتییــەکان لەباشــووری ڕۆژهــەڵاتی ئــەورووپا شانــشینی خۆیــان دامەزراندو ئایینی مەسیحییەتیان وەرگرت و مۆرکی ژیانی ڕۆشنبیری ڕۆمانییان پێوەلکــا، بــەڵام لەســاڵی ٣٧٥ز. ەوە ملکەچــی دەســەڵاتداری هۆنــەکان بــوون و نەیانتوانی وەك قووتە ڕۆژئاواییەکان لەدانوب بپەڕنەوە، کاتێك دەسەڵاتی هۆنەکان دارمــا، قووتــە ڕۆژهەڵاتییــەکان لــەئیتالیا ڕۆڵێکــی گــەورەیان بینــی، بــەڵام دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەڕۆژئاوا ئینجا ئەو وڵاتەیان داگیرکرد، ئەوان لەساڵی ٤٩٣ز. دا بەڕێبەری ئیۆدۆریك ئیتالیایان داگیرکردو ئیۆدۆریك بۆماوەی زیــاتر لەســی (٣٠) ســاڵ (٤٩٣ز-٥٢٦ز) بــوو بەپاشــاو شــاری (ڕافنــا)ی کــرد بەپایتەختی دەسەڵاتەکەی.

ئیۆدۆریــك خــۆی بــەگرنگترین پاشــای نێــو پاشــا بەربــەرەکان دەزانــی و سیاسەتێکی سەربەخۆو جیا لەئیمپراتۆریەتی بێزەنتی گرتەبەرو هەوڵیدا نێوانی دانیشتوانە ئیتالیە بنەڕەتییەکان و بەربەرەکان چاك بکات، یاساو ڕێکخستنەکانی کارگێڕیی ڕۆمانیشی هێشتەوەو دەستی بەسەر زەوییەکی فراواندا نەگرت، بەڵام سیاسەتەکەی پیاوانی دەرباری خۆی ڕازی نەکردو لەدژی کەوتنە پیلان گێڕان، ئەمەش بەهاریکاری لەگەڵ ئیمپراتۆر بێزەنتیدابوو.

دوای مردنی ئیۆدۆریك ململانێکانی نێوان پشتوانانی و هەواداری جستنیانی یەکەمی ئیمپراتۆری بێزەنتی زیادی کردو جستنیان ئەو بارەی قۆستەوەو هە ڵمەتێکی بۆسەر قووتە ڕۆژهەڵاتییەکان ڕێکخست و ملکەچی دەسەڵاتی خۆی کردن و پاش جەنگێکی سەختی نزیك بەبیست ساڵ ناوچەکەی بەدەسەڵاتەکەی خۆیەوە لکاند، ئەمەش لەساڵی ٥٥٥ز. دابوو.

نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی زایینی چەندین سیفەتی جیاو دیاری هەیە، بەڵام زیادبوونی قەڵەمڕەوی جەرمانی سیمای هەرە دیاری ئەو ماوەیە تائەوی جەرمانە بەربەرەکان گەشتنە بەرزترین پایە سەربازی و سەرکردایەتییەکان و

لەوەشدا نەوەستان، بەڵکو دەستوەردانی جەرمانی خەریکبوو دەگەشتە گرنگترین دامەزراوەی ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەخودی ئیمپراتۆریەتی دەگرتەوە، دیارترین نموونەش بۆ ئەوە ئەو کارەیە ئەدۆکری سەرکردە لەساڵی ٤٧٦ز. پێی هەستا کاتێك ئیمپراتۆر (ڕۆمیلۆس ئۆگەستس)ی لابرد تا خۆی ببێتە بەدیل بۆ ئیمپراتۆر.

بەڵام خێرا هەوڵیدا ڕەوابونێك بۆ ئەو کارەی بدۆزێتەوە، بۆیە خێرا پەیوەندی کرد بەئیمپراتۆر (زینون) (٤٧٤ز-٤٩١ز) کە فەرمانڕەوایی بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتەکەبوو و داویلێکرد وەك فەرمانڕەوایی ئیتالیا دانی پێدابنێت، ئەگەر ئاماژە بەوە بدەین کە ئیمپراتۆریەت لەژێر سایەی ئەو گەشەسەندنە سیاسیەدا ببوو بەیەکەیەکی سیاسی وا کە ملکەچی دەسەڵاتی یەك فەرمانڕەوا بێت، ئەوا واقیع ئاماژە بەوە دەدات کە بەشی ئیتالی لەدەست ڕۆمانەکان نەماوەو کەوتۆتە دەست جەمەنەکان.

ڕۆمانەکان لەلای خۆیانەوە بەو هەنگاوانەی ئەدۆکەر ڕازی نەبوون، چونکە ئەو بەو کارانەی هەوڵیدەدا لەدەسەڵاتداری ڕۆمانی دەرباز بێت، بۆیە ئیمپراتۆر زینون لەگەڵ دیلی پێشووی ناو بەندیخانەکانی ئیمپراتۆیەتی ڕۆمانی (ئیۆدۆریك)ی سەرکردەی قووتە ڕۆهەڵاتییەکان هاوپەیمانی بەست تا هێرش ببەنەسەر ئەدۆکەر، ئەو هاوپەیمانیەتییەش لەنەخشەیەکی نهێنی ڕۆمانی بەدوور نەبوو کە مەبەستی دەربازبوون بوو لەفشاری قووتە ڕۆژهەڵاییەکان بەوەی لەنێو خۆیاندا بیاندات بەجەنگدا، بەمجۆرە ئیۆدۆریك چوو تا دوای لەناوبردنی ئەدۆکەر لەساڵی ٤٩٣ز. شانشینەکەی دابمەزرێنێتو لەشاخەمانی ئەلب تا بانونیاو لەباشوورەوە تا دالماشیاو وڵاتی سرب سنووری دەسەڵاتەکەی بێت.

ماوەی دیلبوونی ئیۆدۆریك لەقوستەنتینییە قۆناغی بنیادی ڕۆشنبیریو دەروونی بوو تائەوەی ڕۆچوویە سەرسامبوون بەڕێکخستنە ڕۆمانییەکان، بۆیە لەکارگێڕی دەسەڵاتی دواتری شانشینەکەیدا پشتی بەچەندین ڕەگەزو بنەمای ڕۆمانی بەست، بەڵکوو پشتی بەچەندین سەرکردەی ڕۆمانی بوارە جیاجیاکانی بەست.

وێڕای هەوڵە جیاجیاکانی ئیۆدۆریک بۆ چەسپاندنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتداو هەوڵە بەردەوام و وردەکاریەکانی بۆ سەلماندنی ڕەوابوونی دەسەڵاتەکەی، بەڵام لەلایەن ڕۆمانەکانەوە بەشێوەیەکی نائاسایی و دوورەپەرێزی سەیردەکرا، بەتایبەت لەلایەم ئیمپراتۆر جستنیانی یەکەمەوە کە ترسی هەبوو لەچاوچنۆکییەکانی بەرەو فراوانخوازی بەشی ڕۆژئاوای ئەورووپا ببات. ئەمە سەرەڕای باری ناکۆکی مەزهەبی نێوان ئیمپراتۆرو ئیۆدۆریک کە لەسەر مەزهەبی ئاریۆسی بوو، بەڵکوو جیاوازی نێوان هەردوولا لەناو هاووڵاتیانی دەستەوسان کەوتودا ڕەنگی دایەوە، بەجۆرێك هەریەکەو سیاسەتی چەوساندنەوەی ئایینی دژ بەمەزهەبەکەی تری ناو مەسیحییەت پەیڕەو دەکرد.

بەمردنی ئیۆدۆریك لەساڵی ٥٢٦ز. شانشینی قووتی ڕۆژهەڵاتی بوویە جێنیازێکی گەورەی چاوچنۆکان و خوازیارانی دەسەڵات تا ئاستێك کورسی دەسەڵات لەدەست ژنان و منداڵاندا ئاڵوگۆڕی پێدەکراو تۆمەتەکانی دەست بەسەرداگرتنی کورسی دەسەڵات وتەی سەرزاری خەڵك بوون، بەڵکو ئیمپراتۆر جستنیانی یەکەم هەوڵیدا سوود لەو ناکۆکییەی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی پاشایی قووتی وەربگرێت و داوای تۆڵەی کوژرانی کوڕەکەی بەدەستی ئیۆدۆریك دەکردو تۆمەتباری دەکرد بەداگیرکردنی کورسی دەسەڵات.

ئینجا هەڵمەتێکی گەورەی سەربازی ئامادەکرد تائەوەی بوونی قووتی لەئیتالیا لەساڵی ٥٣٦ز. دا لەناوبرد، لەو هەڵمەتە ڕۆمانیانەدا چەندین سەرکردەی وەك بلزاریۆس و نارسیس دەرکەوتن، نارسیس توانی لەساڵی ٥٥٣ز. دا سەرکەتن بەسەر سوپای قووتە ڕۆژهەڵاتییەکاندا بەدەستبهێنێت و توانی (رافنا)ی پایتەخت بگرێت و ئیتالیا بگێڕێتەوە بۆ کۆشی ئیمپراتۆریەتەکەی، ئەمە لەسەردەمی ئیمپراتۆر جستنیاندا ڕوویدا. ئەگەریش ئەو هەڵمەتە سەربازییانە بۆ ماوەیەکی بەردەوام بەبێ پچڕان براونەتە سەر قووتەکان، ئەوا بەڵگەی ئەو گیانە بەهێزەیە کە قووتەکان هەیانبووەو توانیویانە وێڕای کەمی ژمارەیان لەچاو ژمارەی ڕۆمەکاندا بەرەو ڕووی ئەو هەمووە شاڵاوە ببنەوە، چونکە ژمارەیان لەچارەکە ملیۆنێك لەنێو کۆمەڵگەیەکی نۆ ملیۆن کەسیدا تێنەدەپەڕی.

# لۆمباردیەکان

دەسەڵاتداری بێزەنتی لەسەر ئیتالیا زۆر درێژەی نەخایاند، جا لەساڵی ٥٦٨ز. دا لۆمباردییەکان بەڕێبەری ئەلبوین ڕۆچوونە ناو باکووری ئیتالیاو تیایدا شانشینی خۆیان دامەزراندو ساری باڤیایان کردە پایتەختی خۆیان. داگیرکاریەکەیان باکووری ئیتالیاو بەشێکی ناوەڕاستیشی گرتەوەو دەستیانگرت بەسەر ماڵو موڵکی خانەدانە ڕۆمانەکاندا، پەیوەندییە هۆزایەتییەکانیشیان هێشتا پتەوبوو، بۆیە تێکەڵ بەدانیشتوان نەبوونو مۆرکی ڕۆشنبیریو نەریتە ڕۆمانییەکانیان وەرنەگرت، بەڵکوو مۆرکی تایبەتی خۆیان بەسەر باکووری ئیتالیادا سەپاندو تا ئەمڕۆش ناوی لۆمباردیای هەیە.

## ئینگلیزەکان:

پێشتر ڕووداوەکانی جەنگی بەربەرەکانی ئەوکاتەمان باسکرد بوویە هۆی لێکهەڵوەشانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەسەدەی پێنجەمی زایینی دوای ئەوەی جەرمانەکان دەستیانگرت بەسەر گالیاو ئیسپانیاو ئەفریقیاداو تیایدا چەند شانشینێکی جەرمانی سەربەخۆیان دامەزراند، بەریتانیاش کە لەچەند شوێنێکی جیاجیادا ئەوەمان خستەڕوو کە لەسەرەتاکانی سەدەی پێنجەمدا زۆربەی دەستە ڕۆمانەکان لەوێوە هاتوون، هێندەی نەبرد لەماوەی سەدو پەنجا ساڵی دواتردا دووچاری چەندین ڕووداوی ناخۆش بوو، ئەمە وای لێکرد لەشانۆی ڕووداوەکان بەدوور بێت وێڕای دوورەپەرێزیشی لەکاریگەری تائەوەی جارێکی دی پاش ماوەیەك بەمورکێکی نوێوەو بەشێوەی ئینگلتەرا نەوەك بەریتانیا لەشانۆی ڕووداوەکاندا دەرکەوتەوە.

چەند ڕەگەزێکی جیاجیای تیتونەکانی سەر کەناراوی دەریای باکوورو لەنیمچە دوورگەی کتلاند (وەك ئینگلیزو سەکسۆنو کوت) لەسەدەی چوارەمەوە شاڵاویان دەبردە سەر بەریتانیا، ئەو ڕەگەزانە پاش پاشەکشەی سوپا ڕۆمانییەکان

لەساڵی ٤٤٢ز. دووبارە هەڵمەتیان بردەوە، بەڵام لەو ماوەیەدا هێرشیان بردە سەر بەریتانیاو لەگەڵ خۆشیاندا ژنو منداڵەکانیان بردن تا پاش گرتنی تیایدا سەقامگیربن، تا لەکۆتایی سەدەی شەشەمی زایینیدا توانییان زۆربەی خاکی ئینگلتەرا بپڕن جگە لەهەرێمی (کوورنول) لەباشووری ڕۆژئاوای، جێی ئاماژەیە شالاو بەران خەڵکی بنەڕەتی ولاتیان ڕاوەدوونا کە کلتەکان بوون، ئەمەش وایکرد ماوەیەك ئایینی مەسیحییەت لەولاتدا شاراوەو نادیار بێت.

بەڵام ئەو شالاو بەرانە یەکێتییەکی سیاسییان نەبوو کە ولات لەژێر دەسەلاتیاندا یەکبخات، بەڵکوو حەوت دەسەڵاتی هۆزایەتییان دامەزراند کە بەحەوت شانشینەکە ناسرابوونو بریتی بوون لەشانشینی (کنت) کە لەکووتەکان پێکدەهات، شانشینی (ئەسکس و سکسو وسکس) کە خەڵکەکەی لەسەکسۆنەکان بوون، شانشینی (ئەنجلیای ڕۆژهەلاتی)و (مرسیا)و (نۆپمبر لاند) کە خەڵکەکەی ئینگلیز بوون، جەنگو ناکۆکی نێوان حەوت شانشینەکەش بەردەوام بوو تا ئەپلبرتی پاشای کنت (٥٦٠ز-٦١٦ز) توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموویاندا بسەپێنێت، ئەو پاشایە (باتا)ی سەرکردەیەکی مەسیحی فرەنجی بەهاوسەرگرت، لەکاتێکدا قدیس ئۆگەستین وەك نێردراوی پاپا گریگۆری گەشتە ئینگلتەراو لەساڵی ٥٩٧ز گەیشتە کنتو پاش ئەپلبرتیش بوزیادبوونی ژمارەی دەسەڵاتە نێردراوەکانی مەسیحییەت لەلایەكو خێرایی بلاوبوونەوەی مەسیحییەت لەئینگلتەرا لەلایەکی ترەوە بوو بەمەسیحی، ئەمە وایکرد خەڵکی لەکەنارگیری خۆیان بێنەدەرو سەرلەنوێ پەیوەندی بەکاریگەریو جێدەستەکانی ژیاری ڕۆژئاواییەوە بکەن.

لەڕاستیدا قدیس ئۆگەستین (کە بوو بەیەکەم قەشەی کانتربوری) لەبلاوکردنەوەی مەسیحییەت لە (کنت) بەرەو ڕووی سەختییەکی وانەبوویەوە، بەڵام نێردراوەکانی لەناوچەکانی تری دوورگەکەدا بەرەو ڕووی ڕێکەڕێکێکی سەخت بوونەوە، وێڕای ئەمانە مەسیحییەت بەشێوەیەکی دیار لەو ولاتەدا بلاودەبوویەوە تائەوەی کلێسا بوو بەگەورەترین هێزی ژیاری کە لەبەشەکانیدا کاری دەکرد بۆ بلاوکردنەوەی شارستانییەتو یەکێتی نەتەوەیی.

پاشان دیارە ئەو هەڵمەتانەی بەربەرە جەرمانەکان ئەنجامیاندان، کاریگەرییەکی روونی لەکۆمەڵگەی رۆمانیدا بەجێهێشت، چونکە ئەو هەڵمەتانە بوونە هۆی دارمانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەرۆژئاواو لەدەستدانی زۆربەی هەرێمەکانی و کەوتنە دەست شالاوبەران، لەراستیدا جستنیانی ئیمپراتۆری دەولەتی بێزەنتی هەولێکی زۆری خستەگەر بۆ گێرانەوەی ئەو هەرێمانەی کە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەباکووری ئەفریقیاو ئیتالیاو ئیسپانیا لەدەستی دابوون، بەلام سەرکەوتنەکەی کاتی بوو خێرا ئاوابوو.

لەلایەنی ئابووریشەوە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی پێش ئەوەی هەڵمەتی بەکۆمەڵی جەرمانەکان بۆسەر خاکەکەی بەخۆوە ببینێت، گیرۆدەی دەست داکەوتنی ئابووری بوو، بەلام ئەو شالاوانە قورەکەیان خەستتر کردەوە، چونکە ئەو کاولکارییە گشتگیرەی لێی کەوتەوەو جەنگی نێوان خودی شالاوبەران یان نێوان ئەوان و سوپا رۆمانییەکان بوویەهۆی وەستاندنی بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی، بەڵکوو بوویەهۆی داکەوتنی ئاستی بژێوی بەشێوەیکی گشتی.

بێگومان ئەو کاریگەرییە دەروونییەی کە هەڵمەتی بەرەبەرکان و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژئاوایی لەدەروونی هاوسەردەمانیدا بەجێهێشت زۆر گەورە بوو تا ئاستێك خاڵكانێك ئەو رووداوانەیان بەئاماژەی کۆتایی هاتن بەجیهان دەزانی.

ئەگەر چەند لایەنێکی ژیانی ناو ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لەویستی خواییدا وابوویێت لەژێر سایەی گۆرانە نوێکاندا بمێنێتەوە، ئەوا کڵێسای کاپولیکی جێی رێزی جەرمانەکان بوو زیانی پێ نەگەیشت و رێزو قەڵەمرەویشی لەو سەردەمەدا زیادی کرد، لەراستیشدا ئەو مەترسییانەی بەرەو رووی جیهانی رۆمانی بوونەوە لەلایەك و رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوایش لەلایەکی دیکەوە وای لەکڵێسای رۆژئاوایی کرد وەك تاکە هێزی خاوەن توانای رزگارکردنی کلتووری هیواخوازی رزگاربوونی رابردوو دەربکەوێت، قەشەکانیش ئەو سەرکردە ئاساییانەبوون کە خەڵکی لەنێوەندی ئەو تەنگەژەی تووشی ببوون لەدەوریان کۆبوونەوە.

# (باسی پێنجەم)
# (شانشینە فەرەنجیەکان)

گرنگترین ڕووداوی مێژووی جەنگە بەربەرییەکان جەرمەنییەکان دامەزراندنی دەوڵەتی فرەنجی بوو، ئەوەش تاکە دەوڵەت بوو کە توانی لەناو سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بمێنێتەوە.

ئەو هۆزە فرەنجە ڕوو وەرگێڕانەی کە لەنێو خۆیاندا هاوپەیمانیەتییەکی لاوازیان لەسەدەی سێیەمی زایینییدا دەمەزراندبوو، لەسەرەتای سەدەی پێنجەمەوە لەشێوەی دەستەیەك دەرکەوتن کە گرنگترین ڕەگەزەکانی دەریاییەکان و فرەنجە وشکانییەکان بوون، هەریەك لەو دوو لقەش لەسەدەی چوارەمی زایینی لەناو سنووری خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا سەقامگیربوون، فرەنجە دەریاییەکان لەنێوان (راینی خواروو میزوشلد)دا سەقامگیربوون و فرەنجە وشکانییەکانیش لەناوچەی ناسراو بە(مۆزل)ی خواروو نیشتەجێبوون.

کلۆفس (٤٨٦ز-٥١١ن) بەدامەزرێنەری حەقیقی دەوڵەتی فرەنجە دەریاییەکان دادەنرێت، ئەم کەسایەتیە توانی لەسواسون لەساڵی ٤٨٦ز. گورزێکی کوشندە لەسیاگربۆس بوەشێنێت، ئەو کەسەش کۆتا کەسی کارگێڕی ڕۆمانی بوو لەحەوزی (سین) وێڕای ئەوەی ئیمپراتۆیەتی ڕۆژئاوا دە ساڵ پێش ئەوە ڕووخابوو، دوای ئەوە کلۆفیس بەخێرایی کەوتە بەر فراوانکردنی قەڵەمڕەوی فرەنجەکان بۆ بەرەی باکووری گالیاو هەموو بەرە جیاجیاکانی دی، ئاساییش بوو خەڵکی بنەڕەتی ئەوێ بەسەرسوڕمانێکی کەمەوە بڕواننە ئەو گۆڕانە، چونکە ئەوان ڕاهاتبوون بۆ دەستەیەکی نوێی جەرمانەکان ملیان کەچ بکەن بەهۆی شاڵاوەکانی پێشتریانەوە.

بەڵام بزاوتی ئەم فرەنجانە زۆر لەو بزووتنەوانەی دی گەلانی تری جەرمانی جیاواز بوو، چونکە زیاتر لەوەی کۆچێکی شاڵاوبەری بێت بزاوتێکی فراوانخوازی بوو، لێرەوە مێژوونووسان پێیان وایە کلۆفیس بەداگیرکەرێکی تەواو لەقەڵەم نەدەن و خەباتیش دژ بەسیاگرویوس بەپێکدادانی نێوان دوو سەرکردەی خاوەن

نیاز لەقەڵەم بدەن ئەوەك ئەوەی ململانێی نێوان دوو نەتەوەی دژ بەیەكدی بێت، چونكە گەلە جەرمانییەكانی دیكەی وەك قووت و وەندال و بەرگەندییەكان دەستبەرداری پێگەو نشینگەی سەرەكی خۆیان دەبوون و چەندین ساڵ لەنێو هەرێمە ئەورووپییەكاندا دەگەڕان تائەوەی زۆربەیان لەنێوەندی بەشی ناوچەی لاتینی ڕۆژئاوایی و دوور لەنشینگەی یەكەمی خۆیان سەقامگیربوون.

بەڵام فرەنجەكان نشینگەی سەرەكی خۆیان لەڕایینی خواروو بەجێ نەهێشت، بەڵكوو لەوێوە پەلیان دەهاویشت و ناوچەیان دەدایە پاڵ بەبێ ئەوەی شوێنی سەرەكی خۆیان بەجێبهێڵن یان پێوەی بپچڕێت. لەئەنجامی ئەو دیاردەشدا فرەنجەكان بنەڕەت و ژیاری زیندوێتی جەرمانیبوونی خۆیان پاراست، لەكاتێكدا گەلە جەرمانییەكانی دی پەیوەندییان بەنشینگەی یەكەمی خۆیانەوە نەما، هەروەها فرەنجەكان لەسیاسی ژیرانەی خۆیاندا بەوەی لەتوندوتیژی و خراپە بەرامبەر خەڵكی بنەڕەتی ناوچەكاندا خۆیان لەڕەگەزە جەرمانییەكانی دی جیادەكردەوە.

لەڕاستیدا بەڵگەیەكی مێژوویی لەبەردەستدا نیە كە ئەوە بسەلمێنێت فرەنجەكان وەك بەرگەندی یان قووتەكان زەوییان لەخاوەن زەوی سەندبێت و بەسەر جەنگاوەرانیاندا دابەشكردبێت، بەڵكوو بەپێچەوانەوە فرەنجەكان هەمیشە ڕێزی هەستی خەڵكی گالیایان دەگرت و ئازاری ماڵ و گیانیانیان نەدەدا، ئەمە وێڕای دەستگرتنیان بەچەند پەیوەندییەكی چاك و بەرهەمداریان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەزۆربەی كاتەكاندا.

بێگومان ئەم كارەی فرەنجەكان یارمەتیدان تا لەگەڵ خەڵكی بنەڕەتی ناوچەكان نزیكبوونەوەیان هەبێت، نزیكبوونەوەش ئەوكات بەهێزتربوو كە كلۆفیس لەساڵی ٤٩٦ز. بوو بەمەسیحی، بێگومان گرنگی هەنگاوی لەوجۆرە تەنها لەوەدا نیە كە ئەو ئایینە لەنێو شوێنكەوتوان و گەلەكەی كلۆفیسدا بلاوببێتەوە، بەڵكو گرنگییەكەی لەوەدابوو كە كلۆفیس مەزهەبی كاثولیكی وەرگرت، لەمەدا پێچەوانەی گەلانی دیكەی جەرمانی بوو كە بەهۆی وەرگرتنی مەزهەبی پرۆتستانییەوە لای ڕۆژئاوا ناپەسەند بوون.

لەڕاستیدا پیاوانی کڵێسای کاثولیکی لەباشووری گالیا سەرەتا فراوانخوازی فرەنجەکانیان لەباکوور بەوردی خستبوویە ژێر چاودێرییەوە، چونکە پێیان وابوو ئەوانە بتپەرستن و پێناوێکی تەواون بۆ ئاسانکاری پێکهێنانی ئەو دەوڵەتەی جێی هیوا بوو تا بەپێی بنەماکانی کڵێسای ڕۆژئاوایی بێت، بەتایبەت کە هەڵوێستیان لەڕووی خەڵکی سەرەکی وڵاتەکە نەرموونیانی و مامناوەندی بوو، بەپێچەوانەی گەلە شاڵاوبەرەکانی دی. بۆیە پیاوانی کڵێسا لەگالیا چاودێری ئەو ڕۆژە بوون کە تیایدا کلۆفس مەسیحییەتی لەشێوەی کاپولیکەکەیدا وەردەگرت، بەتایبەت دوای ئەوەی کلوتیدای شاژنی مەسیحی کاپولیکی بەرگەندی بەهاوسەرگرت.

هەندێ لەمێژوونووسان پێیان وایە ئەو بارەی کلۆفیس لەکاتی جەنگی لەگەڵ ئەڵمانەکان لەئەلزاس هەیبوو، وای لێکرد بەڵێن بدات ئەگەر سەربکەوێت ببێت بەمسیحی، بۆیە دواتر پاش سەرکەوتنە گەورەکەی بەڵێنەکەی بردەسەر ولەساڵی ٤٩٦ز. بوو بەمەسیحی.

هەر هۆکارێك پاڵی بەکلۆفیسەوە نابێت تامەزهەبی کاپولیکی وەربگرێت، گرنگ ئەوەیە کلۆفیس بەو هەنگاوە گرنگەی توانی سەرەنجامی فرەنجەو دەوڵەتی فرەجی دیاری بکات، چونکە ئەمە وایکرد سۆزو پاڵپشتی خەڵکە کاپولیکیەکەیان بۆ هەبێت نەوەك تەنها لەگالیا، بەڵکو لەهەموو بەشەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپادا ئەمە بوو بەهۆی دامەزراندی جۆرە هاریکاری و پەیوەندی دۆستایەتی و تێکەڵبوونێکی نێوان فرەنج و ڕۆمانەکان، لەکاتێکدا شتی وا هیچ ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوی نەبوو.

وێڕای ئەمەش کلۆفیس بەهۆی ئەو هەنگاوە گرنگەی بوو بەقوستەنتینێکی نوێ، لەکاتێکدا پاشا فرەنجەکان خۆیان وەك پارێزەرو مەسیحییەت لەڕۆژئاوادا دەزانی، ئەمە ڕێخۆشکەر بوو بۆ بەدیهێنانی جۆرە هاوپەیمانییەتیەکی نێوان پاپاکان و پاشایانی فرەنجی، ئەو هاوپەیمانێتیەی کە کاریگەییەکی قووڵی لەسەر داهاتووی ئەوروپا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دروستکرد.

بەوجۆرە پێناوێکی نوێی یاریدەدانی فرەنجەکان بۆ فروانخوازی لەدوای ساڵی ٤٩٦ز. دەرکەوت دوای ئەوەی خەڵکی کاپولیکی ڕۆمانی لەبەشەکانی دیکەی گالیا هەواداری چوونە ژێر دەسەڵاتی کلۆفیس بوون، ئیدی لەبەر دادپەروەریەکەی بێت یان لەبەر هاومەزهەبییەکەی بێت.

دەکرێت تێبینی ئەوە بکەین کە فراوانخوازی فرەنجەکان لەو ماوەدا تەنها لەبەرەی ڕۆژئاواو باشوورەوە نەبوو، بەڵکوو ئاراستەی ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەلاتیشی گرتەوە، لەساڵی ٤٩٦ز. ئەڵمانەکان فشاریان لەبەرزاییەکانی ڕاینەوە بۆ سەر فرەنجە وشکانییەکان دانا کە ئەوانیش بەئاراستەی باشووری ئەڵمانەکان فراوانخوازییان دەکرد، بەمە فرەنجەکان هاواریان بردە لای کلۆفس، ئەوەی چوو بەهانایانەوە.

********************

# بنەماڵە فرەنجیەکان

دکتۆر (جیۆفری تریجەر) لەکتێبەکەیدا (مێژووی ئەوروپاو چۆنێتی پێکهاتنی) مێژووی شانشین و دەوڵەتە فرەنجیەکان لەسەرەتاوە تا دارمانیان بۆ سێ بەش دابەش دەکات، ئەو دابەشکاریەش بەپێی بنەماڵە فەرمانڕەواکان دێنێت:

## ١- **بنەماڵەی میرۆفنجی** (٤٨٦ز-٧٥١ز):

شاکلۆفیس بەیەکێك لەو شا دیارانە دادەنرێت کە لەدامەزراندنی دەوڵەتی میرۆفنجیدا ڕۆڵی دیارو بنەڕەتی بینیوە، کلۆفس توانی لەڕوانگەی سەرکەتنی بەسەر فەرمانڕەوای ڕۆمانی لەسیاگرۆس لەجەنگی سواسۆنی ساڵی ٤٨٦ز. دا سەربەخۆیی تەواو بۆ فرەنجەکان بەدیبهێنێت، ئەو مێژووەش بەمێژووی ڕەسمی دەرکەوتنی دەوڵەتی میرۆفنجی دادەنرێت، بەتایبەت کە کلۆفیس توانی قەڵەمڕەوو دەسەڵاتی تەواو سەربەخۆی بەسەر ناوچە دەستبەسەرداگیراوەکانیدا بڵاوبکاتەوە، بەمەش قەوارە سەربەخۆکەی شەرعیەتی وەرگرت، هاوکات پەیوەندی خۆیشی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا هێشتەوە.

داوای ئەمە بوو بەمەسیحی، زیاتر دەرکەوت و بەو هۆیەشەوە پایەیەکی بەرزی لای کلێسای ڕۆماو گەلیش پەیداکرد، چونکە هەوڵیدا باری تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی نێوان فرەنجەکان و ڕۆمانەکان بەهاندانی هاوسەرگیریی و تێکەڵبوونی ڕەگەزی گەشەپێبدات تا بەربەستەکانی نێوان ئەندامانی نێو دەسەڵاتەکەی نەهێڵێت و قەوارەیەکی ڕامیاری یەکگرتووی وا پێکبهێنێت کە لەسەر یەکبوونی ئایینی و کۆمەڵایەتی بنیادبنرێت.

ئەو ڕووداوە کاریگەری گرنگی هەبوو لەپێدانی هێزێکی زیاتر بەکلۆفس، چونکە پاپا ڕاستەخۆ پاڵپشتی کرد، بەوجۆرە بەهەموو متمانەیەکەوە بزاوتە سەربازیەکانی خۆی دەستپێکردو هەوڵیدا دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو فرەنجە وشکانیەکاندا بسەپێنێت و بەرەو بەرزاییەکانی ڕاین چوو تاهێرش بکاتە سەر ئەڵمانەکان و لەگالیا دەریانبکات تا دەسەڵاتی خۆی بەسەر زەوی بەرفروانی هاوتەریب و هاوڕای ڕووباری ڕایندا بسەپێنیت.

خواستەکانی کلۆفس لەو ئاستەدا نەوەستان، بەڵکوو هەوڵیدا لەساڵی ٥٠٠ز. هێرش بکاتە سەر بەرگەندییەکان و هەڕەشە لەبوونی ڕامیاری بکات، ئەمە وێڕای پێکدادانی چەکدارانەی لەگەڵ قووتە ڕۆژئاواییەکاندا کە توانی لەجەنگی فوبیە لەساڵی ٥٠٧ز. بەسەریاندا سەربکەوێت، بەمەش ئیمپراتۆری بێزەنتی پەنای بردە داننانی فەرمی بەکلۆفس و دەسەڵاتە سیاسییەکانی بەسەر گالیاداو لەساڵی ٥٠٨ز. نازناوی فەرمانڕەوایی گالیای ڕۆمانی پێبەخشی، ئەمە وەك بەخششێك بۆ ئەو هەوڵەی خستیەگەڕ بۆ لادانی قەڵەمڕەوی قووتە ڕۆژئاوییەکان، چونکە قووتەکان تا ئاستێکی زۆر هەڕەشەیان دەکرد لەقەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەت.

ئەم کارانەی کلۆفس چەندین لایەنی ڕێکخستنی گرتەوە، وادیارە ئەمە لەبەر کاریگەربوونی ڕوونی بەژیاری ڕۆمانی بووە، کاتێك ویستی شانشینەکەی بەپێی بنەڕەتێکی وردو دروستی کارگێری دامەزرێت. لێرەوە کلۆفس کەوتە دارشتنەوەی ئەو یاسایەی کە لەساڵی ٥٠٧ز. داینا و بە (یاسی ساڵی) ناسراو لایەنەکانی پاداشت و سزاو میراتگری دەگرتەخۆ.

بەمردنی کلۆفیس لەساڵی ٥١١ز. شانشینەکەی لەنێوان چوار کوڕەکەیدا دابەشبوو ئەوانیش توانییان درێژە بەچالاکیەکەی باوکیان بدەن و شانشینی فرەنجە بەهۆی هەڵمەت بردنەسەر (ئیسپانیاو ئەڵمانیاو ئیتالیا) فراوان بکەن، پاش مردنی سێ برایان دەسەڵات کەوتە دەست کلۆتیر، ئەمەش لەساڵی ٥٦١ز. دابوو، بەمە باری جیاوازی لەنێو شانشینەکەدا قووڵ بوویەوە، بەتایبەت کە بەپێی نەریتە جەرمانیەکان دەسەڵاتەکەیان بەسەردا دابەشکرابوو.

بەوجۆرە سێ هەرێمی جیاواز لەنێو شانشینی میرۆفنجیدا دەرکەوتن، هەرێمی ئوستراسیا لەڕۆژهەڵات کە زۆرینەی جەرمانی بوو و ژمارەیەکی زۆری جوتیارانی تیادا بلاوبیبوویەوە، هەرێمی نوستریا لەڕۆژئاوا کە ڕەگەزی ڕۆمانی تیادا بلاوبوو خاوەن خاکێکی زۆر بوون کە کۆیلە ئیشیان تیادا دەکرد، هەرێمی بەرگەندیا لەباشووری ڕۆژهەڵاتی گالیا کە جوتیاری خاوەن زەوی بچووکی تیادا بلاوبوو.

ئەو دابەشبوونە کاریگەری ڕوونی خۆی هەبوو لەسەر سروشتی پەیڕەوی ڕامیاری تائەوەی دیاردەی پێکدادانی نێوان سێ هەرێمەکە دەرکەوت و هەرکامیان دەیویست لەسەر حسابی ئەوی دی فراوانخوازی بکات.

هۆکارە ناوخۆییەکان کاریگەری زۆریان هەبوو لەبەدیهێنانی دیدی دەسەڵات و قەڵەمڕەودا، ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین هەرێمی نوستریا خاوەن زەوی گەورەی هەبوو، ئەمانە هەوڵیاندەدا زەوییەکانیان فراوانتر بکەن تا ببنە بنەڕەتی چینی دەرەبەگی کە دەسەڵاتی توندی خۆی بەسەر هەموو جوتیارانی ئیشکەری ناو زەویدا پەیڕەو بکەن، بەهۆی باری کەڵەکەبوونی سامان و چوون بەرەو ئابووری بەرهەمخوازی خۆی لەبەشە تایبەتەکاندا، دیاردەی چاکسازی بەدەر لەحکوومەتی مەرکەزی قووڵ بوویەوە، لەئەنجامی هەموو ئەمانەدا ململانێ ناوخۆییەکان توونید بوونەوە، ئەو بارە بەوجۆرە بەردەوام بوو تا دەرکەوتنی شا کلۆتیری دووەم کە توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەرێمی ئوسترازیاو هەرێمی بەرگەندیادا بسەپێنێت، ئەمەش لەماوەی دەسەڵاتی لەنێوان ساڵانی ٦١٣ز-٦٢٨ز. بارەکە بەوجۆرە بەردەوامبوو سەردەمی داگوبیرتی کوڕیشی گرتەوە کە تاساڵی ٦٣٩ز چوو.

دەرەبەگەکان بەهەموو توانایەکیانەوە دایانە پاڵ شاکلۆتیری دووەم بەوپێیەی زامنکارییەکی زۆری پەیوەست بەچەسپاندنی بەرژەوەندییەکانی ئەوانی پێشکەشکرد، بەتایبەت لەبواری خاوەندارێتی زەوی و باجەکاندا، بەڵکو چەند تایبەتمەندییەکی بواری مافە دادوەرییەکانیشی پێبەخشین.

لەڕاستیدا قۆناغی لەوجۆرە دەرفەتیدا بەسەهەڵدانی ئامادەکارییەکانی سیستمی دەرەبەگایەتی و دەرکەوتنی ئاراستە گشتیەکانی، لەسروشتی ئەو هاوپەیمانییەتیەوە چەند پەیوەندییەکی نوێ سەریانهەڵداو چەند دەستەیەکیش بەشداربوون لەنەخشەسازی دیمەنە گشتییەکانی وێنەی سیاسی ناو دەوڵەتی میرۆفنجی، بەوە دەرەبەگ و سەرکردەو پەردەدارەکان لەساڵی ٦٣٩ز. ەوە لایەنی هەرە بەهێزی ناو دەوڵەتیان پێکهێناو دەستیان وەردەدایە کاروباری تایبەتی

خودی شا، شا کلۆفسی دووەم باشترین نموونەی ئەو دیاردەیە، چونکە میر (ئەوکا) کە لەساڵی ٦٤١ز. مرد دەستیگرتبوو بەسەر قەڵەمڕەویداو دواتر ئەرشینولد لەمەیدانی رامیاری دەرەبەگایەتیدا دەرکەوتو هەرێمی ئوستراسیا بوویە جێی تالانی قەڵەمڕەوی (بیبن)ی بەرپرسی کۆشکو (همبرت)ی سەرۆکی قەشەکان لەماوەی ساڵانی ٦٣٢ز-٦٥٦ز.

پێویست ئاماژە بەوەش بدەین کاتێك (بیبن) گەیشتە پایەی پەردەداری شانشینی ئوستراسیا لەساڵی ٦٢٢ز. قەڵەمڕەوی کارۆلینجی کەوتە چەسپاندنی بنکە رامیاریەکانی خۆی لەناو شانشینی میرۆفنجیدا.

زۆرێك لەمێژوونووسان بەماوەی نێوان ساڵانی ٦٣٩ز-٧٥٢ز. دەڵێن سەردەمی شا تەمبەڵەکانو دەسەڵاتداری پەردەداران، چونکە دەسەڵاتەکانی شا تا ئاستێکی زۆر لاواز بوونو تەنها مانەوەی فەرمییان بۆمایەوە، لەکاتێکدا دەسەڵاتی کرداری بەدەست سەرۆکی کۆشك بوو، سەرۆك کۆشك ڕکەبەری هاودەمەکانی دیکەی نێو شانشینەکانی دیکەی دەکردن، پێدەچێت ململانێی نێوان پەردەداری شانشینی (نوستریا)و شانشینی (ئوستراریا) تیشکێکی ڕوون بێت بۆسەر قووڵی قەڵەمڕەوی سەرۆك کۆشکەکان لەشانشینی ئوستراریا کە قەڵەمڕەوەکەی هەردوو شانشینی دەگرتەوە، وێرای شانشینی بەرگەندیا.

شانشینی میرۆفنجی خەریکبوو لەدوای مردنی کتوپڕی سەرۆك کۆشکی جێگرەوەی بیبنی دووەم کە بە (گریموالدی دووەم) ناسرابوو دووچاری داڕمانو دابەشکاری بێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر ئەو گرفتو ناکۆکیانەی پەیوەست بەدەسەڵاتی نێوان نەوە کەم تەمەنەکاندا هەبوو، کە بەهاندانی خێزانی (بیبن) ئەنجام دەدرا، ئەو ژنە دەیویست پێشڕەوەی کارەکان بگرێتە دەست، تائەوەی (شارل مارتل)ی کوڕی ناشەرعی (بیبن) گەیشتە دەسەلات.

ماوەی دەسەڵاتی ئەمیش (٧١٤ز-٧٤١ز) چەندین ئاژاوەو بارگرژیو پێکدادانی سەربازی لەگەڵ چەندین هێزی سیاسی نێو مەیدانی ئەو کاتەدا

بەخۆیــەوە دی، وەك هێــزی ئیــسلامی کــە ئــەڵمان و بولگــارو سەکــسۆنەکان بــەهێزتربوون، بــەهۆی بــاری پێکــدادان و ئــەو ســەرکەوتنەی بــەدی هێنــا، نازنــاوی (المگرقە-مەقاش)ی لێنرا، ئەویش کەوتە گرتنەبەری سیاسەتی هاوپەیمانی لەگەڵ هێزە دراوسێکانیدا لەپێناو بەدیهێنانی نیازە سەربازییەکانی.

سەرەڕای باری دیاری دوژمنکاری دژ بەشانشینی ئەکوتین کە لەساڵی ٧٣١ز. گەشتە بـاری پێکـدادان، بـەڵام شـارل مارتـل لـەپێناو بەرەوڕووبوونـەوەی فتوحاتی ئیـسلامی لەگـەڵ ئـەو میرنـشینەدا هاوپـەیمانی بەسـت و تـوانی لەجـەنگی (بـلاگ الـشهداو) کـە لـەجیهانی ڕۆژئـاواو ئـەوروپا بەجـەنگی (بەواتیـە) ناسـراوە لەسـاڵی ٧٣٢ز. ڕێ بەســوپای ئیــسلامی بگرێــت و تێییــدا ســەرکردەی ئیــسلامی عەبدورەحمانی غافقی (شەهید ببێت)، وێڕای ژمارەیەکی زۆری ئـەو موسڵمانانەی کە لەو جەنگەدا بەشداریان کرد.

ئەوەی جێگەی سەرنجە شارل مارتل بەشێوەیەکی بەرچاو ئەو سەرکەوتنەی لەبەرژەوەنـدی خـۆی قۆسـتەوەو بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە پـارێزەری یەکەمـەو تاکە بەرگریکاری مەسیحییەتە، لەئەنجامی ئەمەدا دەستیگرت بەسـەر زەوییـەکانی کڵێـساداو زۆربــەی داهاتــەکانی لەبەرژەونــدی ئــەو ســەربازانەی بــەکاردەهێنا کــە بنەڕەتی یەکەمی سەرهەڵدانی دیاردەی دەرەبەگایـەتی بوون، لەئەنجامی ئەو بارە نامۆیەشدا پەیوەندی نێوان شـارل مارتـل و کڵێـسا بـارگرژی تێکـەوت، بەتایبـەت کە کڵێسا ئەوکارەی شارلی بەهەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ دەزانی بۆ قەڵەمڕەوی خۆی.

لەسەر ئاستی سەربازیش شـارل مارتـل تـوانی چەندین شـاڵاوی سـەربازی دژ بەسەکـسۆنەکان ئـەنجام بـدات کـە زیـاتر لـەپێنج شـاڵاو دەبـوون، تیایـدا تـوانی دەستبگرێت بەسەر ڕاین و وڵاتی ئەلب دا. سەرکەوتنەکانیشی پاڵنـەری بوون تا دژ بــەفریزنس و بــەلفارو ئەڵمانــەکان درێــژە بــەو سیاســەتەی تائــەوەی بــوو بەتاکە دەسەڵاتێك کە هیچ کەس ڕکەبەری نەکات.

وێـڕای هـەموو ئەمانـەو ئـەو سـەرکەوتن و دەسـتکەوتە گەورانـەش کـە شـارل بەدیهێنان، بەڵام لـەدوای مردنـی لەساڵی ٧٤١ز. هـەمووی لەدەست چوو، چونکە هەریەك لەدوو کوڕەکەی شارل (کارلەمان)و (بیبنی بچووك) لەسەر دەسەڵات کەوتنە ململانێی و وڵاتیـان لـەنێو خۆیانـدا دابەشـکرد، کارلـەمان بەشـی ڕۆژئـاواو بیبنـی بـچووکیش بەشـی ڕۆژهـەڵاتی بەرکـەوت، لەگـەڵ ئـەم دابەشکردنەشـدا ململانێـی نێوانیـان خوێنـاوی و بـەردەوام بـوو تاسـاڵی ٧٤٨ز. کۆتـایی هـات بەکـەنارگیری کارلەمان لەدەسەڵات و چوونە ناو (دێر).

بەمـە قۆنـاغێکی نـوێ و یەکلاکـەرەوە دەسـتیپێکرد کـە تیایـدا بـیبن تـوانی پەیوەندییـەکانی خـۆی لەگـەڵ کڵێـسادا بـەهێز بکـات بـەوەی هـەموو هـەوڵێکی خستەگەڕ تا ئـەو وێنـەی شـارل مـارتلی بـاوکی نیشانی دابوو بیگۆڕێت، لـەپێناو پێدانی ڕەوایـەتی ئـایینی بەخواسـتە سیاسییەکانیشی کـە نیـازی کۆتـایی هێنـان بەدەسەڵاتی میرۆفنجی و هێنانی بنەماڵەی کارۆلینجی بوو، وەفدێکی ڕەسمـی نـارد بـۆلای پاپـا زەکـەریا (٧٤١ز-٧٥٢ز) تـاداوای ڕەوابـوونی دەسـەڵات و دیـاریکردنی کەسی شیاوتر بەتاج لەسەرنانی ڕەسمی لێبکات، تابڵێن ئایا پاشای لاوازی بێتوانا شیاویەتی ئەو پەردەدارەی کە هەموو مەرجێکی بەخت و توانای هەیە، پاپاش زۆر بەسـادەیی دایـە پـاڵ بـیبن، تـەنها لەبەرئـەوی دوژمنـی گـەورەی هـەموو دوژمنـانی کڵێسای کاثولیکی ناو ڕۆما بوو بەهەموو بتپەرست و ئاریۆسـی و موسڵمانەکانەوە. بەم پێیە لەساڵی ٧٥١ز. بەشێوەیەکی ڕەسمی تاجی لە (شلدریکی سێیەمی ) کۆتا پاشای بنەماڵەی میرۆفنجی سەندەوە، پاپا (ستیڤن)ی جێگری پاپا زەکەریا هات بۆ گالیـا سـاڵی (٧٥٤ز) تـا لەمەراسـیمێککە گـەورەی ئـایینی و بەرچـاو لەکڵێـسای (سواسون)دا تاجی پاشایەتی بکاتە سەر بیبن وەك پاشای فرەنجەکان.

میرۆفنجیـەکان بۆ دابەشـکردنی شانشینەکەیان چەند یەکەیـەکی کارگێڕییـان داناو ئەو یەکانەش چەند شارێکیان کۆدەکردەوە، ئەو شارانەش کۆمـەڵێك گونـدی بچووکیان لـەخۆدەگرت، (کۆنـت) گـەورەی یەکـەی کـارگێڕی بـوو و چـەند ئـەرکێکی لەلایـەن پادشـاوە پێدەسـپێردرا، لەوانـە کۆکردنـەوەی باجـەکان و جێبـەجێکردنی بڕیارەکـانی دادگـا فرەنجیـەکان و کۆکردنـەوەی سـەربازە ئازادەکـان لـەکاتی ئامادەسازی بۆ جەنگ.

لەسەر ئاستی ڕێکخستنە کۆمەڵا یەتییەکانیش چەند ئەنجومەنێکی لەپیاوان لەهەر شارێکدا پێکدەهێناو بەو ئەنجومەنە دەوترا (مالوس) کە سەرۆکەکەی لەلایەن ئەندامانەوە دادەنراو پێی دەوترا (توگین)، بەڵام ئەو دابەشکارییە بەهۆی گۆڕانی دەسەڵات و قەڵەمڕەو لای چینی دەوڵەمەندان و دەرەبەگ و گەورە سوارچاکانەوە درێژەی نەکێشاو ئەنجوومەن لەدەسەڵاتداری پیاوانی ئازادەوە کەوتە دەست کەمینەی دەرەبەگە خاوەن زەوی و ماڵ و سامان و کۆیلەدارەکان.

شای فرەنجی چەند دەسەڵاتێکی فروانی هەبوون کە لەسەر بنەمای میراتگری و دابەشکردنی بەسەر کوڕانیدا دامەزرابوو، ئەمە لەگەڵ سەرپەرشتی ڕاستەوخۆو فراوانی خۆی بەسەر هەموو لایەنەکانی دادوەری و سەربازی و سیاسیدا، بەڵکوو ئەو دەسەڵاتانەی هەیبوون دەرفەتیان پێدەدا تا هەر بەشێکی خاك و وڵات بدات بەئەندامێکی بنەماڵەکەی یان دەربارەکەی، لەکاتێکدا پیاوانی پاسەوانی تایبەت پایەیەکی تایبەت و بەرچاویان بەسەر هەموو دەستەکانی تری ناو کۆشکدا هەبوو و دەسەڵات و تایبەتمەندییەکی فراوانیان هەبوو، دیارترین نازناوەکانی ناو کۆشکی فەرەنسیش بریتیبوو لە (کۆنت) کە سەرۆکی یەکەی کارگێڕی بالاّ بوو، (دۆق) ئەرکی سەرکردایەتی هەڵمەتە سەربازییەکانی لەئەستۆبوو، ئەمە سەرەڕای قەڵەمڕەوی پیاوانی کڵێسا کە پایەیەکی بەرزیان هەبوو لەبەر چاکی و تەبایی و پەیوەندی تایبەتی نێوان کڵێسای کاپولیکی و شای میرۆفنجی.

*********************

## ٢-بنەماڵەی کارۆلینجی (٧٥١ز-٨٩٩ز):

ئەگەر بیبن توانی شانشینی بۆ بنەماڵەی کارۆلینجی رابگەیەنێت بەهۆی هاوپەیمانێتیە بەتینەکانی لەگەڵ کڵێسادا، ئەوا دامەزرێنەری حەقیقی ئەو بنەماڵەیە شارلەمانە (٧٧٤ز-٨١٤ز)، کارۆلینجەکان کە وەك سەرۆك کۆشکی میرۆفنجی کاریان دەکرد توانییان لەڕوانگەی میراتگری ئەو پایەوە کە قەڵەمڕەوو کارابوون و دەسەڵاتی بڕیاردانی پێدەبەخشین دەسەڵات لەدەست خۆیاندا پتەوو سەقامگیر بکەن و شای میرۆفنجیش تەنها وێنەیەکی خەیاڵی بێت لەبەردەم ئەوانی دیکەدا، بەرژەوەندییەکان هێڵی پەیوندییان دەکێشا، جا کڵێسا بەپێی دژایەتی لەگەڵ لۆمباردیەکاندا بەرەوڕووی کارۆلینجیەکان چوو، لۆمباردیەکان بەتوندی هەڕەشەیان لەماڵ و موڵکی کڵێسا دەکرد تائەوەی بیبن دژ بەلۆمباردیەکان کەوتە سەرخستنی کڵێسا.

نەریتە فرەنجیەکان لەدابەشکردنی شانشینەکەدا ڕۆڵی خۆیان گێڕا، جا پاش مردی بیبن لەساڵی ٧٥٨ز. شانشینەکە لەنێوان کارلەمان و شارلی برایدا کە دواتر بەشارلەمان یان (شارلەمانی گەورە) ناسرا دابەشکرا، شارلەمان دەستیگرت بەسەر ئوستراسیاو بەشی کۆتایی ئەکۆتیندا.

شتێکی ئاسایی بوو ململانێی نێوان هەردوو برا ببێتە هۆی کانارگیری کارلەمان و چوونە ناو (دێر) تا شانشیەنەکە بەتەواوەتی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی شارل و بتوانێت هەموو ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتی بەهێزی خۆیدا یەکبخات، سەرەتای سەردەمەکەیشی هێرشبردنی بوو بۆسەر لۆمباردیەکان دوای ئەوەی پاپای ڕۆما پەنای بردە لای، ئەو هێرشە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی بینی لە لەناوبرنی شانشینی لۆمباردیەکان لەساڵی ٧٧٣ز. کە وەك دڕکێکی ناولەپی کڵێسا وابوو، شارلەمان هەوڵیدا هەڕەشە لەبوونی ئیسلامی ناو ئەندەلوس بکات، بۆ ئەمە ئامادەسازی کرد تا هێرش بباتە سەر هێزە ئیسلامییەکان لەساڵی ٧٧٨ز.دا.

بەڵام خێرا بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی دوای ئەوەی هەواڵی پێگەشت کە هۆزە سەکسۆنەکان هێرشیان هێناوەتە سەر شانشینەکەی، لەڕێگەی مردنیدا سوپاکەی بەرەو ڕووی هێرشی هیزە باسکەکان بوویەوەو تیایدا سەرکردە رولان کوژرا، شارلەمان بەشکستخواردوویی و سەرشۆری لەشالاوە سەربازییەکەی بۆ سەر ئەندەلوس گەڕایەوە، بەڵام لەجیاتی خۆبەدەستەوەدان هەوڵیدا دەستبگرێت بەسەر باری ناوچەکانی وڵاتەکەیدا، بەتایبەت لەهەرێمی ئەکتانیا، ئەم سووربوونەیشی لەتاو ترسی قۆرخکاری و دوژمنانی بوو بۆ ئەو شکستە لەپێناو نەخشەسازی و کارئەنجامدانێکی وردو تەواودا (لویس)ی کوڕی کرد بەشای هەرێمەکە، لەگەڵ ئەمەشدا خۆی سەرپەرشتی تەواوی هەبوو بەسەر شای بچووکی کەمئەزموندا.

ململانێی ناوخۆیی ناو ئەندەلوس کاریگەری گەورەی هەبوو لەوەی شارلەمان دووبارە هێرش بباتەوە سەر وڵات، ئەو بارەش کە بەمردنی عەبدورەحمانی یەکەم هاتە کایەوەو ئەو ململانێی دەسەڵاتەی لەنێوان هیشام و براکانیدا ڕوویدا تا ئاستێکی زۆر بەشداریکرد لەپێشڕەوی کارۆلینجەکان بەرەو چەند ناوچەیەکی کەناراوی لەساڵی ٧٨٨ز. دا.

بەڵام هێزە فرەنجیەکان بەرەو ڕووی هەڵمەتێکی گەورەی ئیسلامی بوونەوەو لەکۆتایدا موسڵمانان توانییان بەسەر هێزە فرەنجیەکاندا سەرکەون و لەو ناوچانەی داگیریان کردبوون دەریان بکەن، بارەکەش بەوجۆرە مایەوە تاساڵی ٨٠١ز، ئەوکات خەلیفەی موسڵمانان هیشام مردو حەکەمی کوڕی شوێنی گرتەوە، حەکەم لەسەرەتای دەسەڵاتیەوە بەرەوڕووی ئاژاوەو هەڵگەڕانەوی سولەیمانی مامی بوویەوەو لەجەنگێك لەنزیك (گلیگلە) سولەیمان کوژرا، هەروەها هەڵگەڕانەوەی عەبدوڵای مامی کە داوای یارمەتی لەشارلەمان کرد، بەوهۆیەوە فرەنجەکان توانییان دەستبگرن بەسەر ناوچەکانی باکووری ئیسپانیادا وەك کەتالۆنیاو گاسکۆنیا.

بەڵام بارەکە یەکلاکەرەوە نەبوو، چونکە ناوچە سەرسنووریە ئیسلامی-فرەنجیەکان لەباری ڕاڕایی و چاودێریدا بوون، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە شارلەمان هەوڵیداوە کار بەناهەمواری سیاسی بکات و وەفدی ناردووە بۆ کۆشکی هارونەڕەشیدا لەبەغداد وەك دژایەتی بۆ بنەماڵەی ئومەوی فەرمانڕەوایی نێو ئەندەلوس، چونکە بنەماڵەی ئومەوی و عەباسی دوژمنایەتییان لەگەڵ یەکتر هەبووە.

لۆمباردیەکان لەڕێی شا (دیزیدیروس)ەوە توانییان دەستوەردەنە ناو کاروباری بنەماڵەی کارۆلینجییەوە، ئەمەش لەڕێی پاڵپشتی شا بۆ بانگەشەکانی جێگرەکانی کارلەمانی برای شارلەمان بۆ میراتگری دەسەڵات. بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ داوای لەپاپا کرد تا ئەو داخوازییانە بەپیرۆز ڕابگرێت، بەڵام پەیوەندی بەتینی نێوان کڵێساو شارلەمان ڕێی بەجێبەجێکردنی ئەو داوایە نەدا. لۆمباردیەکان ناچار هێرشیان بردە سەر خاکی کڵێسا لەئیتالیاو گرتیان، ئەمە وای لەپاپا ستیڤانی سێیەم کرد تا بچێت بۆلای شارلەمان و داوای لێبکات لەو هێرشی کتوپڕە بیپارێزێت.

لەپێناو ئەمەشدا شارلەمان دەستبەرداری جەنگی سەکسۆنەکان بوو تابچێت بەدەم داواکەی پاپاوە، ئەمەش لەساڵی ٧٧٣ز. دابوو توانی لەچەند جەنگێکی سەختی یەك ساڵەدا سەرکەوتن بەسەر هێزە لۆمباردیەکاندا بەدیبهێنێت و ناوچەکانی لۆمباردیا بداتە پاڵ خاك و دەسەڵاتەکەی خۆی.

لەنێوەندی ئەو ململانێیەدا دەوڵەتی بیزەنتی هەوڵیدا لەبەرژەوەندی لۆمباردیەکان و لەبەر چەند هۆکارێك دەستوەربداتە بارەکە، لەو هۆکارانەش نەبوونی ئارەزووی لەبوونی قەڵەمڕەوی فرەنجی لەناو خاکی ئیتالیادا، وێڕای ململانێی ئایینی و بیروباوەڕی نێوان کڵێسای بیزەنتی و کڵێسای کاپولیکی، بۆئەمەش قوستەنتینیە پلانێکی داڕشت بۆ کۆتای هێنان بەقەڵەمڕەوی فرەنجی، ئەمەش بەپاڵپشتی کردنی کوڕەکەی (دیزیدیروس) لەساڵی ٧٨٠ز. بەڵام ئەو

هەوڵەی سەرکەوتوونەبوو دوای ئەوەی شارلەمان بەهێزە سەربازییەکانیەوە بەرەو ئیتالیا چوو تا دەسەلآتی خۆی بەسەریدا بگرێتەوەو ملکەچی قەڵەمڕەوی فرەنجی بکات.

لەماوەی دەسەلآتی شا (بیبن)دا باڤاریا ملکەچی قەڵەمڕەوی فرەنجی بوو، شای باڤاریا (تاسیلۆن) پابەندی هەموو ئەو ئەرکانە بوو کە لەلایەن فرەنجەکانەوە بەسەریدا سەپا، بەتایبەت لەبواری بەشداری کردن لەو جەنگانەی فرەنجەکان دژ بەدوژمنەکانیان بەرپایان دەرکردن، دیارترین بەشداریکردنیش لەجەنگەکانی ئەکیتانیا لەساڵی ٧٦٥ز. بەلآم تاسیلۆن بڕیاری سەربەخۆبوون لەدەسەلآتی فرەنجەکانی دەرکرد، بەهۆی سەرقاڵبوونی فرەنجەکانی بەکێشە ناوخۆییەکانیان، بەلآم لەوکاتەی شارلەمان لەساڵی ٧٧٨ز. هەڵمەتی بردە سەر زەوییە ئیسپانیەکان بارەکە وەك خۆی لێهاتەوە، پەیوەندی نێوانیان لەهەڵکشان و داکشاندا مایەوە تائەوەی تاسیلۆن هەوڵیدا لەپێناو کەمکردنەوەی فشاری فرەنجەکان پەیوەندی بکات بەپاپاوە.

بەلآم پاپا دایە پاڵ شارلەمان و هەڕەشەی لەتاسیلۆن کرد کە لەکڵێسا دەریدەکات ئەگەر بێتو هەوڵی هەڵگەڕانەوە لەقەڵەمڕەوی فرەنجی بدات، چونکە لەدیدی پاپادا شارلەمان پارێزەری کڵێسایە، ئەوکات تاسیلۆن ناچاربوو پەنا بباتە بەر هاوپەیمانی لەگەڵ ئاڤارو دەوڵەتی بێزەنتیدا، بەلآم لەلایەن کەسانی کارمەندی کۆشکەوە ئەو هاوپەیمانێتییە ئاشکرا کرا. ئەمە وایکرد خۆی بداتە دەست شارلەمان و لەساڵی ٧٩٤ز. دەستبەرداری هەموو مافەکانی سەرکردایەتی ببێت، بەمە باڤاریا بەتەواوەتی ملکەچی قەڵەمڕەوەی کارۆلینجی بوو.

*******************

# *ئیمپراتۆریەیەتی شارلەمان (٨٠٠ز-٨١٤ز)

شارلەمان توانی سنووری دەسەڵاتەکەی فراوان بکات و ئیمپراتۆریەتەکەی لەشاخەکانی بیرنیەوە تاڕووباری ئەلب و لەدەریای ڕەشەوە تاڕووباری تیبر بچێت، ئەو ڕووبەرەی لەژێر دەستیدابوو زۆر لەمەیدانی ئیمپۆاتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوایی پێشوو جیاواز نەبوو، چونکە دەسەڵاتەکەی هەژموونی هەبوو بەسەر کۆمەڵە نەتەوەو هۆزێکی جیاوازدا، کاری هەرە گرنگیش سەرخستنی کڵێسای کاپولیکی و موژدەبەری مەسیحییەت بوو لەنێو چەند گەلێکی جۆراوجۆری وەك ئاڤارو باڤارو فریزو سەکسۆن، کڵێساش بەگرنگترین بەرگریکاری مەسیحییەتی دادەنا وەك پیشتر ئەوەمان ڕوونکردەوە، وێڕای زۆری جۆراوجۆری کارو چالاکیەکانی کڵێسا کاری هاریکاریکردنی لەهەڕەشەی لۆمباردیەکاندا لەبیرنەکرد، لەژێر سایەی هەموو ئەمانەدا شارلەمان بوو بەگەورەترین هێزی سیاسی و سەربازی سەردەمی خۆی.

کڵێسای کاثولیکی ناو ڕۆما چەند ڕووداوێکی کوشندەو سەختی بەخۆیەوە دی کە خۆی دەبینیەوە لەتێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان پاپای نوێ (لیۆنی سێیەم) کە لەساڵی ٧٩٥ز. بوو بەپاپا لەگەڵ گەورەکانی چینی خانەدانەکانی ڕۆما کە پێیان سەخت بوو پاپای نوێ لەو مافانە بێبەشیان بکات کە لەماوەی سەردەمی پاپا ئادریانی یەکەمدا هەیانبوون، بۆیە جەنگیان لەدژ پاپا ڕاگەیاندو بەلادەرو درۆزن و بێباوەڕ تۆمەتباریانکرد. باری دوژمنکاری گەیشتە ئەوەی پاپا لەمەڵبەندی کارەکەیەوە ڕابکات و پەنا بباتە لای دۆق سبۆلیت لەئیتالیا، کاتێك هەواڵی ڕاکردنی پاپا لەبەشەکاندا بڵاوبوویەوە، شارلەمان لەساڵی ٨٠٠ز. چوو بۆ ڕۆماو بڕیاری بەستنی دادگایەکی ئاشکرای دەکردو تیایدا بێتاوانی لیۆنی سێیەمی لەهەموو تۆمەتە ئاراستەکراوەکانی ڕاگەیاندو حوکمی دوورخستنەوە بۆ گالیای بەسەر تۆمەتبارکەرەکانیدادا.

لەسایەی ئەو ڕووداوانەدا پاپا بەرامبەر بەو کارەی شارلەمان بەڕاگەیاندنی تاج لەسەرنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژئاوایی بەشێوەیەکی ڕەسمی شەرعی بۆ

شارلەمان دەستگرۆیی شارلەمانی کرد، ڕۆژی ٢٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٨٠٠ز. بەراگەیاندنی ڕەسمی پێدانی دەسەڵاتە بەرفراوانەکانی ئیمپراتۆریەت بەشارلەمان دادەنرێت.

لەڕووداوی هەرە دیاری هەموو ئەمانەش پێشڕەوی پاپایە بۆ کاری کتوپڕی شارلەمان کە بەبێ شارەزابوونی پێشتری بڕیاریدا تاج بنێتە سەر سەری شارلەمان، ئەوەش لەکڵێسای قدیس بوترس لەڕۆما ڕوویدا پێچەوانەی نەخشەکانی شارلەمان بوو، لەژێر بانگەشەی ئەوەی بەبێ هیچ منەتێك یان ئاراستەیەك تاجی ئیمپراتۆریەتی ویستووە تەنانەت ئەگەر خودی کڵێساش بێت.

لەژێر سایەی ئەو بارودۆخەدا کڵێسای ڕۆما پێشڕەوی دابەشکردنی دەروازەی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان بوو و توانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ فرەنجە بەرەچەڵەك بەربەریەکاندا بەهێز بکات، ئەمەش لەبەر بەرژەوەندیو بوونەکان، بەتایبەت کە توانییان ئەو مەترسیە لۆمباردیە لەناوببەن کە هەڕەشەی لەکڵێسا دەکرد، لەکاتێکدا بێزەنتیەکان بەرامبەر بەکڵێسا هەڵوێستیان لاواز بوو، ئیتر لەسەر ئاستی بەرەنگاربوونەوەی مەترسی لۆمباردی بێت یان لەسەر ئاستی هەڵوێستیان سەبارەت بەناوچەکانی قەڵەمڕەوی کڵێسا. بەوجۆرە ئەورووپا لەسەر ئاستی سیاسی بەتەواوەتی بوو بەمەسیحی، بەڵام بۆ دوو بەش دابەش ببوو، ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لەڕۆژهەڵات کە قوستەنتینیە پایتەختی بوو، ئیمپراتۆریەتی فرەنجی بەڕێبەرایەتی شارلەمان لە (ئیکس لاشایل) لەگالیا پایتەختی بوو.

لەڕاستیدا ئەو بارە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ڕێکردەی مێژوویی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کە بێزەنیەکان بەچاوی مافی شەرعی خۆیانەوە سەیریان دەکرد، ئیمپراتۆریەتی کارۆلینجیش هەموو ئەوانەی گرتەوەو قەڵەمڕەوی ئایینیو سیاسیشی لەبەشی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتەکەدا لێداماڵین.

لەهەموو ئەمانەش گرنگتر ئەمە لەبەرژەوەندی شارلەمان بوو کە بەپێی نەریتە شەرعییە ئایینیەکان پایەی ئیمپراتۆری هەبوو، بەو پێیەی لەلایەن باڵاترین

دەسەڵاتی نێو جیهانی مەسیحییەوە کە پاپا لیۆنی سێیەمە تاجی لەسەرنراوە، کڵێسای ڕۆما لەلایەن خۆیەوە چەند بڕوبیانووی لەدەست بوو تا بداتە پاڵ فرەنجەکان، چونکە بەرەو ڕووی هاتنە سەر دەسەڵاتی ژنە ئیمپراتۆر (ئیرین) بوویەوە.

بەدوای ئەمەدا چەند ڕووداوێکی پەیوەست بەلادانی ئیمپراتۆری شەرعی ڕوویدا، بیانووی تریش لەو باری نارەزایانەدا بوو کە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی بەرامبەر بەماڵو موڵکی کڵێسای ڕۆمانیو قەڵەمڕەوی بەسەر هەموو کڵێسانی دیکەی جیهانی مەسیحی نیشانی دەدا. سەرەڕای ئەمەش ڕاقەی بیروباوەڕی لەتوندکردنەوەی ناکۆکیەکەدا ڕۆڵی کارای خۆی هەبوو، بەتایبەت لەبواری توندکردنەوەی بزووتنەوەی نائایقۆنی لەلایەن بێزەنتییەوە کە وای لەڕۆما کرد گرنگی بدات بەئایقۆنو هێما کڵێساییەکان.

گۆڕانی هەرە گرنگی لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی فرەنجی خۆی لەگۆڕانی پەیوەندییەکانی فرەنجی کڵێسایدا دەبینییەوە، جا دوای ئەوەی هاوپەیمانی خەسڵەتی زاڵی پەیوەندی نێوانیان بوو، کڵێسا دوای ساڵی ٨٠٢ز. تەنها ملکەچی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری بوو و بەس، پاپا ژێردەستەیەکی هەواداری ئیمپراتۆرو وەك ئەو سوێندی هەوادارییە بوو کە هەمووان لەژێرسایەی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتدا پێشکەشیان دەکرد، لەڕاستیدا سوێندەکە لەنەریتی دەرەبەگی دەرنەدەچوو، کەسی شوێنکەوتە سوێندی دڵسۆزیو وەفاداری بۆ میری دەرەبەگ دەخوارد.

وێڕای ئەو چوارچێوە شەرعیەی کە شارلەمان لەپایەی ئیمپراتۆریەتەکەیدا هەیبوو، بەڵام بەردەوام بەوپەڕی هەوڵەوە دەیویست ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دانی پێدابنێت بۆئەمە پەنای بردە بەر دوورکەوتنەوە لەهەر بەریەککەتنێك لەگەڵیاندا، تەنانەت ئەگەر لەبواری نازناوە ئیمپراتۆرریەتەکاندا بێت، یان لەسەر ئاستی بەرەنگاربوونەوە سەربازییەکان بێت، بەڵکو هەوڵیدەدا لەڕێگەی هاوسەرگیری

لەگەڵ ژنە ئیمپراتۆر ئیرین بەهۆی چەند کەسێکی نێوەندەوە لەوانە خودی پاپا کە چوویە داوای بۆ شارلەمان، هەوڵیدەدا لەبیزەنتیەکان نزیك بێتەوە، ئەگەر ئەو شۆڕشە نەبوایە کە لەساڵی ۸۰۲ز. دژ بەئیرین ڕاگەیەندرا ئەوا هەوڵەکان بەرهەمدار دەبوون، بەڵام خەزنەدار لەژێر ناوی (نقفوری یەکەم) پایەی ئیمپراتۆری گرتە دەستو خێرا دوژمنایەتی ڕەسمی خۆی بۆ کڵێسای ڕۆماو ئیمپراتۆریەتی فرەنجی ڕاگەیاند، ئەمە سەرەڕای ئامادەنەبوونی پێدانی سەرانە بەموسڵمانان لەماوەی دەسەڵاتی خەلیفە هاروندا، هەروەك مەترسی بولگارەکان بەڕێبەری کرۆمی سەرکردەیان و سەقلەبەکان فشاری بۆسەر ئیمپراتۆری نوی زیادکرد، بەڵکوو کۆتایی ئیمپراتۆری ڕۆمانی لەساڵی ۸۱۱ز. لەسەر دەستی کرۆم بوو و دوای ئەویش زاواکەی (میخایلی یەکەم) (۸۱۱ز-۸۱۳ز) بوو بەئیمپراتۆر، لەماوەی دەسەڵاتیدا بەرەسمی دانی نا بەرەوابوونی دەسەڵاتی شارلەماندا، ئەمەش لەساڵی ۸۱۲ز. دابوو.

بەمردنی شارلەمان لەساڵی ۸۱٤ز لویسی تەقی کوڕی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری گرتەدەست، ئەم کوڕە لەبەرچاو باوکیدا توانای ژیری و سیاسی و سەرکردایەتی نەبوو، ئاراستەو کارەکانیشی جەختکردنەوەبوو لەسەر قووڵکردنەوەی کاریگەری کڵێسا لەسیاسەتی گشتی ئیمپراتۆریەتدا تا قەڵەمڕەوی فراوان و گەورەی (بندکت) دەرکەوت و کەوتە هاندانی ئیمپۆاتۆر تالەساڵی ۸۱٦ز. لە (ئێکس لاشایل)ی پایتەختی کوڕی کڵێسایی ببەستێت، بەمە کڵێساو پاپا توانی لەو دەسەڵات و قەڵەمڕەوە ڕزگاری ببێت کە ئیمپراتۆر شارلەمان بەسەریدا دەیسەپاند.

بارەکە لەو سنوورەشدا نەوەستا، بەڵکوو پاپا ڕایگەیاند بەپیرۆزدانانی تاجنانە سەر ئیمپراتۆر کارێکی زۆر گرنگ و بنەڕەتییە لەچوارچێوەی بەدەستهێنانی شەرعیەتدا، پاپا ئیتنی چوارەم لەساڵی ۸۱٦ز. لەئاهەنگی تاج لەسەرناندا ئەمەی وت:

(کۆمەڵێك هۆكار بوونە هۆی دەركەتنی باری لاوازی لەئیمپراتۆریەتدا، لەوانە دەركەتنی بەرهەڵستكاری لەلایەن ئیمپراتۆر لۆتەری كوری لویس تەقی و ژنی ئیمپراتۆر كە دایكی (شارل الأصلع) بوو، لەگەڵ ئەوەی شارلی بوو كەوتە داوای چەسپاندنی مافەكانی ئەو كوڕە لەمیراتگری ئیمپراتۆریەتدا.

ئەو شكستانەی لەدانیمارك و ولاتی دانوبدا دووچاری سوپای لویس تەقی بوون، كاریگەری خراپیان لەسەر دەروونەكان هەبوو، ئەمە سەرەرای دەركەوتنی برسیەتی و نەخۆشی ت ابارەكە خراپتر بكەن، بەڵكوو پیاوانی ئایینی بەشێوەیەكی راشكاوانە گرنگی كڵێسایان بەسەر رۆڵی دەسەلاتی سیاسی ئیمپراتۆرەوە رادەگەیاند، ئیمپراتۆریش لەتێوەگلانی پشێویەكە بەدوور نەبوو و دواجار ملكەچی ئەو فشارانە بوو كە هاوسەرەكەی لەڕوویدا پەیرەوی دەكرد. بەوە چەند هەرێمێكی فراوانی ئەڵمانیاو ئەلزاس و بەرگەندیای دا بەشارل ئەسلەعی كوڕی، لەئەنجامی ئەم كارەیدا هەموو ئەوانەی ئەمەیان بەتووندكردنەوەی دابەشكردنی ئیمپراتۆریەت لەنێوان میراتگراندا دەزانی تووڕەو بێزاربوون.

لەگۆڕانێكی دیكەی مەترسیداردا شۆڕشی ساڵی ٨٣٠ز. ڕوویدا كە تیایدا لۆیر توانی دەسەلات بگرێتە دەست خۆی و دەسەلات بەسەر باوكیدا بچەسپێنێت و بیخاتە ژێر نیشتەجێبوونی بەزۆرەوە، بەلام لویس تەقی توانی لەساڵی٨٣١ز. بەیارمەتی پیاوانی ئایینی بگەڕێتەوە، بەمە سەرلەنوێ ململانێی نێوانیان بەهۆی خراپبوونی دابەشكاری میراتگری ئیمپراتۆریەتەوە گەڕایەوەو تامردنی لویس تەقی لەساڵی ٨٤٠ز. بەردەوامبوو، بەوجۆرە لۆیر داوای هەموو وەپیرۆزدانانێكی بەئیمپراتۆر بوونی دەكرد، لەلایەن چەند پشتیوانێكی یەكەی زەوی ئیمپراتۆریەت و بەتایبەت پیاوانی ئایینی و چینی ئەرستۆكراتییەوە پاڵپشتی كرا.

ئەمەش بەهۆی ئەو سودو بەرژەوەندییەی هەیانبوو، بەلام بارودۆخەكە ناجێگیربوو و ململانێی و ڕكەبەری بەسەردا زاڵبوو تائەوەی ساڵی ٨٤٣ز. كۆنگرەی (فردان) بەستراو تیایدا ئیمپراتۆریەتی لەنێو برایاندا دابەشكرد بەمجۆرە:

پشکی لوئیر لەئیتالیاو فریزو چەند ناوچەیەکی سەرونو ڕاین بێت، لویسی جەرمانی ناوچەی سەر بەرەی ڕاستی ڕووباری ڕاین، شارل ئەسلەع هەموو ناوچەکانی ڕۆژئاوای ناوچەی قەڵەمڕەوی لوئیر بەم کۆنگرەیە ئیمپراتۆریەتی کارۆلینجی بەرەو ڕووی کۆتاییهاتن بوویەوە دوای ئەوەی بوو بەچەند دەوڵەتۆکەیەکی بچووک کە ویستو ئارەزوو دایگرتبوون، بەڵام ئەو بنەڕەتەبوو کە دواتر دوو گەلی هەرە دیاری ئەوروپی لەسەر دەرکەوتو هەرکام کاریگەرییەکی گەورەیان لەمێژووی نوێی ئەورووپیدا هەبوو، ئەوانیش ئەڵمانیاو فەرەنسابوون.

********************

# (باسی شەشەم)

# (گۆڕانکارییەکانی ژیاری ئەورووپی لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا)

## *دەرەبەگ:

سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست بەسەردەمی دەسەڵاتداری دەرەبەگ دادەنرێت لەهەموو بوارەکانی ژیانی ئابووریو سیاسیو هزریدا. دەرەبەگ وەك دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیو ڕامیاری ناکرێت مێژوویەکی دیاریکراوی بۆ دابنرێت، چونکە شێوەیەکە لەشێوەکانی ئەو مێژووە مرۆییەی کە تێکەڵ بەقۆناغە مێژووییەکانی پێش خۆیو دوای خۆیشی بووە.

بەڵام مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەرەبەگ لەئەنجامی داڕمانی دەسەڵاتی مەرکەزییەوە دەرکەوتووە، کاتێك سەرۆك هەرێمەکان دەسەڵاتی ناوچەکانیان بەتەنیا بۆ دەمایەوەو چەند دەوڵەتۆکەیەکی سەربەخۆی جیا لەدەسەڵاتی مەرکەزییان دادەمەزراند. دەرەبەگ لەفەرەنسا لەسەردەمی میرۆفنجیو کارۆلینجییەکان دەرکەوت، دوای ئەوە لەئەڵمانیاو وڵاتەکانی دیکەی ئەوروپا دەرکەوتو لەماوەی نێوان سەدەی یانزەو دوانزەدا گەشتە قۆناغی پێگەیشتن.

گەشەسەندنی ئەو لایەنە ناوچەییە هەرێمییەو نەمانی دەسەڵاتی مەرکەزی، بەتایبەت دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، یەکێك لەو هۆکارە سەرەکیانە بوون کە دەبوونە هۆی دەرکەوتنی دەرەبەگ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی پاشا کارۆلینجیەکانو پێش ئەوانیش میرۆفنجیەکان چەند ڕووبەرێکی فراوانی زەوییان بەسەر شوێنکەتەکانیاندا دابەشدەکرد، بەتایبەت شارل مارتل کە هەوڵیدا سوپاکەی بەهێزبکات، بەتایبەت هێزی سوارە تایبکاتە هێزێکی کارای نێو مەیدانی جەنگ. جا تۆماری ناوی جەنگاوەرانی کردو زەوی پێویستی بۆ بڕینەوە، دوای ئەوەی هەمووان سوێندی هەواداریان بۆ دەخوارد، ئەو دەرەبەگانە بەردەوام لەدەوروبەریدا بوونو خزمەتی سەربازییان بۆ ئەنجام دەدا، بەڵام ئەمە بەپێیەڕبوونی کات بوو بەموڵکێکی میراتگری ئەو خێزانانە.

هەروەك پاشا کارۆلینجیەکان زۆر ئەرك و کاری دەسەلاتی مەرکەزیان دەدایە دەست نوێنەرەکانیان لەهەرێمەکاندا، ئەمەش لەگەڵ بنەمای دابەشکردنی ئیمپراتۆریەت لەنێو نەوەکانیاندا دەگونجا، کە لەمەوە سیستمی دەرەبەگایەتی دامەزرا، هەروەك لێبوردنیان بۆ دەرەبەگە گەورەکان دەردەکرد، بەمە زەوییەکانیان دووربوون لەدەست تێوەردانی دامەزراوە دادگایی و داراییەکانی دەوڵەت، ئیتر بەتێپەڕبوونی کات فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمانەیان دەکرد، دواجار ئیمپراتۆر نەیتوانی ڕێبگرێت بەشالاوی هۆزەکانی باکوورو دامەزراندنی دەرەبەگەکان وەك سیستمێکی بەهێزی هێزە ناوچەییەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو شالاوانە، ئەمە هۆکارێکی دیکە بوو بۆ گەشەسەندنی دەرەبەگ و قەڵەمڕەوەکەی لەهەرێمە جیاجیاکاندا.

بەوجۆرە خاکی نێو شانشینی فرەنجی بوو بەماددەیەکی شیاوی کڕین و فرۆش کە خاوەندارێتییەکەی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە بگوازرێتەوە، خاوەن زەوییەکان لەسەر حسابی ئەو زەوییە جوتیاریانەی کە باری خاوەنەکانیان بەهۆی جەنگە زۆرەکان و باج و سزادانەکانی سەریانەوە دارمابوو و ناچار بەوە ببوون زەوییەکانیان بەجێبهێڵن و ببنە جوتیار لای دەرەبەگەکان، فراوانخوازییان بەزەوییەکانیان دەکرد، کڵێساش ڕووبەرێکی فراوانی زەوی هەبوو بەپێپەڕبوونی کات جوتیار پەیوەست بەو زەوییەی دەبوو کە کاری تیادا دەکرد، بەمە دەبوو بە (کۆیلە).

لەماوەی دەسەلاتی کارۆلینجیەکاندا چالاکی جەختکردنەوەی زەوییەکان لەدەست دەستەیەکی موڵکداراندا بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەمەدا جوتیاران خاوەندارێتی زەوییان لەدەستدەدا، ئەمە وایکرد زیاتر شوێنکەوتەی خاوەن زەوییەکان بن، کێشی ئەو خاوەن زەوییانە گەشتە ئاستێك شارلەمان بۆ کۆڕی سالانە بانگی دەکردن تا لەسەر باس و خواسە گرنگەکانی پەیوەست بەئیمپراتۆریەتەکەی پێکەوە مشتومڕ بکەن.

سەرەڕای ئەمەش شارلەمان ناچاربوو ڕێ بەکارمەندانی نەدات تاسەردانی زەوی و موڵکی دەرەبەگەکان بکەن (باج نەدان)، هەروەك مافی دامەزراندنی دادگای تایبەتی و کۆکردنەوەی باج لەجوتیارانی ژێردەستی خاوەن موڵکەکانی بەخاوەن موڵکەکانی بەخشی، ئیدی ئاسایی بوو ئەم کارانە وابکەن جوتیار پەیوەستی دەسەڵاتیان ببێت و سوارەکان لەجیاتی شوێنکەتەی ڕاستەوخۆیان بۆ ئیمپراتۆر شوێنکەوتەی ئەوان بێت و سوپای ئیمپراتۆری ببێتە یەکبوونی سوپای دەرەبەگەکان، دەرەبەگەکانیش چەند دەسەڵاتێکی فراوانی سیاسیان لەخاکی خۆیاندا هەبوو، سەرەڕای بوونی سوپایەکی تایبەتی سوارە.

زەوی یەکەی بەرهەمهێنی بنەڕەتی نێو سەدەکانی ناوڕاست بوو، بۆ دوو بەش دابەش دەبوو، بەشێك هی دەرەبەگ بوو کە پێی دەوترا (دۆمین) بەشێکی دیکەی جوتیار ئیشی تێدا دەکرد لەبەرامبەر بەخششێکی دارایی و ئەرکێك لەبەرژوەندی خاوەن زەوی بەجێبگەیەنێت.

لەسەدەی یانزەی زایندا دەرەبەگەکان لەجیاتی پشکی عەینی پارەیان هێنا، ئەمەش لەزۆربەی ناوچەکاندا وابوو، جوتیاری نێو دۆمین بۆ دوو دەستە دابەش دەبوو، جوتیارە ئازادەکان و کۆیلەکان کۆیلە پەیوەست بەزەوی بوو نەیدەتوانی بەجێی بهێڵێت و مافی هاوسەرگیریشی نەبوو بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی نەبێت یان وەسیەت بکات بۆ کەسێك کە ئەو زەوییەی دوای مردنی دەبێت زەوی دەرەبەگی بگێڕێتەوە بۆ میراتگرەکە دوای ئەوەی چاکترین شتەکانی ناو زەوییەکەی دەبرد بەرامبەر بەپێدانی زەوی مردووەکە.

جوتیارە ئازادەکان باریان لەکۆیلەکان باشتر نەبوو، لەڕوانگەی شێوەییەوە کەسێك لەو دەستەیەدا بوایە بەکەسێکی ئازاد دادەنرا، لەکاتێکدا بەشێکی گرنگی بەرهەمی خۆی بەخاوەن زەوی بەخشی لەماڵی خاوەن زەویشدا خزمەتی دەکردو لەخەرجی شوکردنی کچەکەشیدا یان چەندین بۆنەی دیکەدا بەشداری دەکرد، بەمە ئازادییەکی وای نەبوو.

لەڕووی کارگێڕیشەوە زیاتر لەدەوڵەتێکی بچووکی ناو دەوڵەتێکی گەورە دەچوو کە شوێنکەتەیی بۆ دەوڵەتە گەورەکە هەبێت، دەرەبەگ گەورەی ئەوێ بوو و هەموو مافە ڕامیاری و دادوەرییەکانی لەدەست بوو، دەیتوانی جوتیارانی ئیشکەری ناو زەوییەکەی دادگای بکات یان لێیان خۆش بێت یان لەسێدارەیان بدات، دژ بەدەرەبەگی دیکە بچێتە جەنگەوە، خودی ئەو دەرەبەگەش شوێنکەوتەی دەرەبەگێکی گەورەتر لەخۆی بوو، بەوجۆرە زنجیرەی شوێنکەوتەی دەچوو تا خودی شا کە لەلوتکەی هەرەمی دەرەبەگیدا دەوەستا.

ئەو بارە تەنها بۆ دەرەبەگە دنیاییەکان نەبوو، بەڵکوو سیستمی وا لەماڵ و موڵکی کڵێساشدا زاڵبوو، لەنێو هەرەمی دەرەبەگیشدا گەورە (تیجان)ەکان وەك شاو دۆقەکان هەبوون، ئەوانە چینی باڵای دەرەبەگی بوون، مافی ڕاگەیاندنی جەنگ و لێدانی دراوی تایبەتی خۆیان هەبوو، دوای ئەوان بەپێی هەرەمی دەرەبەگی (بارۆن) دەهات کە خاوەن موڵکی چەند زەوییەکی فراوان بوو کە دەگەیشتە دەیان زەوی و چەند دەرەبەگێکی بچووکتر شوێنکەتەی بوون، سوارەکان لەپلەی خوارووی هەرەمەکەدان کە چەکهەڵگرەکان شوێنکەتەیان بوون، ئەوانیش بەتێپەڕبوونی کات دەبوون بەسوارە.

هەموویان چینی خانەدانەکانیان پێکدەهێنا کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتداربوون، پاشان جوتیارە ئازادەکان و کۆیلەکان هەبوون کە ئەرکی چالاکیە بەرهەمهێنەکانی نێو کۆمەڵگەی دەرەبەگی لەسەر شانی ئەوان بوو.

کەسی شوێنکەوتە دەبوو چەند خزمەتگوزارییەکی دیاریکراو پێشکەش بەگەورەکەی بکات، لەپێش هەموویانەوە خزمەتگوزاری سوپایی بوو بۆ ماوەی زیاتر لە چل ڕۆژ لەساڵێکدا، هەروەك لەکاری دادگا تایبەتییەکەی یان دەرباریدا خزمەتیان دەکرد، ئەمە سەرەڕای پێشکەشکردنی ماڵ و سامان لەشێوەی باجدا کە گرنگترینیان باجی میراتی بوو، جا لەکاتی مردنی کەسی شوێنکەتەدا بارۆن زەوییەکەی دەگێڕایەوەو دواتر بەبڕێك پارە دەیدا بەکەسی میراتگر.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە سیستمی دانیشتنی نێوان دەرەبەگ و شوێنکەوتە بەبۆنەیەکی تایبەت دەبوو کە تائاستێك دەرەبەگەکانی وڵات لەسەر خاڵەکانی یەکدەنگ دەبوون، کەسی شوێنکەتە لەسەر هەردوو ئەژنۆی لەبەردەم گەورەکەیدا چۆکی دادەدا وەك ملکەچی نواندن بۆی، دەستی دەخستە ناو دەستی گەورەکەی بەواتای ئەوەی هەموو ئەرکەکانی داوەتە دەست ئەو، سوێندی هەواداریو دڵسۆزیشی بۆ دەخوارد، بارۆنیش دوای ئەوە مشتێك خۆڵی وەك هێمای زەوی لەگەڵ گەڵای دارێك وەك هێمای دارستانی ناو ماڵو موڵکی دەدا بەکەسی شوێنکەوتە، لەگەڵ مۆرێكو گاڵۆکێك کە هێمای پیرۆزدانانی رۆحی ڕێککەتنەکەبوون.

قەڵا دەرەبەگییەکان لەماوەی سەدەکانی دەیەمو یانزەیەم لەئەورووپای ڕۆژئاوایدا بڵاودەبوونەوە، وەك کۆشکی دەرەبەگی وابوون، لەسەرەتادا لەدارو تەختەو لەدوو قات لەشێوەی بورجێك دروست دەکرا کە دەرەبەگو خێزانەکەی لەقاتی دووەمیدا دەژیانو قاتی یەکەمیش کۆگای دانەوێڵەو ئاژەڵەکان بوو، جگە لەبوونی شوێن بۆ خزمەتگوزاران.

لەسەدەی یەکەمەوە قەڵاکان لەبەردو لەچەند ناوچەیەکی بەرزدا بەچەند قاتێك کە دەگەیشتە پێنج قات بنیاد دەنرانو شورایەك یان دوو شورای بەردینو خەندەقێکی قووڵ لەدەوریدا بوونو پردێکی جوڵاویش هەبوو کە لەکاتی باری مەترسیدا دەکرا بەرز بگرێتەوەو دواتر خانووەکان لەناو شورەکانی قەڵاکەدا بنیاد دەنران تا دانیشتوانی گوند لەکاتی هێرشکردنە سەریان پەنای بۆ ببەن.

بەوجۆرە قەڵایەکی دیاری نێو هەژرانی گوند بوو و بۆ هێرشبەران سەخت بوو بەبێ تۆپو چەکی ئاگرین داگیری بکەن، بەڵام هێرشبەرانیش زۆربەی جار لەهەموو لاکانەوە گەمارۆی قەڵاکەیان دەداو ڕوویان نەدەدا هیچ یارمەتییەك بەگەمارۆدراوانی ناوەوە بگات، ئەگەر گەمارۆکە بۆماوەیەکی زۆر بەردەوام بوایە، گەمارۆدراوان ناچار دەبوون خۆبەدەستەوە بدەن. سەردەمی دەرەبەگی پڕبوو لەجەنگو ململانێی دەرەبەگایەتی کە سوارەکان هەڵیاندەگیرساند، سوارەکان جگە

لەجەنگ و سەرکێشی هیچ ئیشیکی دیکەیان نەبوو، سوار چەکداربوو چەکەکەیشی شمـشێرێکی درێـژو قـوورس و تـەوەرێك بـوو، هـەروەك گرنگـی بـەپێناوەکانی بەرگریکردن دەداو قەڵغان و جلی قەڵغانی دەپۆشی، بۆیـە جوڵـەی قوورس بوو وەك ئەوەی قەڵایەکی ئاسنینی جوڵاو بێت. بەڵام دامەزراوەی سوارەکان دوای دامەزرانی سوپای نیزامی پاشایی و گەشەسەندنی ڕۆڵـی پیـادە لەجەنگدا بەرەبەرە گرنگی خۆی لەدەست دەدا.

*******************

# سەرهەڵدانی شارەکان

کۆمەڵگـەی ئـەورروپی مـاوەی پێـنج سـەدەی یەکـەمی نیـوەی سـەدەکانی ناوەڕاسـت لەسـەر شـێوە سـەرەتاییەکەی خـۆی بـەبێ گـۆڕان مایـەوە، تاسـەدەی یانزەهـەم هـات و چـەندلایەنێکی نـوێ هاتنـە نێـو بنـەڕەیی سیـستمی کۆمەلاَیـەتی ئەورووپییەوەو قەرەباڵغی و چالاکییان زیاتر کرد، دیارترینیـان دەرکـەوتنی شـارەکانە کە کۆمەڵە خەڵکێکی لەخۆدەگرت کە پێناوی ناکشتووکاڵییان کردبوو بەپیشەی خۆیـان و بڕیاریانـدا پێنـاوو ڕێگـەکانی ژیـان و خۆشـگوزەرانی زیادبکـەن و بەرامبـەر بەخاوەن موڵکەکەو موڵکە گەورە خۆسەپێنەکانی چەندین نەوەی پێشوو ڕابوەستن.

سـەرەتاکانی سـەرهەڵدانی شـارەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕۆمانـەکان، شـارەکان سەرەتا وەك چەند پەناگەیەکی توندو تۆڵ و دڵنیا وابوون کە بەشورە دەورەدرابوون وەك جۆرێك لەخۆپاراسـتن، هەنـدێ پاشـاو قەشـە دەیـانکردە پەناگەیـەکی ئـارامی خۆیان، سەرەتا چەند شارێك دامەزران دوای ئەوەی جوتیارانی خانەدانە گەورەکان چـەند شـوێنێکی تایبـەتیان بـۆ نیـشتەجێبوونی خۆیـان لـەپاڵ قـەلاَکانی ئـەو خانەدانانـەدا دامەزرانـد، جگـە لـەوەی ئـەو شـوێنانە سەرچاوەی پاراسـتنی ئـەو جوتیارانە بوو لەهەر مەترسییەك کە هەرەشەیان لێبکات، بەتێپەڕبوونی کات تیایدا بازرگانی و پیشەسازی گەشەی سەند بەتایبەت پیشەسازی کەرەستەکانی جەنگ، هەروەك هەندێکی دیکەیان لەدێرەوە سەریانهەڵدان خەڵکی لەژێر سایەی خاچ یان کڵێسادا خۆیـان پـەنادا، پێدەچێت هـەموو ئـەو هۆکارانـە پێکـەوە ببوونـە مایـەی دامەزراندنی شارەکان.

لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا شارەکان بەشێوەیەکی تایبـەت لەلایـەن پیاوانی کەهەنوتـەوە بـۆ زیـادکردنی بـەهای زەوییـەکانیان بنیـاددەنران، هـەروەك کۆیلەو ژنیان بۆ دەهێنا تا هاوسەر بۆ دانیشتوانەکانی ئامادە بکەن.

شـورەکانی شـارەکان چـەندین دەرگایـان هـەبوو، خەنـدەق یـان ڕووبـارێکیش لەدەرەوە چـواردەوری شـورەکانی دەدا، لەناوخۆشـەوە شـەقامێکی پـان هـەبوو کـە

دەکرا بەرگریکاران لەدەرگایەکەوە بۆ دەرگایەکی دیکە بچن، لەسەر شوورەی شارەکانیش چەند بورجیکی بەرگریکاری هەبوون تالەکاتی هەر هێرشێکدا بەرگری لێبکەن، شەقامە ناوخۆییەکان بەرتەسک بوون و خەرجی ئامادەسازییان لەسەرشانی دانیشتوان بوو، نەدەکرا شەخەڵ فڕێ بدرێتە نێوەندی شەقامەوە، چونکە قەدەغەبوو، خانووەکانی شارەکان زۆربەی جار لەدارو تەختە دروستدەکران، لەنێوەندی شاریشدا کڵێساو گۆڕستان و بازاڕ هەبوو.

ژیانی شارەکان بەشێوەیەکی گەورەو زۆر ڕێکخراو بوو، ئەوانەی یەك پیشەیان هەبوو لەیەك ناوچەو گەڕەکدا دەژیان و یاری پێ و سەماو بازدان و پێناوی دیکەیان هەبوو، هاوارکەرانیش شەقامەکانیان داگرتبوویەوە، هەرکەس بیویستایە شتێکی دیاریکراو بفرۆشێت، هاوارکەرێکی بەکرێ دەگرت یان قەشەیەك لەشەقامەکاندا دەسوڕایەوە تا داوای پشکی خوا بکات، کەسێك خەڵکی بانگ دەکرد تابچن لەحەمامەکەیدا خۆیان بشۆن، کەسێك هەبوو تەنها هەواڵی مردن و پرسەی بڵاودەکردەوە، هەرکەسەو بۆئەوەی شتێك بەخەڵك ڕابگەیەنێت، دەچوو هاوارکەرێکی بەکرێ دەگرت.

هەموو دانیشتوانی شار کۆمەڵێك ماف و ئازادییان هەبوو کە زۆر لەوەی جوتیاران زیاتر بوو، چونکە ئەو هەموو شۆڕشەی لەشارەکاندا بەدرێژایی سەدە یەك لەدوای یەکەکان ئەنجامدەدران بوونەهۆی ئەوەی شارەکان چەند دەستورێکی تایبەت بەدەستبخەن، کاروباری شار بەپێی ئەو دەستورانە ڕێکدەخرا، سەندیکاکان دەمەزران و پەیوەندی نێوان دەستەیەکی هاوپیشەیان دیاریدەکردو بەڕێوەیان دەبرد، بەڵکوو بارەکە گەیشتە دیاریکردنی کاری تاك لەناو دەوڵەت و شاردا.

بازاڕەکان هەفتانە یان نیو هەفتانە دادەنران، سەرەڕای ئەمەش ناڕەزایی جارناجار لەشارە کەناراوییەکان یان شارە بازرگانییەکانی دیکەدا سەریهەڵدەدا، ئەمەش بەمۆڵەتی شا بوو، لەبەرئەوەی بازرگانی بێ بەربەست و گرفت نەبوو، چونکە کەمی ڕێگەی دڵنیاو باجی زۆر کە لەبازرگانان دەسەنرا بۆ خانەدانەکان، سەرەڕای جۆراوجۆری دراو. کڵێساش دەستیوەردەدایە دیاریکردنی نرخی شمەکەکان، کڵێسا بەپێی تێچوونی کارو پاداشتێکی بەبار کە قازانجی

دەستکەوتووی بازرگان بوو نرخەکانی دیاری دەکرد، بازرگان بەپێی هەوڵ و کاتی بەکارخراو لەبەرهەمهێنانی شمەکدا بەبێ وابەستەبوون بەرێژەی خواست و خستنەڕوو و بەبێ ئازادی سەپاندنی نرخی جێ ئارەزووی خۆی بەسەر کڕیاردا کاری دەکرد، بازرگانان زۆربەی جار پەیوەستی ئەم کۆتا نەبوون.

بەوجۆرە بزووتنەی بنیادنانی شارەکان پێشڕەوی کرد، بنەڕەتی پێکهاتنی زۆربەی شارەکان شۆڕشی دژ بەخانەدانە دەرەبەگەکان بوو کە لەباشوورەوە بەرەو باکوور دەستیپێکردو لەباشوورەوە بەرەو فەرەنسا بڵاوبوویەوە، لەوێشەوە بەرەو حەوزەکانی ڕووبارە گەورەکان، دەستەی ئەندازیاری لەشارەکانی بەلتیق پێکهات دەسەڵات بەرەبەرە لەدەست چینی خانەدان و سوارەکانەوە دەکەوتە دەست سەرمایەدارانی ناو شارەکان، لەدەرەبەگەکانەوە بۆ بازرگانان، بەوجۆرە خەڵکی شارەکان بەڕێبەری بازرگانان بەسەر گوندەکاندا کە خانەدان و دەرەبەگەکان فەرمانڕەوایان بوون سەرکەوتن، بەپێیەڕبوونی کاتیش سامان و زانست و هێزی جەنگی و سەربازی شارەکان سەرکەوت بەسەر گوندەکانداو گوندەکانیش لەبەردەم پێشڕەوی شارەکاندا دەستەوسان وەستان و دەسەڵاتیان کەمیکرد، بەپێی زۆربوونی شارەکانیش قەڵەمڕەوی شارنشینەکان زیاتر دەبوو.

کۆمەڵگەی ئەورووپی لەسەدەکانی ١٢و ١٣ز. دا گەیشتە لوتکەی ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست، هێشتا زۆربەی فەیلەسوف و مێژوونووسان پێیان وایە دەستەی کۆمەڵایەتی لەو ڕۆژگارەدا گەیشتۆتە پلەیەك کە پێناوەکانی ژیان تیایدا هاوسەنگ بوون و بەشێوەیەکی کەم نموونەی وا لەمێژوودا بینراوە، چونکە ژیان لەو کاتەدا لەڕووی ڕێکخستن و ڕۆشنبیری کشتوکاڵی و پیشەسازی و ئابوورییەوە تێکەڵ و مامناوەند بووە. بەڵام پێش ئەوە ژیاری کشتوکاڵی و ئاینی بەسەر واقیعی کۆمەڵایەتیدا زاڵبووە، جیهان لەگەڵ سەرهەڵدان و پێشکەوتنی شارەکاندا بەتوندی بەرەو ماددیگەرایی و بزاوتی خۆشگوزەرانی جۆراوجۆری جوانی وا چووە کە لێرەدا ئەوەی بەپێویستی دەزانین باسی ئەو کاریگەرییە بکەین کە لەئەنجامی گەشەسەندنی شارەکانەوە لەدوو لایەنی ژیاندا ڕوویدا:

## *لایەنی سیاسی:

شارەکان کەوتنە هاندانی هەنگاونان بەرەو دەسەلاتی خۆیی و بوونەهۆی بەهێزکردنی پایەی پاشایەتی و بەتەواوەتی دەرچوون لەدەسەلاتی دەولەت و دەرەبەگی زالبوو بەسەر ئەو مرۆڤانەدا، چونکە بەرەنگاربوونەوەی دەرەبەگەکان لەگەڵ خەڵکی شاردا ڕقێکی توندو ئارەزووی دەربازبوون لەدەستی ئەوان و حەزی سەربەخۆیی لەدەرونیاندا هێنایە کایە، ئیتر هەموو شارێك سەرقالی کڕینەوەی سەربەخۆیی خۆی بوو لەڕێبەرە خانەدانەکانی و بەدەستهێنانی نوسراوو بەڵێنێك لەوبارەوە.

هەندێ شار بەتایبەتی لەئیتالیاو ئەڵمانیادا بوون بەچەند کۆمارێکی نیمچە سەربەخۆی تەواو لەدەرەبەگان و زۆربەی جار بەتەواوەتی لەوان جیاو سەربەخۆ بوون، لەفەرەنساو ئینگلتەراش شارە کەناری و دوورەکان بەخواست بێت یان هەر لەخۆوە بێت یاریدەی پاشاو بەهێزکردنی دەسەلاتەکانی بوون، چونکە ئەوە چاکترین پێناوی چەسپاندنی ئاسایشی ناو ولات بوو، ئاسایشیش بۆ بازرگانی گرنگ بوو و بازرگانیش بۆ خەڵکی شار گرنگترین پیشە بوو.

پاشایش لەو دەرەبەگانە بۆیان باشتر بوو کە هەمیشە لەباری پێکدادانی ناوخۆیدا بوون و جەنگ لایان گەمەیەك بوو بۆ کات بەسەربردن و لایان وەك ڕاوچێتی وابوو، بۆیە شتێکی نامۆ نیە ئەگەر شارەکانی دەوروبەر کە شانشینی بەهێزی خۆسەپێن لەنێویاندا بوو بنەماو هۆکاری بنەڕەتی گۆڕینی سیستمی سیاسی دەرەبەگی بن بەدەولەتی گەورەو حکوومەتی مەرکەزی.

*******************

## *لایەنی رۆشنبیری:

سەرهەڵدانی شارەکان ڕێخۆشکەر بوو بۆ پێکهێنانی دیدێکی نوێی ئایینی و فەلسەفەی نوێی ژیان، کاتێك ئەو کۆمەڵە زۆرە مرۆییە بەیەکسانی لەنێو شورەکانی شاردا تێکەڵ و ڕوبەڕووی یەك دەژیان، بەشێوەیەکی سروشتی پێکدادانی بەرژەوەندییە ماددییەکانی نێوانیان ڕوویداو نەخشەی چارەسەری کێشە نویکانی ژیانی ڕۆژانەشیان دادەنرا، جا هەندێ لەشارنشینەکانیان ئەندێشەی ئەزموونی و سامانی شارە دراوسێکانیان لەڕێی بازرگانییەوە بەدەستهێنا کە جوتیارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لەکێڵگەکانیاندا دەستیان نەکەوت، هەندێکی دی کاری چەك یان پێستە خۆشکردنیان وەرگرت و کردیان بەکاری خۆیان و لەپیشەسازیدا لێزانییەکی باشیان پەیداکرد، بەلاّم گیانی ئەزموون و داهێنان تەنها لەژیانی ماددیدا بەرتەسك نەبوویەوە، بەڵکوو سنووری تێپەڕاند بۆ ژیانی هزری و ڕۆحیش، ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو، چونکە نەوەیەکی مرۆیی ئەگەر بەئازادی هزری خۆی خستەکار بۆ بەدەستهێنانی پێناوەکانی ژیانی ماددی، ئەوکات دەروونی ملکەچ دەبێت بۆ بەکارهێنانی هەمان ڕێگا لەگرفتەکانی ژیانی فەلسەفی و ئایینیدا،، چونکە فەلسەفەو ئایین لەهەموو کات و شوێنێکدا پێناوێکی دەربڕینی نەزەری ئەو ئەزموونانە بوون کە مرۆڤ لەگەشتی ئەم ژیانەیدا پیایدا تێپەڕ دەبێت.

بۆیە کۆمەڵگەی کشتوکاڵی کە لەپێش شارەکاندا هەبوو فەلسەفەیەکی تایبەتی و ئایینێکی هەبوو کە خواستەکانی ئەوی لەژیاندا لەخۆدەگرت، لەکاتێکدا دەبینین کۆمەڵگە چالاکە ئابووریەکان کە دوای کشتوکاڵی هاتن زۆربەی بنەماکانی پێشوویان سەراوژوور کردو چەند هێزێکی نوێیان بۆ جیهان هێنایە کایەوە کە لەگەڵ ناوچەو کەش و هەوای ژیانیاندا بگونجێت.

*********************

# (گەشەسەندنی ژیانی ڕامیاریو ئابووریو هزری)

لەکۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستداو بەتایبەت لەماوەی نێوان سەدەکانی دوانزەو کۆتایی سەدەکانی پانزەهەمدا کە بەماوەی گواستنەوە دادەنرێت، کۆمەڵێك گۆڕانی سیاسیو ئابووریو هزری ڕوویدا کە چەند شوێنەواریکی گرنگی لەسەر ئاستی کیشوەری ئەوروپا بەجێهێشتو بوویە هۆی گواستنەوەی بۆ قۆناغێکی نوێی مێژوویی ئەورووپی، هەڵوەشانەوەی دەرەبەگایەتی لەپێش هەموو ئەو گۆڕانانەدا بوو کە لەئەوروپادا لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕوویداو پێشتریش ئاماژەمان پێدا.

دەزگای سوارچاکی بەدەرکەوتنی سوپا هەمیشەییە نیزامییەکان ڕۆڵی خۆی لەدەستداو موڵکداری نەتەوەیی کە لەئینگلتەراو فەرەنسا لەدەرکەوتنو گەشەسەندندا بوو بەرامبەر دیدی جیاخوازی دەرەبەگەکان دەجەنگا، دەرەبەگەکان دەیانویست لەناوچەکانیاندا خۆیان بنو جیاخوازبن، دادگا پاشاییەکان شوێنی دادگا دەرەبەگیەکانیان دەگرتەوە، بەمە دەرەبەگیەکان چەند پێناوێکی گرنگو پێویستی درێژەدان بەهەژموونی خۆیان لەدەستدا.

شتێکی شاراوە نیە کە جەنگە بەردەوامەکانی دەرەبەگەکان بوونە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆری دەرەبەگەکان، لەوانە جەنگی سەدساڵە لەساڵانی (١٣٣٧ز-١٤٥٣ز) لەنێوان فەرەنساو ئینگلتەراو جەنگی دوو گوڵەکە لەنیوان ساڵانی (١٤٥٥ز-١٤٨٥ز) لەنێوان بنەماڵەی لانکسترو بنەماڵەی یۆرك لەئینگلتەرا، سەرەڕای جەنگە دەرەبەگیەکانی دی کە زیاترین دیاردەی دووبارەبووەی ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست بوو. دەرکەوتنی سوپا نیزامییەکانو زیادبوونی ڕۆڵی پیادەو داهێنانی باروتو بەکارهێنانی تۆپو چەکی ئاگرین گەورەترین کاریگەری هەبوو لە لەناوبردنی بەرگریکاری دەرەبەگایەتیو چەسپاندنی دەسەڵاتی پاشایەتیدا کە چینی نێوەند باشترین هاوپەیمانی بوو لەململانێی دژ بەدەرەبەگایەتیدا.

ئـەو چـینەش فـراوان بـوو و ئابووریەکـەی گەشـەی سـەندو سـامانی ڕوو لەزیادبوون چوو تائەوەی خەزێنەی پاشا پڕ ماڵو سامان بوو، ئەویش لەبەرامبەردا هەوڵدەدا بارودۆخی لەبار برەخسێنیت تائەوی دی چالاکیە ئابووریەکانی پەیڕەو بکات، لەگرنگترین گۆڕانەکانی دیکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە دەرکەوتنی ڕۆڵی شارەکان بوو کە بەرەو وەرگرتنی ئازادی لەدەست هەژمونی دەرەبەگایەتی دەچوو و دەیویست دامەزراوەو یاسای دەرەبەگی وەلا بنێت کە وەك بەربەستێکی ڕێی بەجێگەیاندنی بەردەم گەشەسەندنی سیاسی و ئابووری شارەکان بوو.

شـارە ئەوروپیـەکان بوونـە مەڵبەنـدێکی چـالاکی سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، ژمارەی دانیشتوانی شار بەرزبوویەوە، ئەمە تەنها شارە کۆنەکانی نەگرتەوە، بەڵکوو چەند شارێکی نوێ لەکیشوەری ئەرووپیدا دەرکەوتن بەتایبەت لەبەشی ڕۆژئاوایدا، ئەمەش لەکۆتایی سەدەی یانزەهەمدا بوو، شارە ئەوروپییەکان توانیـان سـەربەخۆیی لەدەسـت شـوێنکەوتەیی دەرەبەگایـەتی وەربگرن، ئەمەش لەڕێی خەباتێکی درێژخایەنی دژ بەدەرەبەگایەتیدا هاتەکایەوە.

شـارەکان لەدامەزرانـدنی حکوومەتـە پاشـاییە مەرکەزییـەکانی وڵاتـانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا کە زیاترین گەشەسەندنیان هەبوو ڕۆڵێکی گەورەیان بینی، ئەو شـارانەی لەپاشـکۆیەتی دەرەبەگایـەتی ڕزگاریـان ببـوو پێیـان دەوتـرا (شـارە ئازادەکـان) یـان (کۆمۆنـەکان). کـارگێڕی شـاریش لەسـەر بنـەڕەتی لامەرکـەزی وەسـتابوو، ئەنجوومـەنی شـار کـە هەڵدەبـژێردرا کاروبـاری ئـەوێی بـەڕێوەدەبرد، لەوەشـدا چـەنددادگایەکی هەڵبـژێردراو هێزێکـی چەکداری پێکهـاتوو لەڕۆڵـەکانی شارەکە یاریدەدەری بوون.

زۆربەی ئەو شارانە ڕاگەیاندنی تایبەت بەخۆیان هەبوو، لەو شارانەشدا کە حکوومـەتی مەرکـەزی دەرنەکـەوتبوو وەك ئیتالیـا، ئـەو شـارانە لـەژیانی ڕامیاری و ئابووریدا ڕۆڵێکی گەورەیان دەبینی، ئەو شارانە بوون بەچەند کۆمارێك یان پێیان دەوتـرا (حکوومەتـەکانی شـارەکان)، تەنانـەت ئـەو شـارانەی ملکەچـی دەسـەڵاتی

ڕاستەوخۆی پاشایەتی بوون چەند دەستکەوتێکی گەورەیان لەپاشاکانەوە دەست دەخست بەرامبەر پێدانی بڕێك پارە، شار ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لەهەڵوەشانەوەی پەیوەندییە کۆنەکانی لادێ‌و ئازادکردنی کۆیلەی زەویدا، چونکە ئەو کۆیلانە کە ڕایاندەکرد پەنایان دەبردە شارو تیایدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو سەقامگیردەبوون‌و دواتر ئازاد دەبوون، لێرەوە ئەو وتەیە دەرکەوت کە دەڵێت (هەوای شار مرۆڤ ئازاد دەکات).

ژیانی شاری ئەورووپی بەسترایەوە بەسەندیکاکانەوە کە بریتیبوون لەیەکگرتنی پیشەگەرانی یەك پیشەی دیاریکراو، گرنگی سەندیکاکان بەسەرپەرشتی کردنی بەرهەم‌و گۆڕینەوەو سەرفکردنی شمەك‌و کاڵاکان بوو لەبازاڕە ناوچەییەکاندا، یەکەمین سەندیکاکانیش لەکۆتایی سەدەی یانزەو سەرەتای سەدەی دوانزەدا دەرکەوتن‌و ژمارەیان لەدوو سەدەی دواتردا زیادی کرد تائەوەی دەیان سەندیکا لەیەك شاردا هەبوون، بۆ نموونە لەپاریس ژمارەی سەندیکاکان لەنیوەی سەدەی چواردەیەمدا نزیکەی (٣٥٠) سەندیکا بوو، لەلەندەن (٦٠) سەندیکاو لەکۆلن (٥٠) سەندیکا بوو.

لەگەڵ دابەشکردنی کات‌و شلۆقبوونی چالاکی بەرهەمهێنیدا سەندیکاکان دەبوونە چەند سەندیکایەك، وەستا کەسایەتی بنەڕەتی نێو سەندیکا بوو، ئەم کەسە خاوەن حانووت بوو پێناوی بەرهەمهێنی تایبەت بەپیشەی خۆی هەبوو، لەگەڵیدا یاریدەدەرێك یان دوان لەگەڵ چەند پیشەسازێك ئیشیان دەکرد، بۆ گەیشتن بەو پلەیە مرۆڤ دەبوو دوو قۆناغی پیشەسازو یاریدەدەر ببڕێت، سەندیکا چاودێری پەیڕەوی بنەماکانی کاری بەرهەمهێنی‌و سەرفکردنی کاڵاکانی دەگرت‌و ڕێی بەئەندامانی نەدەدا کاڵای خراپ بەرهەمبهێنن، یان ڕێژەیەکی زۆری کەرەستە یەکەمینەکان لای خۆیان کۆبکەنەوە یان پێناوی نوێی کار بەکاربخەن یان لەڕێژەی دیاریکراو زیاتر یاریدەدەر یان پیشەساز بەکاربخەن.

هەروەك سەندیكا چاودێری كاتی دەستپێكردن و كۆتایی پێهاتنی كار لەهەموو ناوچەكانی یەك پیشەدا دیاری بكەن، مەبەست لەهەموو ئەمانە دڵنیاكردنی یەكسانی نێوان ئەندامانی سەندیكاو دووركەوتنەوە لەڕكەبەری نێوانیان و دەرفەت نەدان بوو بەوانەی دێنە ناو بۆ گەیشتن بەپیشەو بازاڕ سەندیكاكان لەقۆناغی یەكەمیاندا ڕۆڵێكی چاكیان بینی لەپاراستنی بەرهەمهێنانی پیشەیی لەڕكەبەری دەرەكی، بەتایبەت كالاّ بەرهەمهاتووەكانی نێو زەوی دەرەبەگایەتی.

هەروەك سەندیكا خوێندنگەیەكی ئەزموونە پەرشوبلاّوەكانی ئەندامانی بوو، لەئامادەسازی دانیشتوانی شارەكان دژ بەدەرەبەگ و خانەدانە ناوچەییەكان ڕۆڵێكی گرنگی بینی، بەلاّم سەندیكا لەنیوەی سەدەی چوارەدەهەمەوە بەرەو داڕمان دەچوو، بەتایبەت لەفەرەنساو ئیتالیاو ئینگلتەرراو ئەڵمانیا، جا لەگەڵ دەركەوتنی وەرشەو فراوانبوونی بازاڕی نەتەوەیی و زیادبوونی بەرهەم لەتوانای بەرهەمهێنانی پیشەیی نەبوو كە پێویستی ولاّت دابین بكات و یەكسانی نێوان ئەندامانی خودی سەندیكاو نێوان سەندیكاو هەژراو دەوڵەمەندەكانیش نەما تائەوەی نازناوی وەستا بوو بەمیراتی و ئیتر یاریدەدەر نەیدەتوانی بچێتە قۆناغی سەروترەوە، بەڵكوو گۆڕا بۆ كرێچی لای خاوەن دوكان، دەستگرتنی سەندیكا بەشمەكە تەقلیدییەكانی كارو دژایەتی پێشكەوتنی نوێ، بەربەستی ڕێی گەشەسەندن و پێشكەوتنی بوو، ململانێیەكی توند لەناو سەندیكادا لەنێوان یاریدەدەرو وەستادا دەركەوت.

بەشێوەیەكی گشتی شارە ئەورووپییەكان لەماوەی گەشەسەندنیدا سێ ڕەوتی ململانێی بەخۆیەوە دی، جا لەقۆناغی یەكەمدا شار بۆ ڕزگاربوون لەدەست دەسەلاّتی دەرەبەگی خەباتیان كرد، لەقۆناغی دواتردا ململانێی نێوان سەندیكاو خانەدانە ناوچەییەكان كە بەرپەرچی بەشداری سەندیكاكانیان لەكارگێری شاردا دەدایەوە ڕووی لەتوندی كرد، لەقۆناغی سێیەمیشدا ململانێی نێوان دەستە هەژارەكان لەلایەك و ڕێبەرانی سەندیكاكان و سەندیكا دەوڵەمەندەكان لەلایەكی دیكەوە ڕوویدا.

لەدیاردەکانی دیکەی گۆڕانەکانی نێو ئەوروپا لەماوەی گواستنەوەدا، گەشەسەندنی پێناوەکانی بەرهەمهێنان بوو بەتایبەت لەپیشەسازی چنینو کەشتی سازیو چەكو کانزادا، پیشە جیاجیاکان گۆڕانو گەشەسەندنێکی بەخۆوە دی، پیشەسازی کاغەز لەماوەی سەدەکانی دوانزەو سیانزەو چواردەدا گەشەی سەند، لەسەدەی کۆتایشەوە پیشەسازی موشەكو گوللە تفەنگ دەستیپێکردو ئەوروپیەکان لەسەدەی دوانزەهەمدا چاویلکەی شوشەییان دۆزیەوەو لەدەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ز. دا یەکەم چاویلکەیان دروستکرد، هەروەك گەیشتنە پیشەسازی کاتژمێری دیواریو پاشان پیشەسازییە بچووکەکانی دیکەش هاتن.

بازرگانی لەو ماوەیەدا گەشەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە دی، بەڵکوو لەبازرگانی ناوخۆیدا بەرتەسك نەدەبوویەوە، بەڵکوو شارە ئەوروپیەکان لەدەریای بەلتیقو دەریای باکوورەوە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا بازرگانیان دەکرد، گەشەسەندنی دانیشتوانی شارەکانو پیشەسازی کەشتیو کەڵەکەبوونی سامان لای نەوەی شارە ئەوروپیەکانو ئیتالیا بەشێوەیەکی تایبەت، لەپشت زیادبوونی خواستی کاڵا ڕۆژهەڵاتیەکانی وەك ئاڵەتو بەهاراتو ئاوریشمو چاییو لۆکەو کاڵای نایابی دیکەوە بوون.

لەگەڵ گەشەسەندنی چالاکی ئابووریدا گرنگی بەندەرە ئەوروپیەکان گەشەی سەند بەتایبەت لەبەرەی دەریای ناوەڕاستەوە کە پێگەی بازرگانی جیهانی ئەوکات بوو، شارە ئیتالیەکان (جەنەوا) (بوندوقیە) (بیزا) دەوڵەمەندترین شارەکانی ئەوروپا بوون. سەرەڕای بازرگانی دەریای ناوەڕاست بازرگانی لەدەریای بەلتیقو دەریای باکوور چالاك بوو، شارە ئەڵمانیەکانی ناو دەستەی هنسیش لەو بازرگانیەدا ڕۆڵێکی گەورەیان بینی. ئەو کۆمەڵەیە نزیکەی (٨٠) شاری ئەڵمانی لەخۆدەگرت کە لەگەڵ پۆڵەنداو وڵاتانی ئەسکەندەنافیاو شاری نوفگۆردی ڕوسیا بازرگانیان دەکرد.

چەندین بازاڕی وەرزی بوون بەبازاڕی هەمیشەییو بەدرێژایی ساڵ پەیڕەوی چالاکیە بازرگانیەکانیان دەکرد، لەوانە بازاڕی فرانکفۆرتو لایبزیگ لەئەڵمانیاو

شامبین لەفەرەنسا لەگەڵ گەشەسەندنی بازرگانی جیهانی بانك و دامەزراوە داراییەکان دەرکەوتن و شاری فلۆرەنسای ئەڵمانی لەو بوارەوە زیاد لەشارە ئەوروپییەکانی دیکە ناوبانگی دەرکرد.

هەروەها لەو ماوەیەدا زانکۆ ئەوروپییەکان دەرکەوتن و گەشەیان سەند، یەکەم زانکۆ لەسەدەی دوانزەی زایینی دەرکەوت، وەك زانکۆی پاریس کە نیوەی دووەمی سەدەی دوانزەیەمدا دەرکەوت و بەپێی بڕیاری شا (فیلیب) لەساڵی ۱۲۰۰ز. بەشەکانی تەواو کران، ئەو زانکۆیە لەچوار کۆلیج پێکدەهات پزیشکی و یاساو لاهوت و هونەر. زانکۆی پاریس بوو بەنموونەیەك بۆ زانکۆ ئەوروپییەکانی دیکە، خوێندنگە بالاکانی ئیتابیا لەماوەی سەدەی دوانزەهەمی زایینیەوە ڕۆڵی زانکۆیان دەبینی، وەك خوێندنگەی (بوبونا) کە تایبەت بوو بەیاسای ڕۆمانی، خوێندنگەی سالرنۆی پزیشکی، لەسەدەی سانزەشدا زانکۆکانی ئۆگسفۆردو کامبریج لەئینگلتەراو ناپۆلی لەئیتالیا دامەزران، لەکاتێکدا لەسەدەی چواردەهەمدا چەند زانکۆیەکی دیکە لەبراگ و کراکۆف و ئەبرفۆرت و کۆلن و چەندی دی دامەزران تائەوەی لەساڵی ۱۵۰۰ز. دا ژمارەی زانکۆکانی ئەوروپا گەیشتە (٦٥) زانکۆ.

شیاوی باسە زانکۆکان سەرەتا ملکەچی هەژموونی کڵێسا بوون و کڵێساش هزری خۆی بەسەر هەموو لایەنە سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیەکانی ژیاندا سەپاندبوو، بۆیە خوێندنەکان بەرتەسك ببوونەوە لەلاهوت و زمانی لاتینی و مەنتیق و ژمێریاری و ڕێزمان و ئەو زانستانەی دیکە کە هزری کڵێسای لێیان نەدەترسا، لەکاتێکدا زانستە سروشتیەکان دووربوون لەگرنگی پێدانی ئەو هزرە، زۆربەی خوێندنیش بەزمانی لاتینی بوو. فەلسەفەی فێرکاری زاڵیش فەلسەفەی خوێندنگەی (سکۆلائی) بوو کە جەختی دەکردەوە لەسەر گرنگی مشتومڕو ڕێکخستنی چەمکە دیارەکانی نێو چوارچێوەی مەسیحی.

ئەبیلاردو قۆما ئەکوینی ئەلبرتی گەورە دیارترین کەسەکانی ئەو خوێندنگەیە بوون، بەڵام فەلسەفەی خوێندنگەیی لەسەدەی چواردەهەمەوە لەتەنگەژەیەکی

توندا دەژیا، کاتێك سەرەتاکانی ڕۆشنبیریەکی نوێ دەرکەوتن کە لەکرۆکیدا گرنگی بەمرۆڤ دەداو بەرەو ڕووی هزری کڵێسایی ئەوکات دەوەستاو لەدەرکەتندا بوو، ئەو ڕۆشنبیریە ناوی دیدی دنیاویستی لێنراو یەکەمین خشتی دەرکەوتنی بزووتنەوەی مرۆیی لەسەر بنەمای هەژموونی هزری کڵێسایی بەسەر بەشێکی گرنگی بیریارە ئەورووپیەکاندا دانا.

ماوەی گواستنەوەی سەرەتاکانی هۆشی نەتەوەیی لای گەلانی ئەورووپا دەرکەوتنی زمانە نەتەوەییەکانی بەخۆیەوە دیو ئەو زمانانە شوێنیان بەزمانی لاتینی تەنگ دەکردو بەرەبەرە شوێنیان دەگرتەوە، چەندین خوو سەری ئەورووپی لەچەسپاندنی زمانە نەتەوەییە ئەورووپیەکاندا ڕۆڵی گرنگیان بینی، وك دانتیو بتراكو بۆكاشیۆ کە ڕێبەری ئەو ئاراستەیە بوون لەئیتالیاو ئەورووپادا.

لەفەرەنساش میلیەو دی کۆمینو کەسانی دی بەفەرەنسی دەیاننوسیو واتای چەمکی (فەرەنسی) گۆڕا، چونکە پێشتر بەواتای هاولاتی (دی فرانس) دەهات، لەکۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا بەواتای هاولاتی شانشینی فەرەنسی هات، لەئینگلتەراش لەداگیرکاری نۆرماندیەوە زمانی فەرەنسیو ئینگلیزی بەکاردەهات، زمانی ئینگلیزی بەتایبەت شێوەزاری لەندەن زمانی فەرەنسی کەنارخست تائەوەی شاهنری سێیەم لەبانگەوازێکدا بۆ گەل لەساڵی ١٢٥٨ز. دا زمانی ئینگلیزی بەکارهێناو ئیدوادی سێیەمیش لەساڵی ١٣٦٢ز. فرمانی دەرکرد لەدادگاکاندا ئینگلیزی بەکاربێت، لەهەمان کاتدا چەندین بەرگ کتێبی نووسەرانی ئینگیزی وەك چیرۆکەکانی کنتربری (چیۆفری) (تشوسر) بلاوبوونەوە، (جۆنو ویکلف)یش ئینجیلی وەرگێڕایە سەر ئینگلیزیو (ولیەم کیکستۆن)یش (١٤٢٢ز-١٤٩١ز) کە چاپخانە لەئینگلتەرا هاودەمی ناوی ئەوە زیاتر لەسەد کتێبی بلاوکردەوە، لەنێو ئەوانەشدا نوسینەکانی تشوسرو فرجیلو شیشرۆنو چەندێکی دی، لەئەڵمانیاش لەگەڵ هەموو بەربەستەکاندا، زمانی نەتەوەیی هەنگاوە یەکەمینەکانی خۆی دەنا،

بەتایبەت لەسەر دەستی سیباستیان برانت کە ناسراو بوو بەو نوسینەی بەئەڵمانی نوسیبووی بەناوی (کەشتی گەمژەکان).

فلۆرەنسا کە پێی دەوترا (ئەپینای ئیتالیا) لەرۆشنبیری ئیتالیدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی، ئەو لەپاڵ ئەوەی مەڵبەندێکی بازرگانی و پیشەسازیو دارایی بوو، مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری گرنگی ئیتالیا بوو لەسەدەکانی سیانزەو چواردەو پانزەدای زایینیدا، بزووتنەوەی مرۆیی تیایدا سەری هەڵداو پێشڕەوانی ڕێنسانسیش دانتیو بتراكو بۆكاشیۆ هاوولاتیو دانیشتووی ئەم شارە بوون.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ڕێنیسانسی ئیتالی کە لەچارەکی کۆتایی سەدەی چواردەهەمدا دەرکەوتو لەگرنگترین ڕووداوەکانی کیشوەری ئەوروپی بوو لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، ئاراستەیەکی نوێی بیرکردنەوەو ڕوانین بۆ بوارەکان بوو کە بەتەواوەتی لەدیدی زاڵی بەهای دەرەبەگیو کڵێسای هزر بەستوو و ڕێگری داهێنان جیاوازبوو، ئیتالیا لانکەی ڕێنسانس بوو.

ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك کاریان لەیەکدی دەکرد، لەئیتالیا لەپێش وڵاتانی دیکەی ئەوروپا بەهۆی گەشەسەندنی بازرگانی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتو قۆرخکردنی بازرگانی دەریای ناوەڕاستەوە دەرەبەگایەتی تووشی لێکهەڵوەشان هات، جا شارە ئیتالیەکانی بوندوقیەو جەنەواو فلۆرەنسا ڕۆڵی مەڵبەندە بازرگانیو داراییە هەرە گرنگەکانی کیشوەری ئەوروپییان بینی، لەو شارانەدا یەکەمین بانكو دامەزراوە داراییەکانی دی دەرکەوتنو ژمارەی دانیشتوانیان چەند بەرامبەر بوون، هەروەك بەریەککەوتنی ئیتالیەکان لەگەڵ ڕۆشنبیری ئیسلامیدا ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لەبەرپابوونی ڕێنسانس تیایدا، سەرەڕای ئەوەی ئیتالیا مەڵبەندی کڵێسای کاپولیکیو پاپاو میراتگری شانوشکۆی ڕۆمانە کۆنەکان بوو، ئەمەو چەند هۆکارێکی دی یاریدەدەر بوون تا ڕێنسانس لەئیتالیا پێش شوێنەکانی دیکە دەربکەوێت.

ڕێنسانس بوویە هۆی گەشەسەندنو پێشکەوتنی گەورەی زانستیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو هزریەکەشی بنەڕەتەکانی کۆمەڵگەی کۆنو بەها هزریە

کۆنەکانی خستە لەرزین، پیاوانی ڕێنسانس هەوڵیاندا کڵێسا لەچەکی کارای زاڵبوونی بەسەر هۆشی خەڵکدا دابماڵن، هەروەك زمانە نەتەوەییەکانیان بەکارهێنا بۆ زیندووکردنەوەی هۆشی نەتەوەیی لەنێو گەلەکانیاندا پەنایان بردە بەر میراتگری جەماوەری.

ژمارەیەك لەو پێشڕەوانەی لەژیانی ڕۆشنبیریو هزری گەلانی ئەورووپادا ڕۆڵێکی گەورەیان بینی دەرکەوتن، دانتی نوسەری (کۆمیدیای خودایی) پێشڕەوی یەکەمی ڕێنسانسو بەکارهێنەری زمانی نەتەویی ئیتالیو جیاکەرەوەی ئەدەب لەچوارچێوەی بەرتەسکی خوێندنگەیی بوو. کۆمیدیای خودایی چەند هزرێکی کۆمەڵایەتیو سیاسی قووڵو دلێرانەی لەخۆدەگرت.

بتراك ڕێبەری مرۆڤگەراکان لەئەورووپا لەنوسینەکانیدا ڕەخنەی لەکلێسا دەگرت، بۆکاشیۆی نوسەری (دیکامیرۆن) گاڵتەی بەپیاوانی کلێسا دەکرد، لەنوسینەکانیدا بەها باڵاکانی ژیانی دەنەخشاند، ئەو بەهایانەی لەگەڵ هۆشی مرۆڤدا یەکیان نەدەگرت، ئەو پیشڕەوانە بەردی بناغەی ڕێنسانسی ئیتالی ئەورووپیان بەشێوەیەکی گشتی دانا. لۆرینزۆڤالایش ساختەی (هبە قسگنگین)ی ئاشکرا کرد، لیۆناردۆ برۆنی سیستمی فێرکاری نوێی دامەزراند کە لەگەڵ بنەما مرۆییەکاندا یەکی دەگرتەوە، ئەو داوای پەروەردەکردنی گیانی جەستەیی دەکردو دەیویست سیستمی فێرکاری ساڵانە ڕێکبخرێت.

لەپاڵ ئەمانەدا دەیان ناوی پرشنگداری دیکە دەرکەوتن کە لەو ماوەیەدا هەبوون بانگەوازیان بۆ چەند هزرێکی نویێ دەکرد کە خزمەت بەمرۆڤ بکەنو ئاسۆگەلێکی فراوان لەبەردەم مرۆڤدا والاّ بکەن.

ئەو ماوەیە دۆزینەوەی چاپخانەی نموونەیی بەخۆیەوە دی، چاپخانە لەگرنگترین دەستکەوتە زانستیو ڕۆشنبیرییەکان بوو، بەڵکوو گرنگترین ڕووداوی مێژووی مرۆڤایەتی بوو، یوحەننا گوتینبورگ لەساڵی ١٤٤٥ز. دا توانی یەکەم ئامێری دارینی چاپ دروستبکات کە بەدەستی کاربکاتو پیتە جوڵاوەکان بەکاربهێنێت، ئەوپەڕی توانای چاپکردنی سەد لاپەڕە بوو لەکاتژمێرێکدا.

داهێنـانی چـاپخانە بەشـداری کـرد لەپێشخـستنی زانـستی و زیندووکردنـەوەی کـەلتوورو بڵاوکردنـەوەی بیرو مەعریفـەکان. ئەگـەر ئـەو داهێنانـە گـەورەیـە نەبوایـە خوێنـدن و نوسـین لەدەسـت کەمینـەی نـەوەکانی دەسـتە بـالآ کۆمەڵایەتییـەکان و پیـاوانی ئاییـنیدا قـۆرخ دەکـرا، بـەهۆی چـاپخانەوە کتێبـەکان کەوتنـە بەردەسـتی خەڵك و گۆتینبۆرگ هەوڵیدا داهێنانەکەی بەنهێنی بمێنێتـەوە، بـەڵام پـاش ١٥ سـاڵ بەنهێنی نەمایەوەو لەئەڵمانیاوە بلاوبوویەوە بۆ وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکە.

ئـەو گەشەسـەندنانە دەزگـای کڵێـساشی گرتـەوە، بزووتنـەوەکانی لادان و هەڵگەڕانـەوە دەرکـەوتن و دژ بەدەسـەڵاتداری کڵێـسای کـاپولیکی بـوون، چـونکە کڵێسا هەژموونی خـۆی بەسـەر عـەقڵ و ژیـانی سـەدەکانی ناوەڕاستی نێو مێژووی ئەوروپیدا سەپاندبوو ئەو بزوتنەوانە تا ئاستێکی دیار پەیوەستی شـارەکان بوون، بـۆ ئەمـەش لـەو وڵاتـە ئەوروپیانـەی تیایـدا شـارەکان گەشـەیان سـەندبوو وەك باشـووری فەرەنـساو باشـووری ئـەڵمانیا و بـاکووری ئیتالیـاو زەوییـە نزمـەکان و بوهیمیا، ئەو بزوتنەوانە دەرکەوتن.

بزووتنـەوەی (ئالبیجنـسیەکان) کـە دەدرانـەوە پـاڵ شـارێکی فەرەنـسی لـەو بزووتنەوانە بوو کە هێرشی بردە سەر کڵێساو بێباك بوون لەکڵێسای ڕادەگەیاند دژ بەجەنگە دەرەبەگیەکان و دادگاو دامەزراوە قروستیەکانی دیکە وەستا، بەڵام پاپا دژ بەوانە لەسەرەتای سـەدەی سیانزەهەمی زاییـنیدا جەنگێکی بەرپاکردو لـەناوی بـردن، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا نـەیتوانی ڕیشەکێـشیان بکـات، لەهـەمان کاتـدا بزووتنـەوەی والدانیـەکان دەرکـەوتن، چـونکە دەدرێنـەوە پـاڵ بـوترس و والـدای چاکسازی لیـۆنی، ئـەو بزووتنەوەیـە بەنگـەوازی دەکـرد بـۆ بـەدیهێنانی دادوەری کۆمەڵایەتی و لەباشوری فەرەنساو سویسراو باشووری ئەڵمانیادا بڵاوبوویەوە.

کاریگـەری ئـەو بزووتنەوانـە لەنـەوەی دەسـتەو چینی خـوارەوەدا بەرتەسـك نەبوویەوە، بەڵکوو خانەدانەکانیش بۆ وەستان لەڕووی پاپاو دامەزراندنی کڵێسای تایبەتی بێ خەرجی تایبەتی دایانە پاڵ بزووتنەوەکە، لەئینگلتەرایش بزووتنەوەی جۆن و ویکلف و بزووتنەوەی لۆلاریەکان کە لـەو جیابوویـەوە دەرکـەوتن، لـەبوهیمیا بزوتنەوی جۆنهس دەرکەوت کە دواتر بوو بەبزووتنەوەیەکی بەرفراوانی نیشتمانی دژ بەدەسەڵاتداری ئیمپراتۆریەت بەسەر وڵاتدا.

کڵێساش بەرامبەر بەو بزووتنەوانە پەرچەکرداری توندی نواندو چەند شالاوێکی فراوان و گەورەی لەدژیان بەرپاکرد، داداگامانی پشکنین لەسەرکوتکردنیاندا ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕاو چەندین کەسیان لەوانە سوتاندو دەستیان گرت بەسەر ماڵ و سامانیاندا، بەلاّم هەموو ئەمانە نەیانتوانی ئەو هزرەیان لەناوببات کە بەربەرە بەشێوەیەکی فراوان لەناو دانیشتواندا بلاّوبوویەوە تائەوەی لەسەرەتای سەدەی شانزەدا بوو بەبزووتنەوەیەکی گەورە، ئەوە ئەو بزووتنەوە چاکسازییە ئایینییە کە لەبەشەکانی دواتردا قسەی لەسەر دەکەین.

بەوجۆرە گۆڕانەکانی ناو ئەوروپا لەسێ سەدەی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا بوو بەهۆی گۆڕینی مەشخەڵەکانی کیشوەرەکە بەگشتی و گواستنەوەی بۆ قۆناغێکی نوێی مێژووی ئەوروپا.

********************

## (ساڵ و ناو)

٣١٣ز. ڕاگەیاندنی مەرسومی میلان.

٣٣٠ز. گواستنەوەی پایتەختی ڕۆمانی بەشێوەیەکی ڕەسمی بۆ قوستەنتینیە.

٣٧٨ز. جەنگی ئەدرنە لەنێوان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و قووتەکاندا.

٤٧٦ز. دارمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

٧٥٤ز. پاپا ستیڤنی دووەم تاجی پاشایەتی فرەنجی کردە سەر بیبنی سێیەم.

٨٠٠ز. پاپا لیۆنی دووەم تاجی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کردە سەر شارلەمان.

٨١٤ز. مردنی ئیمپراتۆر شارلەمان.

٩٦٢ز. ناونانی پاپا بەئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز.

سەدەی یەکەمی زایینی دەرکەوتنی مەسیحییەت وەك ئایینێکی ئاسمانی.

١٠٥٤ز. دەرکەوتنی مەزهەبی کاپولیکی لەڕۆما.

١٠٦٠ز. پاپا گریگۆری حەوتەم ڕێی هاوسەرگیری لەپیاوانی ئایینی قەدەغە کرد.

١٠٧٧ز. هنری چوارەم ملکەچی تەواوی خۆی بۆ پاپا ڕاگەیاند.

١٠٩٥ز. پاپا ئۆرلیانی دووەم بانگەوازی ئەنجامدانی شاڵاوە خاچپەرستیەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لەکۆنگرەی کلیرمۆنتدا ڕادەگەیەنێت.

١١٢٢ز. هاوپەیمانی (ورنمر) لەنێوان ئیمپراتۆری ڕۆمانی و پاپادا.

١١٦٢ز. ئیمپۆاتۆر فریدریك باربارۆما میلان و چەند بەشێکی دیکەی ئیتالیا داگیر دەکات.

سەدەی سێیەمی زایینی سەردەمی چەوساندنەوەو سەرکوتکرنی مەسیحییەکان.

١٢٢٣ز.	دەرکەوتنی بزووتنەوەی فرەنسیسکانی.

سەرەتای سەدەی چوارەم. وەرگێڕانی تەواوی ئینجیل لەسەر دەستی قەشە جیرۆم لەڕۆما.

١٣٦٢ز.	ئیدواردی سێیەم بڕیاریدا زمانی ئینگلیزی بەتەنها لەدامەزراوە ڕەسمییە بەریتانیەکاندا بەکاربێت.

١٥٠٠ز.	کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست.

١٥٠٠ز.	ژمارەی زانکۆ ئەورپییەکان گەیشتە ٦٥ زانکۆ.

*********************

# (بەشی دووەم)
# ئەوروپا لەسەدەی شانزەهەمی زاینیدا
# (١٥٠٠ز-١٦٠٠ز)

## باسی یەکەم:
## نەتەوایەتی و جیهانگەرایی لە ژیانی ئەوروپای نوێدا.

## باسی دووەم:
## سەردەمی چاکسازی ئایینی.

## باسی سێیەم:
## چاکسازی ئایینی لە سویسراو ئینگلتەرا.

## باسی چوارەم:
## شاڵاوە خاچپەرستیەکان.

# (باسی یەکەم)

## (نەتەوایەتی و جیهانگەرایی لە ژیانی ئەوروپای نوێدا)

## * نەتەوایەتی و جیهانی بوون لە ژیانی ئەوروپای نوێدا:

ئەو ئاماژانەی زانین کە بوونە هۆی گواستنەوەی ئەوروپا لە قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ سەدەکانی نوێ، بینیمان چۆن ئەو گۆڕانە قووڵە لە واقیعی کۆمەڵایەتی ئەورووپیدا ڕوویدا و لە سایەیدا پەیوەستی گۆڕان وگواستنەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە بوو، ئەگەر چی گواستنەوەکە سادەو ڕێژەییش بێت، پێش ئەوەش بچینە شیکار و باسی ئەو ماوە گرنگەی مێژووی ئەورووپی، لەبەر گرنگی بابەتی بێت. نەتەوەیی و جیهانیبون لە پێکهاتنی ئەورووپی لەسەدەکانی نوێداو گواستنەوەی نێوانیان لەگەڵ وروژاندەکانی واقیعدا، پێمان باشە وەك ڕێخۆشکەریەکی گشتی بۆ هەموو قۆناغەکانی ئەو ماوەیە بخەینە سەر باس، ئەویش مێژووی ئەوروپایە لەسەدەکانی نوێدا.

پاش سەقامگیریەکی دەسەدەیی ڕێنسانی ئەورووپی لەسەدەی نوێدا بیری جیهانێتی دارماندو لە جیاتیدا بیری نەتەوەیی بردە پێگەی ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگەو دەوڵەت، لەگەڵ ئەوەی نەتەوایەتی بەخششەکانی واقیعی نوێی وا دەبینی سەرکەشی و گەشەی سەرکەوتنی تێر بکات، بەڵام جیهانێتی توانی چەند پێگەیەك بۆ خۆی بهێڵێتەوە.

نەتەوایەتی ڕێی نەدا لەناو بچێت، بەوجۆرە واقیعەکە لە نێوان جیهانێتی ڕکەبەری هێشتنەوەی خۆی و نەتەوایەتیەکی مەنهەجی مۆرك زاڵ بەسەر بوارەکانی هزرو هەستدا دابەشبوو، نەتەوایەتی پێگەی سەرکردایەتی و پەیڕەوی گرتبوویە دەست خۆی، لە سەدەکانی دواییدا دوو ڕەوت هەبوون خۆیان لە ڕوانگەی چەند دیاردەیەکەوە سەلماند کەدواتر ئەو دیاردانە دەخەینە ڕوو.

********************

## * ڕەوتی جیهانێتی:

ئەم ڕەوتە لە ڕوانگەی ئەم دیاردانەوە خۆی نیشان دەدا:

١- کڵێسا:

پاش ئەوەی جوولەکە هێزی مەسیحی شێواند، پاشا ڕۆمانەکان لەگەڵ پیاوانی کڵێسەدا لەسەر چەمکێکی کاتی (کڵێسای جیهانی) مانەوە کە لە خزمەت بەرژەوەندیە کاتیەکانی هەردوو لادا بێت بلکێت بە مەسیحیەتەوە، بەڵگەی ئەمەش هەڵوێستی پاڵپشتی کڵێسایە بەرامبەر سیستمی کۆیلایەتی کە جۆرە ڕەوابونێکی پێدەبەخشی.

لە کاتێکدا ( ئەگەر بەڕاستی جیهانی بوایە) دەبوو لەسەر پاکتاوکردنی ئەوەو کۆتای پێهێنانی وەك ئەوەی ئایینی ئیسلام ئەنجامیداو کۆتایی بە سیستمی کۆیلایەتی هێنا، دەبوو هەڵوێستێك نەگرێتە بەر کەتەنها خزمەت بە بەرژەوەندی پاشاکان بکات، بۆیە کڵێسا تا سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانس لە ڕووی ناو و هەستەوە دەدرایە پاڵ ڕەوتی جیهانێتی و لە ڕووی واقیعی کرداریشەوە سەر بەڕەوتی دەمارگیری بوو، ناکرێت ئاڕاستەیەك کە لە کرۆکدا واتای جیهانێتی لە خۆ نەگرێت بدرێتە پاڵ جیهانێتی، چونکە هەر کەموکورتیەك لەو واتایەدا دەبێتە هۆی بێتوانایی لە بەدیهێنانی جیهانێتی وەك ئامانجێك.

بیری ئایینی بە تەواوەتی زاڵببوو بەسەر سەدەکانی ناوەڕاستدا، دەمارگیریش بۆی لەنێوان هەر دوولای ئیسلامی و مەسیحیشدا توند بوویەوە سەردەمەکانی هەستی جیهانێتی کە دواتر لەبەرەی ئیسلامیدا درێژەی پێداو لە لایەنی مەسیحیشدا خەریکبوو هەستی نەتەوەیی لە جیاتی جیهانێتی دەربکەوێت. لەسەر ئاستی هەستی کڵێسا بزووتنەوەی مرۆڤگەرایی بەچاکترین پشکی خۆی دەزانی ئەمەش زیندو کردنەوەی مرۆڤگەرایی شیشرۆنی ڕەواقی بوو.

شاعیری ئیتالی بترارك (١٣٠٤ز-١٣٧٤ز) بە یەکەم دامەزرێنەرو بانگەشەکەری دادەنرێت، بڕوای بە بەرزێتی مرۆڤ هەبوو بەسەر هەموو دروستکراوەکانی دیکەدا

نەوەك بەرزی جۆرێکی مرۆڤ بەسەر جۆرەکانی دیکەدا، ئەوەش کاریگەری بەهێزی هەبوو لەسەر ژیانی عەقڵی و رامیاری ئەوروپا و پیاوانی بەرەو جۆرە جیهانێتیەك برد.

بۆ نمونە ئیمپراتۆری رۆژئاوا شارلەمان (١٥١٩ز-١٥٥٦ز) بیرۆکەی جیهانێتی لە بیری مرۆڤگەرای گەورە (ئیراسیمۆسەوە) (١٥٣٦ز) وەردەگرت کە بڕوای بەوە نەبوو لە ئیمپراتۆریەتەکەیدا ببێتە سەرباز، چونکە دژ بە بیری ئیمپراتۆریەتی جیهانی بوو کە بەسەر سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵبوو، سەرەڕای ئەوەی لەو کاتەدا کڵێسا دوچاری چەندین هەڕەشەی ناوخۆیی و دەرەکی بوویەوە، بەڵام پیاوانی هزری مەسیحی بەردەوام جەختیان دەکردەوە لەسەر بیرۆکەی جیهانێتی.

لەسەدەی چواردەیەمدا (دانتی) بانگەوازی کرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیهانی، (سوارین)ی زانا لاهوتیش (١٥٤٨ز-١٦١٨ز)دا لە کتێبێکدا دەڵێت:( ڕەگەزی مرۆیی لەگەڵ ئەوەی بۆ چەند گەل ودەوڵەتێك دابەش بووە، بەڵام یەکبوونێکی هێناوەتەدی کە تەنها شێوەیی نیە، بەڵکو رامیاری و ئەخلاقیشە).

هەندێکیش هەبوون پرۆژەیان دادەنا بۆ حکومەتێکی جیهانی کە هەموودەوڵەتە مەسیحیەکان لەخۆ بگرێت و ئەنجومەنێکی باڵای پێکهاتوو لە شەست نوێنەر بەڕێوەی ببەن، ئەویش وەزیر هنری چوارەم بوو لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەی زاینیدا.

فەیلەسوفێکی لاهوتیش دەبینین کە (لیبسەر)ە(١٦٤٦ز-١٧١٦ز) وا دەیڕوانیە هەستی نەتەوەیی کە ئەوروپا بەرەو پێگەیشتنی هەستی گشتی جیهانێتی دەبات، هەروەك نوسەرێکی فەرەنسی گەورەیش دەبینین بەناوی (شاتو بریان) (١٧٦٨ز-١٨٤٨ز)کە لە کتێبێکدا سەبارەت بە مەسیحیەت هاواری کڵێسای جیهانی دەکات، لەسەدەی هەژدەیەمیشدا (یبلتن) دیدی قووڵ جیهانێتی خاوەن سروشی ئایینی هەبوو، هەر ئەو بوو لویسی چواردەی هاندا تا سیاسەتی کرانەوەیەکی ئاشتیانە لە ڕۆژهەڵات بگرێتەبەر، بەوجۆرە کڵێسا لە بەرزکردنەوەو پاڵپشتی گیانی جیهانێتیدا ڕۆڵی بینی، سەرەڕای هەموو ئەمانەش بەردەوام دیدی جیهانی هەبوو تۆوی بنەڕەتی بوو کە خۆی لە کڵێسای کاسۆلیکیدا دەبینیەوەو مۆرکێکی جیهانێتی هەڵگرتبوو، وشەی (کاسۆلیکی) بەلاتینی واتە (جیهانێتی) هەرچەندە وەك دواتر دەبینین دەوروبەرەکان نەتەوایەتیان نیشاندا.

## ٣- بزووتنەوەی شیوعیەت:

لەسەدەی نۆزدەدا بزوتنەوەی شیوعیەت وەك فەلسەفەیەكی كۆمەڵایەتی وديدێكی مادیگەرایی بۆ بوون دەركەوت، لە شیكاری فەلسەفیدا بۆ مرۆڤ و ژیان پێ وا بوو پێناوی ئابوری بنەڕەتەو پێناوەكانی دیكە شێوەیین و لەسەر حەقیقەت نەوەستاون.

لە پێناو ئەمەشدا ماركسیەت بڕوای بە یەكبوونی جۆرێتی مرۆڤ هەبوو و بەرپەرچی جیاوازی نیشتیمانی و ڕەگەزی دەدایەوەو پێی وا بوو پێناوی چینی بۆرجوازین.

كارل ماركس (١٨١٧ز-١٨٨٣ز) یەكەم دامەزرێنەری بوو، لەگەڵ (ئەنگلز)دا روونكردنەوەو دیدی شیوعییان نووسی كەبەیەكەم بەڵگەنامەی شیوعی دادەنرێت، بەو بانگەوازە ناودارە كۆتاییان پێهێنا (كرێكارانی جیهان یەك گرن).

لەساڵی ١٨٦٤ز دا یەكەم كۆڕی نێودەوڵەتی بەسترا كە ڕێكخراوێكی حیزبی بوو سەرپەرشتی كاری شیوعی دەكرد لە ئەوروپا، لە كۆبونەوەكەیدا كرێكارانێكی چەندین دەوڵەتی ئەوروپی ئامادە بوون و تیایدا سەندیكای كرێكارانی فەڕەنسا و سەندیكای كرێكارانی بەریتانیا ڕاگەیەندران، لەو كۆبونەوەدا ڕێزگرتن لە كرێكارانی جیهانی زیندوو دەكردەوە.

ئەو بڕیارە بە بنەڕەتێك دادەنرێت بۆ دۆستایەتی جیهانی، پاش شۆڕشی بەلشەفی ڕوسیا لە ساڵی ١٩١٧ز دا شیوعیەت چوویە نێو ژیانی نێودەوڵەتی و دروشمی جیهانیبونی بەرزكردەوە، لەو ڕوانگەشەوە توانی لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی وەك هێزێكی گەورە ڕۆڵێكی گرنگ ببینێت، بەڵام ئەو دروشمە لەناوخۆدا بوو بە پێناوێكی گرتنی زەوی دراوسێكان و شكاندنی نەتەوەكان و سەرخستنی دیكتاتۆریەت، ئەمەش تیشكی خستە سەر شكستی جیهانێتی شیوعی كە ئەوكات دیار و جێدانپێدانان بوو.

ئێمە ئەوەمان زۆر لا گرنگ نیە و گرنگ ئەوەیە بڵاوبونەوەی هەزری شیوعی لە بیستەکان تا حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا ئاشکراکەری هەستێکی زیندوی جیهانێتی بوو کە کۆمەڵگەی مرۆییی هاوچەرخ لەخۆ بگرێت، گەورەییش لەو بڵاوبونەوە فراوانەدا تا ئاستێکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو هەستە ویستویەتی دژ بەو هەڕەشە دەمارگیری و ڕەگەزیانەی تیایدا دەرکەوتن سەرکەوتن بۆ خۆی بەدەستبهێنێت.

********************

## ٣- دیدی نێو دەوڵەتی:

لە پاڵ ئەمەدا لە ئەوروپا دیدێکی دی دەرکەوت کە لە کرۆکیدا مۆرکێکی جیهانێتی هەڵگرتبوو، دەکرێت ناوی دیدی نێودەولەتی لێبێنین، سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەی زاینی کاتێك (گورجیۆس) هەوڵیدا لە کتێبە بڵاوکراوەکەی لەساڵی (١٦٢٥ز) دا پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان ڕێکبخات. دواتر وەزیر هنری چوارەم پڕۆژەیەکی پێشکەشکرد بۆ کۆمارێکی مەسیحی جیهانی کە ئەنجومەنێکی باڵای پێکهاتوو لە ٦٠ نوێنەر بەڕێوەی ببات.

لە ساڵی(١٦٤٨ز)دا ئەوروپا دانی نا بە پێویستی دامەزراندنی ڕێکخستنێکی نێودەوڵەتی تا پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان بەڕێوە ببات، یەکەم ڕێکخستن لەو جۆرە دامەزرا و ناوی بنەماڵەی نێودەوڵەتی لێنرا. لەساڵی (١٨١٥ز)یشدا کۆنگرەی ڤیەننا لە ژێر ناوی هاوپەیمانی قودس شوێنی ڕێکخستنی ئەوروپای گرتەوە، لەساڵی (١٨٤٩ز) یشدا (ڤکتۆر هیگۆ) حکومەتی فەڕەنسی بانگهێشت کرد تا ڕێکخستنێکی نێودەوڵەتی بەناوی (جامیعەی ویلایەتە یەکگرتوەکان) دابمەزرێنێت، ئەمەش لەوکاتەی کۆنگرەی ئاشتی بەسترا، ئەو رایەش ڕەزامەندیەکی خێراو ڕوولەزیادی پەیداکرد.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا چەند ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی هەبوون و پێش کۆتایی هاتن بەو سەدەیە سەد دامەزراوەی جیهانی دەرکەوتن کە پەیڕەوی چەند چالاکیەکی جیاجیایان دەکرد، هەندێ جار زۆربەی خەڵك نازانن کە لە ساڵی (١٩٦٦ز)دا (١٩٧٨) دامەزراوەی ئابوری و زانستی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری هەبون کە لە چوارچێوەی هەموو جیهاندا پەیڕەوی چالاکی خۆیان دەکرد.

بێگومان یاریە ئۆڵەمپیەکان ودەستە نێودەوڵەتیەکان و پەیوەندیە سلکی و لاسلکیە خێراکان و بەرپابوونی چەند دەوڵەتێکی گەورە کە چەندین زمان و نەتەوەیان لەخۆ دەگرت وەك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت و چین کە (چین) پەنجا زمانی لەخۆ دەگرت، ئەمە چەند دیاردەیەك بوو تا مرۆڤگەراییەکی قوڵی ڕوو بە جیهانێتی بێتە مەیدان.

دیدی نێودەوڵەتیش لە سەرەتای دووچەمکی جیاوازەوە سەرنج ڕاکێشی خۆی پەیدا کرد، یەکەمیان پێی باش نەبوو نەتەوەکان تێکبشکێن، بەڵکو لە نێوان یەکدا هاریکاری بکەن، وا ئەم واتایەش دەردەبڕا کە پێویستە مرۆڤ لە خاکی ولاتی خۆیدا پێ چەسپاو بێت و چاوەکانیشی بە جیهاندا بگەڕێن.

دووەمیان (لویدگارسیۆن) لە ساڵی (١٨٣٨ز) دا قسەی لێکرد کە دەڵێت:( ئێمە تەنها دان بەیەک پاشاو یەک پرۆژە و یەک دادگاو یەک دادوەری ڕەگەزی مرۆییدا دەنێین، ولاتمان جیهانەو هەموو ڕەگەزێکی مرۆیی ڕۆڵەی ولاتمانە)، تەنانەت (مازینی) نیشتیمانپەروەری توندڕەوی ئیتالی لەساڵی (١٨٤٨ز) دا بانگەوازی بۆ نێودەوڵەتی بوون دەرکردو وای لە هاولاتیان گەیاند کە پێش ئەوەی هاولاتی بن مرۆڤن پاشان کۆنگرەی (لاهای) هات (١٨٩٩ز-١٩٠٧ز) کە بەداننان بە سیانزە ڕێککەوتنی نێودەوڵەتیدا کۆتایی پێهات، کۆمەڵەی گەلانیش دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە سویسرا لەساڵی (١٩٢٠ز)پێکهات.

********************

## ٤- چەند خواستێکی جیهانێتی:

هەروەك چەند خواست و ئاراستەیەکی جیهانێتی لە فەرەنسا و ئەمریکا پێش سەدەی بیستەم و دواتریش دەرکەوتن، شۆڕشی فەرەنسی دروشمی (ئازادی-برایەتی -یەکسانی)بەرز کردبوویەوە، ئەمەش هەرواو بێ واتا نەبوو، بەڵکوو لە دەرون ودڵە خاوەن دیدە جیهانێتیەکانەوە بوو کە خۆیان سەپاندبوو بەسەر واقیعی شۆڕشەکەداو بە دەربڕینی سەرکەوتنی ئەو دیدە بەسەر دیدی دەمارگیری ڕەگەزیدا خۆی نواند.

هەروەك جەنگی ناوخۆی ئەمریکی (١٨٦٢ز-١٨٦٥ن)ڕاگەیاندنی (لنکۆڵن)ی لێکەوتەوە کە تیایدا کۆیلایەتی پووچەڵکردەوە و جەختی دەکردوە لە بانگەواز کردن بۆ یەکسانی، لەکاتێکدا شەمەندەفەری نەتەوایەتی کە بە خێرایی ئێستا نەدەچوو مرۆڤی بەرەو تەقینەوەیەك دەبرد کە بوویە هۆی پێکدادانی بەشەکانی ئەو شەمەندەفەرە لە نێو خۆیدا، ئەمەش لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بوو کاتێك نەتەوە ئەوروپیەکان لە نێوان خۆیاندا پێکیاندادا.

لە ئەنجامی ئەوەدا چەند هاوارێك بەرز بوونەوەو بانگەوازی لابردنی نەتەوایەتیان دەکرد، بۆنمونە (ویلین)ی مێژوونوسی ئینگلزی دەبینین کە لە کتێبە جیا جیاکانیدا بانگەوازدەکات بۆ حکومەتێکی یەکگرتوی جیهانی و پەروەردەیەکی گشتگیر، لە کتێبی (کورتەی مێژووی جیهان) دا کە لەساڵی (١٩٢٠ز) دەرچوو دەڵێت: ( خەڵکی برایەتیەکی جیهانی پێکدێنێن و هەموویان بنەڕەتێکی هاوبەشیان هەیە کە سنوری دیدی تاکەکەس و گەلەکان ڕەچەڵەکیان دەبڕێت و تێکەڵیان دەکات و بەرەو یەکگرتنێکی کۆتایی دەچێت لە سەرەنجامێکی هاوبەشی نێوان هەمواندا، ئەویش لەسەر ئەم هەسارە بچوکە نادیارەی نێو هەسارەکان).

گەورەترین بەڵگەش لەسەر توندبونەوەی خواستی جیهانێتی خۆی دەنوێنێت لەدەرکەوتنی دەستەی نەتەوە یەکگرتوەکان و ڕاگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤدا کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم هاتە دی.

لەڕوانگەی خستنە ڕووی ئەو دیاردانەدا، دەبینین هزری جیهانی ڕاڕا بووە لە نێوان بارێکی هەستی ڕووتەندا کە وەك دیاردەی یەکەم شتێك لە واقیعیدا نیە (دیاردەی یەکەم کلێسایە)، هەروەها لە نێوان بارێکی بێسوودی پەیڕەوی دا، وەکدیاردەی دووەم کە شیوعیەت نەیتوانی ئامانجە جیهانێتیەکانی بەدەستبهێنێت، لەگەڵ بارێکی گشتیدا کە واقیعی پەرچەکرداری هەردوو دیاردەی پێشوو لەخۆی دەگرت، دواتر دەبینن دیمەنەکانی ڕەوتی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری تەواو بە پێچەوانەی ئەوەوەیە بەو دەربڕی واقیعێکی بزاوی خاوەن کارایی توندە.

********************

## * ڕەوتی ڕەگەز پەرستی:

لە ڕوانگەی ئەم دیاردانەوە خۆیان نیشان دەدات:

### ١-دارمانی کڵێسا:

کلێسا لەسەر ئاستی بیروباوەڕیان یاسادانان بارێکی وای نەمابوو کە دەرفەتی مانەوەو بەردەوامی پێبدات، بەڵکوو درێژە کێشانیشی تا سەدەی شانزە لەبەر چەند لایەنێکی باشە نەبووە کە لە ناوخۆدا هەیبووبن، بەڵکوو لەبەر چەند هۆکارێکی زۆری دەرەکیەوە بوون، لەوانە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی مەسیحیەتی وەرگرت و وەك پێناوێك بۆ قەڵەمڕەو دەسەڵات لە دەرەوەو فەرمانڕەوایی پێکردنی لەناوخۆدا جەختی لەسەر دەکردەوە، لەوانە دەرکەوتنی ئیسلام و کرانەوەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی بەڕوویدا و فراوانبوونی دەسەڵاتی تا ئاستێك هەڕەشەی لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و دەسەڵاتی بەسەر ئەوروپادا دەکرد.

کڵێساش پێناوێکی بەرگریکردن لە خۆبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی کشانی بەردەوامی ئیسلامی، هەروەها ئەوروپا دەستی دابوویە نەزانی و خورافیات و کڵێسایش پێشڕەوی ئەو خورافانەی دەکرد لە ژێر دروشمی (چرای هۆشت بکوژێنەوەو کوێرانە بڕوا بهێنە).

ئەو هۆکارانە بەدرێژایی دە سەدە فشاریان لەسەر ئەوروپا هەبوو، کڵێساش بەناڕەزایی قبوڵی کرد تا پێناو و هۆکارەکانی چاکسازی ئایینی دەرکەوتن و هێندەی نەبرد دەبوون بەهۆکاری شۆڕشی دژ بە کڵێسا.

هێزەکانی شۆڕش لە ژێر فشارێکی کەڵەکەبوونی زۆری هەستی ستەم و دواکەوتەییدا ئەوروپایان بەرەو توندوتیژی برد کاتێك کڵێسایان بە نوێنەری ئایین دەزانی، بەوە هەڵمەتەکەیان گۆڕا بۆ سەر ئایین و دژ بە هەر ڕۆڵێکی ئایین بوون لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و رامیاریدا، لە نێوەندی ئەم ئاراستەیەشدا بانگەواز بۆ ملهوڕی دەرکەوت، بەوجۆرە ئەوروپا لە ساختەی ئاینیەوە بەرەو ملهوڕی چوو،

لێرەدا ئەو ڕاستیە دەرکەوت کە دەبوو بناسرایە، ئەویش هەستی ڕەگەزپەرستی بوو کە بە نەمانی بیرۆکەی یەك خودا هاتە دنیا.

سەرەتای هەستی نەتەوەیی لە ئەوروپا بەگۆڕانی کڵێسا لە ئەوروپا لە کڵێسایەکی جیهانی کاتۆلیکیەوە کە چەند کۆمەڵە کڵیسایەکی نەتەوەیی لەخۆ گرت هاتە مەیدان.

لەژێر کاریگەری هزرو ڕاکانی (مارتن لۆثەر)دا (١٤٨٣ز-١٥٤٦ن)کڵێسای ئەڵمانی لە کڵێسای دایك جیا بوویەوە و ناوی کڵێسای پرۆتستانتی لەخۆی ناو دواتریش گوازرایەوە بۆ بەریتانیا لە سەر دەستی (هنری هەشتەم) (١٤٩١ز-١٥٤٧ن)، لەوێشەوە لەسەر دەستی (کالڤن) (١٥٠٩ز-١٥٦٤ن)برا بۆ فەرەنسا.

ئەمە سەرەتای ژیانی نەتەوەیی نێو ئەوروپا بوو، ئەوکات یەکبونی جیهانی مەسیحی شلۆق کەوت و زمانی لاتینی دەسەڵاتی خۆی بەسەر شوێنکەوتوانی کڵێسا جیابوەکاندا لە دەستدا، ئەمەش گەورەترین دیاردەی لەدایکبوون بوو، بەرەبەرە خواوەندی نەتەوایەتی شوێنی خواوەندی نەخۆشی کڵێسای دەگرتەوە، ئەو خواوەندەی لە چەکی زانستەکان دەترسا و دیاردەکانی دەسەڵاتی ماددی کڵێسا نەیتوانی دەسەڵاتی بەسەردا هەبێت، بۆیە دانی بە سەرکەوتنی دوژمنی سەرسەختی خۆیدا ناو ڕووی وەرچەرخاند، ئەمە بەس نەبوو تا هەستی تۆڵەسێنی نائەخلاقی نەتەوەییەکان تێر بکات، بەڵکو نەتەوایەتی بەردەوام گورزی خۆی ئاڕاستەی کڵێسا دەکرد تا دواجار بەیەکجارەکی لەمەیداندا دەریکردو جەختی لەوە دەکردەوە لە سنوری پێش مەرگدا(سەرەمەرگ) بیهێڵنەوە تا لەچەند جەنگ و چالاکی نەتەوەییدا وەك چەکێك بەکاری بهێنن.

لەلایەکی دیکەشەوە نەتەوەییەکان هەوڵیاندا بە بیری پێویستی نەتەوایەتی تێری بکەن تا بیکەنە فەلسەفەیەکی کۆمەلایەتی وا کە بۆشایی کڵێسا پڕ بکاتەوە و پاشان بەڵگەش بێت بە ڕووی ڕاستی ئەو ئاراستەدا بەو بەخشش و وتانەی کە مۆرکێکی زانستی وەردەگرت با ئەو مۆرکانە ساختەش بن.

ئەوکات عەلمانیەت و دیموکراتیەت وەك فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی نەتەوەیی دەرکەوتن، بیردۆزەکانی (داروین) و (جۆبینۆ) وەك چەند ڕاستیەکی زانستی وا دەرکەوتن کە ڕاستی پەیامی نەتەوایەتی بە شێوەی زانستی بسەلمێنن.

## ٢- سیستمی کۆیلایەتی:

لە دیمەنەکانی دەسەڵاتی گیانی ڕەگەزپەرستی لە سەدەی کۆتاییدا درێژەدان بوو بە سیستمی کۆیلەگیری لە ئەوروپا تا کۆتاییەکانی سەدەی پێشوو، ئەوەش شاهیدێك دەبێت لەسەر دڕەندەیی ئەوروپاو لادانی ئەو ڕێنسانسەی کە کەسانی وەك (مۆنتیسکیۆ) (١٦٨٧ز-١٧٥٠ز)ڕێبەرییان دەکرد و لە کتێبەکەیدا (هۆکارەکانی گەورەیی و ڕووخانی ڕۆمان)دەڵێت:

(ئەگەر من ئەرکم بێت بەرگری لەو مافەی خۆمان بکەم کە لە گرتنی زەنجە ڕەشەکان بە کۆیلەدا بەدەستمان هێناوە، ئەوا من دەڵێم گەلانی ئەوروپا دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکایان لەناوبردن و هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لە بەکۆیلەکردنی گەلانی ئەفریقیا تا لەبەدوادا گەڕانی بەشە چڕوپڕو دوورەکانی ئەمریکادا بەکاریان بهێنن، گەلانی ئەفریقایش چەند کۆمەڵێکی ڕەنگ ڕەش هەر لە نوکەپێیانەوە تا سەریان و لوتیان پانە، پەنا بەخوا کە ئەو هەموو داناییەی هەبێت کە بکرێت گیانێك یان بەتایبەتیتر گیانێکی پاکی نێو ئەو جەستەی ڕەشە لەناو ببەیت)، وەك ئەوەی بە بەکۆیلەگرتنی ئەفریقیەکان گلەیی و پۆزش بۆ لەناوبردنی هیندیە سورەکان بهێنێتەوە.

بازرگانی کۆیلە لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەی زاینیدا لەسەر دەستی پورتوگالیەکان دەستیپێکرد و دواتر هەموو دەوڵەتانی ئەوروپا شوێنیان کەوتن تا ئەوەی شاژنە ئیلیزابیی یەکەم (١٥٥٥٨ز-١٦٠٣ز)لەو چالاکیەی (جۆن هۆکنری) گەورە کۆیلەفرۆشی مێژوودا بەشداری کردو کەشتیەکی دایەدەست بەناوی (یەسوع)، ئەوکات ١٩٢ کەشتی ئامادە کرا بوون تا لە ئەفریقاوە کۆیلە بگوازنەوە بۆ بەریتانیا.

کاتێك پێویستی بیانووهێنانەوە بۆ ئەو کارەساتە مرۆییە یان فراوانکردنی چوارچێوەکەی هات، ئیلیزابێت داوای لە پیاوانی ئایینی کرد فەتوایەك بدەن کە بیانوویێت بۆ ئەو کارە، ئەوانیش خێرا چوون بەدەم داواکەیەوەو بەڵگەنامەی ئەو مۆڵەت پێدانەش بۆ ئەوان ئامادە کرابوو، ئەویش چیرۆکی هەژاری (کەنعانی کوڕی نوح)ە کە تەورات ناڕاستی بۆ خۆی و باوکی هێناوەو دەڵێت نووح ڕۆژێك خەوتووەو جلی سەری لاچووە تا لەتاو زۆری بێئاگاییدا عەورەتی دەرکەوتووە، کاتێك هۆشی بەبەردا هاتەوە کوڕەکانی پێیان وت کەنعانی برای سەیری عەورەتی باوکی کردوە، بۆیە نوح نزای کرد تا نەوەی کەنعان ببنە کۆیلەی نەوەی براکانی دیکەی.

نووسەری (التبشير و الاستعمار)قسە لەسەر ئەو بیرۆکانە دەکات ودەڵێت:(نامۆیی ئەوەش لەوەدایە ئەورووپیەکان گەیشتونەتە سەدەی بیستەمی مێژووی شارستانیەت، هێشتا بڕوایان وایە (بەتایبەت ئینگلیز و ئەمریکیەکان)کە کۆیلایەتی ڕەوایە و بازرگانی کردن بە مرۆڤەوە وەك بازرگانی کردنە بە لۆکەو مریشکەوە).

سەدەی هەژدە بە شۆڕشی پیشەسازیەوە هات و پێویستیەکی زۆری بەدەستی ئیشکەر هەبوو، بۆیە عەقڵیەتی سەرمایەداری بەرەو ئەفریقا چوو تا لەوێوە کۆیلە بگوازێتەوە بۆ کارگە ئینگلیزیەکان بە هێندەی ئەوەی ئەمڕۆ نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەدزن، ئەورووپیەکان بۆ ئەوکارە (نەبیل)یان دانابوو، بەردوداریان دەگواستەوە، چونکە ڕەشپێستی ئەفریقی بە ئیشکەرێکی لێهاتووی پیشە خوازراوەکانی بەریتانیا ناوی هاتبو.

بەموچەیەکی وا کاریان پێدەکردن کە بەشی خۆراکی رۆژی نەدەکرد، ئەمە ئەورووپای بەرەو تاوانێکی نوێ برد کە ئەویش دەستگرتنە بەسەر وڵاتانی ئەفریقیادا و هەڵسوکەوتکردنە بەسەرەنجامیان، وەك چۆن نەوتی ئەمڕۆ چاوی

کـوێر کـردون تـا هەڵـسوکەوت بکـەن بەوڵاتـە نەوتیـەکانی وەك میرنـشینەکانی کەنداوەوە.

ئـەوروپا سـەرەڕای بانگەشـەکردنی بـۆ یەکسانی و مـافی مـرۆڤ لـە ئـەمریکا و فەرەنسا نەیتوانی دەستبەرداری کۆیلەخوازی بێت، چونکە ئەو بانگەشانە ڕیشەی پێویـستیان نـەبوو، جـا هەرکـە شۆڕشـی فەرەنـسی ئـازادکردنی کۆیلـەکانی داگیرگەکانی ڕاگەیاند بەو بانگەشەی ناتوانێت بە بێ کۆیلە بمێنێتەوە ئەو دیاردە درەندە ئەوروپیە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم مایەوە تا ئەوەی کۆنگرەی ڤیەننا لە ساڵی (١٨١٥ز) دا کۆیلایەتی هەڵوەشاندەوە.

بەریتانیا لە ساڵی (١٨٣٣ز) ئەو بڕیارەی لە داگیرگەکانیدا گرتەبەرو لـە ساڵی (١٨٤٧ز) یـشدا سـوید ئـەوەی کـرد، پاشـان فەڕەنـسا لـە سـاڵی (١٨٤٨ز) دا، بـەڵام ئەوانـەی ئـەمریکا بـەردەوام لـە ژێـر تونـدی و ڕەقـی کۆیلایەتیـدا دەژیـان تـا سـاڵی (١٨٦٣ز)، ئـەوکات سـەرۆکی ئـەمریکی بڕیـاری لەکارخـستنی کۆیلایـەتی دەرکـرد، بەڵام ئەمە نەیتوانی بەتەواوەتی شێوەکانی جیاکاری ڕەگەزایەتی لـەناو ئـەورووپادا لەناو ببات.

## ٣- ئیستیعمار:

بڕیارەکـانی هەڵوەشـاندنەوەی کۆیلایـەتی لـە ئـەورووپای ئەوکاتـەدا دەرفـەتی بەڕابوونی ویـژدانی وڵاتـانی ئـەوروپی نـەدا، بـەڵکو لەڕاستیدا بڕیاری گواستنەوە بوو لە بەکۆیلەگرتنی تاك و چەند کۆمەڵێکی دیاریکراوەوە بۆ بەکۆیلـەگرتنی گـەلان بەتەواوەتی، جا لە و بڕیارانـەدا دوای چەسپاندنی ئـەزمونی ئیستیعماری ئـەوروپا لـە جیهـان ودڵنیـابوونی لـە داهـاتوی تیایـدا وەك هێزێکـی زاڵـی خـاوەن توانـای تاڵانکردنی گەلان و داڕنینی سامان و هەڵسوکەوتکردن بە سـەرەنجامیان، هـەروەك گەشـەدانە بـە   کارگە ئەوروپیـەکان بۆ ئەوەی پێویستی کۆیلایـەتی تـەواو بێـت و جەخت دەکرایـەوە لـە پێویـستی بـازاڕو کەرەسـتەی خـاو، لـە دەرەنجـامی ئەمـەدا

سەردەمی ئیستیعمار دەرکەوت بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر وڵاتان و بردنی سامانیان و گۆڕینیان بە بازاڕ تا بەرهەمە پیشەسازیەکانیان بفرۆشن.

ئەگەر بێکاری ئابووری بۆ کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی وامان لێبکات ئیستیعمار بە دیاردەیەکی سەرمایەداری بزانین، ئەوا شیکاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی وامان لێدەکات بە دیاردەیەکی ڕەگەزپەرستیشی بزانین، چونکە ئەو کۆمەڵگەیە چەند خالێکی جەختکردنەوەی هەن کە سەرمایەداری و ڕەگەزپەرستی لە پێش هەموویانەوە دێن، دیدی ڕەگەزپەرستی بارێکی قووڵی پێکهێنانی پیاوە سپیەکە خەریکە لە توندی بڕوابوونی پێی بێتە شتێکی سروشتی تیایدا، ڕێنیسانسی نوێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕوانگەی بەخششە هزری و دەرونیەکانی و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش لە ڕێی هەستکردنی بەوەی داهێنەری ژیارە بەدرێژایی مێژوو، ئەو دیدەی بەهێزتر و توندتر کردەوە، هەموو ئەمانەی بەبیانوو دەزانی بۆ دەستگرتن بەسەر جیهانداو بەدەستگرتنێکی شەرعی خاوەن مافی شەرعی دەزانی.

لەسەر ئەم پاشخانە ڕۆشنبیریە ئیستیعمار وەك بزووتنەوەیەکی سەرشۆڕکردنی گەلان و ملکەچکردنیان بۆ دەسەڵاتی خۆی دەرکەوت و بۆ هەر شوێنێك بچوایە ئەو پاشخانە ڕەنگیدەدایەوە لەسەر ئەو وڵاتەو تیایدا بانگەوازکردنی بە هەموو شێوەیەك بۆ نەتەوایەتی و ڕەگەزپەرستی بەبی بەبێ هیچ ترسێك لە دەرەنجامە خراپە ناوچەییەکان لەسەری ڕەنگیدەدایەوە، ئاخۆ نەتەوەپەرستی کە لەڕۆژئاواوە هاتبوو یان بە پێی ویستەکانی ڕۆژئاوا بەشێوەیەکی ناوچەیی دروستکرا بوو، هەمیشە دڕندەیەك بوو، نەوەك لەبەر ئەوەی واتای ڕۆژئاوایی بۆ نەتەوەپەرستی ناگونجێت، بەڵکو لەبەرئەوەی ناکرێت لە ماڵی دوژمندا ئەو چەمکە دابتاشین.

(براتواند راسل) پاش قسەکردنی لەسەر پێشینەی کەشوهەوا یان میراتی لە ئاکاری مرۆڤدا دەڵێت: (پارێزکاران و ئیمپریالیەکان جەخت لەسەر میراتی

دەکەنەوە، چونکە سەر بە ڕەگەزی سپین)بڕیارێکی دیکەی ڕۆژئاوایی پێی وایە (دیدی نەتەوایەتی لەوڵاتانی دیموکراتیدا لە دەوروبەری سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بوویە هۆی چەند ئاراستەیەکی ڕەگەز پەرستی لەڕێی هزری ڕۆژئاواگەری بۆ جیهان لە ڕێی پیاوی سپییەوە، پاشان دوای ئەوە بڕوایان بەوە بوو گەلانی ئەسمەرو گەلانی دی پێش ناکەون و پێویستە ملکەچی دەسەڵاتی پیاوی سپی بن، بۆیە بانگەوازیان کرد بۆ پاراستنی وەچە گەورە سپییەکان کە خاوەن دەسەڵات و ڕێبەرایەتی بوون).

(جان تۆشار)یش لە کتێبەکەیدا(مێژووی هزرە سیاسییەکان) بە توندی جەخت دەکاتەوە لەسەر پەیوەندی ئیمپریالیەت بە داریۆنیزمی نوێوە، پێدەچێت ئیستیعمار کە ڕۆژێك دروشمی جیهانێتی هەڵگرتبێ، لەبەر ئەوە بێت هەڵوێستی ئیستیعماری لەسەر شانۆی جیهانی وای خواستبێت، هەروەك ئەگەر ویسترا ئەوە پەردەیەك بێت بۆ چالاکی ئیستیعماری کە بیەوێت ناوچەکانی قەڵەمڕەوی خۆی لەچەند خولگەیەکی دیاریکراوی نێودەوڵەتیدا زیاد بکات، یان لەبەر هۆکارێکی دەرەکی وەك ئەوەی لە سییەکاندا ڕوویدا کاتێك هیتلەر بە نەتەوەپەرستییە توندەکەی جیهانی ترساند، ئیدی هاوپەیمانان ئەویان بەدەرفەتێکی باش زانی بۆ قەڵەمڕەو پەیداکردن لە جیهاندا. ئەمەش لە ڕێگەی بانگەوازکردن بۆ جیهانێتی و ئەو بانگەوازەش بوو بە درشمێکی پڕ برق و باقی ئەو کات.

## ٤- سەهیۆنیەت:

لەو جیهانەدا کە ڕەگەزپەرستی وروژاندبووی سەهیۆنیەت دەرکەوت و هیوای خوازراوی خۆی بەدیکرد و سەرکردە سەهیۆنیەکان لە (بال) لە سویسرا لە ساڵی (١٨٩٧ز) دا کۆنگرەیەکیان بەست و تیایدا چەند بڕیارو بنەمایەکی بنەڕەتییان بۆ بزووتنەوەکەیان دانا، لەوانە جەختکردنەوە لەسەر گرنگی چەسپاندنی بیروباوەڕی گەلی جوولەکە بەوەی ئەوان گەلی هەڵبژێردراوی خوان، هەروەها پێویستی تەفروتوناکردنی گەلان و ئایین و نیشتیمانەکان، لەگەڵ ئەوەی جوولەکە هەر لە کۆنەوە بانگەوازیان دەکرد بۆ حکومەتێکی جیهانی، بەڵام تەنها دەستگرتنی ئیسرائیلی بوو بەسەر جیهاندا.

## ٥- زانستە ڕەگەزپەرستیەکان:

پێویستە هەمیشە زانستەکان لە نێوان مەزهەبەکاندا بێلایەن بن، بەلاّم زانستە مرۆییەکان کەمجار وا دەبن و زۆربەی جار دەبنە قوربانی ئاراستەی لێکۆڵەرو بیروباوەڕی لە ژیاندا، بۆیە کڵێسا زۆری توندی خۆی بەسەر زانستەکاندا دەسەپاند، ڕێنسانسی نوێیش ئاراستەی خۆی بەسەر زۆربەی بەرنامە زانستیەکاندا سەپاند، ئەو هەڵەی زانایانی ڕێنسانسی نوێ تێیکەوتن ئەوە بوو ئەو فەرزە زانستیانەیان بەرزکردەوە وایان دەبینین چەند شایەتیدانێکی دیاریکراوی چەند یاسایەکی زانستی بووە کە وەك چەند راستیەکی کۆتایی دایان دەنان و لە نێو خەڵکدا بەوجۆرە بلاّوبویەوە.

ئەوە گەورەترین لادان بوو بەرامبەر بە مافی زانستەکان، چونکە گواستنەوەی هزری لە قۆناغی فەرزبونەوە بۆ یاسای زانستی ماوەیەکی دوورو درێژ و چەندین لێکۆڵینەوەی چڕو پڕ و بە هێزو فراوانی دەوێت، چونکە زانستگەلێکی زیندوو وەك ئەنترۆپۆلۆجیاو بیۆلۆجیا لەو دەرفەتە بێبەش بوون و ژمارەیەك لە زانایان خێراییان تیادا کرد تا هزری خۆیان لەوبارەوە بلاّوبکەنەوە، لەمەشدا هەواداری بۆ سەردەمی ڕێنسانس پاڵی پێوەنان.

ئەوەش کاریگەریەکی خراپی گەورەی لەسەر ژیانی مرۆیی هەبوو بۆ نمونە بیردۆزەکەی داروین لە دروستبوون و گەشەسەندندا لە گەورەترین نێوەندە گرنگیپێدراوەکانی تاك و کۆدا وەك یاسایەکی زانستی و ڕاستیەکی کۆتایی دانرا، نەوەك لەبەرئەوە بەو شتە قەناعەتیان هێنابێت، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو بیرانەیان بەسەرخەری رامیاری و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی خۆیان دەزانی، بۆیە بە (تەزکیە)بردیانە قۆناغی یاسای زانستیەوە تاوا بگەیەنن ئەوە سەرخەری زانستیانە.

پاشان ئاراستەی رامیاری یان ڕۆشنبیری یان کۆمەلایەتییان نەدەکرا تێکبشکێت، بۆیە لە ژیانی سیاسیاندا وەك سەرخەری ئیستیعمار بەرامبەر گەلانی لاواز لە ژیانی ڕۆشنبیریشاندا وەك سەرخەری نەتەوایەتی بەسەر جیهانێتیدا و لە ژیانی کۆمەلاّیەتیشیاندا وەك سەرخەری نەریتی باکووری بەسەر باشووریدا ڕەنگیدایەوە.

ئەورووپییەکان لە پێشتر بەگێڕانەوی باسکراوی تەوراتی بیانوییان بۆ بازرگانی کۆیلایەتی هێنایەوە، لەسەدەی ئیستیعماریشدا بۆ دەستگرتنیان بەسەر گەلاندا بیردۆزەی سەرهەڵدان و گەشەسەندنیان کردە بیانو، وەك لە قسەکەی براتراند راسلدا بەدیمان کرد، هەروەك بیرۆکەی هەڵبژاردنی سروشتی و مانەوەی باشتر لەو بیردۆزەدا بەتەواوەتی لەگەڵ بانگەوازی نەتەوایەتیدا یەکدەگرن لەوەی هەندێ لە گەلان لە هەندێکی دی بە بەزترو باشتر دەزانن و لەگەڵ بانگەوازی ڕەگەزپەرستیدان بەو پێیەی ڕەگەزەکانی باکوور لەوانەی باشوور چاکترن.

ئەو مشتومڕە لەئەوروپا دوای دەرکەوتنی بیردۆزەی داروین لەسەر مرۆڤ لەسەر زەویدا بەڕێوە چوو، ئایا مرۆڤ یەك جۆر بووە یان چەند جۆرێك بوو، لە ئەنجامدا وتی چەند جۆرێك بووەو مرۆڤ لە ئاژەڵەوە هاتووە، بۆیە هەندێ ڕەگەزی مرۆیی هێشتا لە ئاژەڵەوە نزیکترن تا مرۆڤ، بۆیە دەبێت لەو ئاستەدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت، ئیدی بۆ نمونە بوو بە حەقیقەتێکی دانپێدانراو کە زەنجە کۆیلەکان زیاتر لە غۆریلا و شەمبازیەوە نزیکن تا مرۆڤ، شتێکی ئاسایی بوو مەیدانی مرۆیی لە پێناو مانەوە لەسەر ئەو مەیدانە ئاژەڵیەی شەریعەتە دەرونە فراوانەکەی داروین (١٨٠٩ز-١٨٨٢ز)یەکیخستبوون بچێتە مەیدانی ململانێیەوە!!

ئەو بیردۆزە ڕەگەزپەرستیەش کە (جۆبینۆ)(١٨١٦ز-١٨٨٢ز)داینا کە (ستیوارن تشمبرلین) و چەند زانایەکی دیکەی ڕەگەزناسی بوون، تیایدا ئەفسانەی ڕەچەڵەکەکانی باکووری هێناوەو بڵندی بەوان داوەو کەوتن و داڕمانی بە بێجگە لەوان داوە، یاسایەکی چەسپاوی داناوە بۆ هۆشی ڕەگەزپەرستیەك کە مێژووەکەی دەگێڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەی زاینی، کاتێك پێش ئەوە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەگەزەکان و بەرز ڕاگرتنی یەکیان بەسەر ئەوی دیکەدا نەبوو.

*******************

## ٦- هزری ڕەگەزپەرستی:

هەروەها هزری رەگەزپەرستی تەواو لە ئەڵمانیاوە دەرکەوت و هەر لە دەستپێکردنیەوە ئەڵمانیا بنکەی هەرەگەورەی بووە، جا لە ساڵی (١٨٠٧ز) دا لەماوەی داگیرکاری فەرەنسا بۆ (بەرلین) ئەو دەقە لە نێوان ئەڵمانیەکان بڵاوبوویەوە (ئەڵمانیەکان لە نێو گەلانی نوێدا تەنها ئێوەن تۆوی پێشکەوتنی مرۆییتان وەرگرتووە)، جا ئەگەر ئێوە لەناو بچن هەموو مرۆڤایەتی لەگەڵتاندا لەناو دەچێت.

هەروەك (هوستون تشمبرلین) بانگەشەی ئەوەی ئەکرد شارستانیەت شارێکی خاوەن هەموو شتە بۆ کەسانی دی و شارێکی بێ هیچ شتە بۆ جوولەکەو هیچ شتێك بەرەهایی فەزڵ و گەورەییەکەی بۆ ڕەگەزە پارێزگارە ڕەشەکانی باشوور نیە، هیچ شتێك کەمە یان شێوە نەبوونیە کە بگەرێتەوە بۆ ڕەگەزە زەردەکانی یابان و چین، یان کەمتر لە هیچ بگەرێتەوە بۆ ڕەگەزە سامیەکانی فەلەستین و بابل و میسر.

نیتشه (١٨٢٤ز-١٩٠٠ز)بە بیردۆزەی مرۆڤی باڵاوە هات تا ڕەگەزی (تۆتۆنی) بەوە دابنێ و بڵێت گەشەو پێشکەوتن پێویستی بەوەیە ڕەگەز و جۆرە باڵاکان خزمەت بکرێن، ئەو یەکێك بوو لە بانگەشەکەرانی فەلسەفەی هێزو دەسەڵاتداری ئەڵمانی سەرسامیش بوو بە بیردۆزەکەی داروین، بەڵام ئەو پێی وابوو شتەکە لە دەست یاسای هەڵبژاردنی سروشتیدا نەمێنێتەوە، بەڵکو بۆ پاراستنی ڕەگەزە باڵاکان لەوانی دیکە دەبێت دەستوەردان هەبێت.

(کریستیان لاس) (١٨٧٨ز) ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیش گرنگی جیاکردنەوەی نێوان ڕەگەزە ئاریەکان و ڕەگەزە سامیەکان و بەرزدانانی عەقڵی و تایبەتمەندی ئاریەکان بەسەر سامیەکانی نیشانداوە، ئەو پاڵپشتی هەڵمەتەکەی ئەرنست ریتانی فەیلەسوفی فەرەنسی دەکرد دژ بە گەلە سامیەکان، لەکاتێکدا (ئیشپنگلەر) لە کتێبەکەیدا (دارمانی ڕۆژئاوا) کە لە ساڵی (١٩٢٠ز) دا بڵاوبوویەوە پێی وایە پەیامی ئەڵمانی بەرگریکردنە لە سنوری ژیانی ئەوروپی لە بەرەو ڕووبوونەوەی ئاسیاو ڕەگەزە ڕەنگاو ڕەنگەکاندا.

## ٧- جیاکاری ڕەگەزی:

دیاردەیەکی دیکەی بۆگەنی سەردەمی ڕەگەزپەرستی ئەورووپا دیاردەی جیاکاری ڕەگەزیە، جا پاش سەرهەڵدانی زانستی ڕەگەزدۆزی چەند دەستەواژەیەك دەرکەوتن وەك (دەسەڵاتداری پیاوی سپی و پیسی ڕەگەزی زەرد)ئەم دەستەواژانە لە نێو گەلاندا دەوترانەوە، ئیسپانەکانیش لەو بوارەدا پێشڕەو بوون و زاناو بڕیارەکانیان خراپی هەڵسوکەوتی هیندە دانیشتوانیەکانی ئەمریکای باشووریان هێنابوونە پێش چاو و وایان نیشان دەدا هەڵسوکەوتیان نامرۆییە، چونکە ئەوانە ڕەگەزێکی بە بنەڕەت نامرۆیین، ڕەگەزە ئەورووپیەکانی دیکەش کە کۆچیان کرد بۆ ئەمریکای باکوور وەك ئیسپانیەکان.

هەروەها ئەو سپی پێستانەی بەرەو ئوستورالیا کشان، ئیشیان کرد لەسەر لەناوبردنی ڕەگەزە بنەڕەتیەکان، ئەگەر تا ئەمڕۆش ئەو دانیشتوانانە لە کیشوەری ئوستورالیادا شوێنەوارێکیان ماوە لەبەرئەوەیە لەبەر سەختی ڕێگەی هاتوچۆ لە قۆناغی یەکەمدا دەستی سپی پێستەکانیان پێ نەگەیشتووە، بەڵام سپیەکان توانییان دانیشتوانی دورگەی (تمانیا)ڕیشەکێش بکەن و یەك کەسیشیان لێ نەمایەوە، ئیدی بەڕەگەزی هەڵوەشاوەو لەناو چوو ئاماژەیان بۆ دەکرا.

لەئەمریکایش هاوسەرگیری نێوان سپی و ڕەش لە هەموو ویلایەتەکانی باشوورو دوانزە ویلایەتی باکوریشدا قەدەغە بوو، پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو لا لە ساڵی (١٨٩٠ز-١٩١٠ن) خراپ بوو تا ئەوەی دەڵێن زۆر خراپتر بوو لە پێش لەکارخستنی کۆیلەگەرایی، دوژمنایەتی توند بوویەوە تا ئەوەی هەندێکیان هاواریان دەکرد ڕەشپێستەکان لەنەوەی مرۆڤ نین، هەندێکی دی پێشنیاریان دەکرد تا هەرچی ڕەش پێستە لەناو ببرێت، کاتێك ٤٥٠ کۆیلەی موسڵمانی ناو ئەمریکاو وێرایان لە لائیحەکانی هەڵبژاردندا ناوونووس بکەن، سپیەکان ڕێیان نەدەدا خۆراك بۆ منداڵەکانیان بکڕن هەروەك ئەوانە نەیاندەتوانی گاز بۆ ماڵەکانیان و بەنزین بۆ سەیارەکانیان بکڕن.

لە باشووری ئەفریقایش چیرۆکی جیاکاری ڕەگەزی تیایدا توندبوو، ڕوونتر لەوەی پێویستی بەخستنەروو یان وردەکاری بکات، هێندە بەسە کە بنەماو فەلسەفەی دەسەڵاتی بریتیبوو لە جیاکاری.

بەڵام بەشی نامۆی نێو چیرۆکی جیاکاری ڕەگەزی لە جیهاندا ئەوەیە کە ئەو ڕەشانە هەرچەندە بچوونایەتە ناو ئایینی سپیەکانەوە هێشتا هیچ گۆڕانێك لە تێڕوانینی سپی بۆ ڕەشەکان بەدی نەدەکرا چونکە ڕەشە سەرکەوتوەکان هیچ یەکسانیەکیان لەگەڵ برا سپیە ئەورووپیەکانیاندا نەبوو، نە لە دەوڵەت و نە لە کڵێسادا، هەرچەندە هاوارێکی نارەزایی بەرامبەر سیاسەتی جیاکاری ڕەگەزی هەبوو، بەڵام دەستەیەك لە ڕێبەرە هۆڵەندیەکان بێلایەن لەو پرسەدا وەستان ودەرگای کڵێسا گەورەکانی ئەفریقایان لە ڕووی مەسیحیە ڕەشپێستەکاندا داخست.

(توینبی) جەخت لەوە دەکاتەوە کە (دیارترین کینایەیەك ڕێگەی نێو کۆمەڵگەی پرۆتستانتی ئەورووپیت بۆ ئاسان دەکات ڕەنگی دەموچاوە، ئەگەر قەدەرت وابوو ڕەنگاڵین بیت ئەوا کەسێکی نەخوازراوی هەرچەندە توانای عەقڵیشت هەبێت).

(مالکۆلم)ی ڕێبەری زەنجیش (کۆیلەکان)دەڵێت:(خێرا خەڵکی دەرگات لە ڕوودا دادەخەن و هێندە بڵێیت زەنجیم دەبیتە داوی دەستیان بەبێ ئەوەی بڕواننە ئەو لێهاتوویەی هەتە تەنانەت ئەگەر دەرچووی زانکۆی هارفەرد بیت).

*******************

## ٨- بزووتنەوەی نەتەوایەتی:

وەك دەستکەوتێکی کۆمەڵە هۆکارێکی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، نەتەوایەتی وەك دیاردەیەکی ڕەگەزپەرستی دیکەی دیاردەکانی سەردەمی ڕەگەزپەرستی نێو ئەورووپا دەرکەوت، لە پێش هەموو ئەو هۆکارانەدا داڕمانی کڵێساو نەمانی بیری جیهانێتی ئەورووپاو دەرکەوتنی زمانە نەتەوەییەکان بوو بەو جۆرەی کە پێشتر بۆمان ڕوونبوویەوە.

جا دوای ئەوەی خواستە پاپاییەکان لە کارگێڕی کاتی جیهانی مەسیحیدا داکەوتن، مۆرکی نەتەوایەتی ناوچەکان بەڕوونی لە فەڕەنساو ئینگلتەرەدا دەرکەوت.

(جۆن.م. هامرتن) دەڵێت: (لە ئەنجامی ئەو هێزانەی بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی و بزووتنەوەی زیندوکردنەوەی زانستەکان دەریاندان، یاسا نەتەوەییەکان بەرەبەرە شوێنی ئەو سیستمانەیان گرتنەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوون).

هەروەك جەنگە گاڵتەجاریەکانی ناپلیۆن بەرامبەر بە گەلانی ئەورووپاو باکوری ئەفریقا ڕۆڵیان هەبوو لە بەدیارخستنی هەستی نەتەوەیی لایان و نەتەوایەتی بەردەوام بەرەو سەر هەڵدەزنیو ڕۆشنبیری و زانستە ڕەگەزیەکان لەلایەك و گیانی ئیستیعماریش لەلایەکی دیکەوە و نەبوونی بیری ئاینیش لەلایەنی سێیەمەوە گەشەیان پێدەدا تا ئەوەی جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی پێهات و دەوڵەتی عوسمانی ڕووخا، بەوە کۆتا هێمای سیاسی جیهانێتی لەسەر زەویدا کەوت و لەمەیدانی مرۆییدا کەست بەدی نەدەکرد بەرگری لێ بکات جگە لە چەند هاوارو بانگەوازو بیرێك نەبێت کە لە کێشی نێودەوڵەتییاندا لە سنووری هەست تێپەڕ نەدەبوونو نەدەگەیشتنە ئاستی هێزی کاریگەری ڕامیاری.

*******************

## ٩- نازیەت و شۆڤێنیەت:

دەمارگیریی ئەورووپی گەیشتە ئەوپەڕ کاتێک هێزەکانی خۆی کۆکردەوەو قورسایی خۆی خستەسەر گۆڕینی هەموو ئەو دیاردە ڕەگەزپەرستانە لەسیاسەت و کۆمەڵناسی و ڕۆشنبیری و زانستدا هەن تا تەواو چڕیان بکاتەوە بۆ نێو دەمارگیری ڕەگەزی خۆی، ئەویش ئەو نازیەتە بوو کە ئەوپەڕی لوتکەی ڕەگەزپەرستی نێوجیهان بوو.

هیتلەر لە کتێبەکەیدا (خەباتی من)بیرە ڕەگەزپەرستیەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، دەکرێت چەند قسەیەکی بە پوختی وەربگرین، ئەو دەڵێت( چی ژیاری مرۆیی دەبینیت لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ بەرهەمی چالاکی ئاری داهێنەر، ئاری تا ئەمڕۆش چرای خوداییەو ڕێی بەردەم مرۆڤ ڕووناک دەکاتەوە و ئەو لێهاتووییەی خوا پێی تایبەت کردووە لە تەوێڵی ڕووناکیەوە دەردەچێت، هەر ئەو بوو دەرگای ڕێگاکانی مەعریفەی لەبەردەم مرۆڤدا کردەوە تا بۆ چەند سەدەیەک بیکاتە گەورەی هەموو بوون)بەرامبەر ڕەگەزەکانی دیکە هەڵوێستی خۆی دەستنیشان دەکات ودەڵێت (سروشتیش پێچەوانەی تێکەڵکردنی ڕەگەزەکانە، چونکە ئەو تێکەڵکردنە مرۆڤ بەرەو دواوە دەگێڕێتەوە(بنیاد نانی ژیارەکان ئەوە دەخوازێت ئەو ڕەگەزە داکەوتوانەی لە شوێن داهاتە ماددیەکاندان بەکاربهێنرێنن ژیارە مرۆییە یەکەمینەکان پشتیان دەبەست بە بەکارهێنانی گەلە وەزعیەکان پێش ئەوەی پشت ببەستن بەبەکارهێنانی ئاژەڵان)، ئەو پێی وایە ڕۆڵی هەرە بەهێز دەکرێت زاڵ بێت و ناکرێت تێکەڵ بە لاواز ببێت، دەوڵەتیش بەدەزگایەکی ڕەگەزی دەناسێنێ.

بێگومان ئەو دیدو بیرانەی هیتلەر شارێکن بۆ داروینیزمی نوێ وەك (ئان پۆلك)ڕایدەگەیەنێت بە ڕاستی ئەم دروستکراوە نامۆیە بەبیرە کلێپەسێنە ڕەگەزپەرستیەکانی ئاگری جەنگی جیهانی دووەمی کردەوەو لەجەنگدا تەنها شەش ملیۆن جوولەکە کوژران (بەپێی هەندێ سەرژمێری یان مەزندە)، مرۆڤایەتی پێی وابوو بەمردنی هیتلەر کۆتایی بە قۆناغ ودەمی ڕەگەزپەرستی نێو مێژووی نوێ دێت، بەڵام ئەو ئەنجامە پڕ ژان و خەفەتەی تایبەتمەندانی ڕێکخراوی (یونسکۆ) پێی گەیشتن، ئاماژە بەوەدەدات ئەو دیدە تێڕوانینێکی بەرتەسکە، چونکە زاڵبوونی ڕەگەزی لەزۆرینەی سپی پێستەکان ڕیشەی داکوتاوەو خۆیان بە گەورەترو بەرێزتر دەزانن.

# کەوتنی گەورە

پاش کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم لە جیهاندا بە شێوەی ڕەسمی و جەماوەریش هاواری پاکتاوکردنی ڕەگەز پەرستی و هەموو هەوادارییەکی ئەو بیرە بە میراتی ڕۆشنبیری و سیاسی و جەماوەریش هواری پاکتاوکردنی ڕەگەز پەرستی و هەموو هەوادارییەکی ئەو بیرە بە میراتی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەلایەتییەوە بەرزبوویەوە. بۆیە دامەزراندنی دەستەی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕاگەیەنراو ڕاگەیاندنی جیهانی مافی مرۆڤ دەرچوو کە دەڵێت مرۆڤەکان بە ئازادی و یەکسانی لەدایك دەبن.

چەندین دەستەی نێودەوڵەتی ئەرکی پاکتاوکردنی شوێنەواری ڕەگەزپەرستیان لەجیهاندا گرتە ئەستۆو ئیمزای ڕێککەوتنەکەش کرا تا هەموو شێوەکانی جیاکاری ڕەگەزی لابرێنن لە هەموو شوێنێك هاوار بۆ بیری مرۆڤگەراییەکی جیهانی کرا تا شوێنی نەتەوایەتی دەمارگیری بگرێتەوە، ئەوروپا بەو ئاڕاستەیە چوو، بەڵام شتەکە لەمەدا مرۆیی نەبوو بەڵکوو ئەویش تووشی دەردی ڕەگەزپەرستی ببوو و ئەوروپا لە جیاتی ئەوەی ڕەگەزپەرستیەکەی فڕێ بداتە ناو دەریاوە فڕێی دایە ناو وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە و ڕایگەیاند ئەمە بە پێی دڵسۆزی دیاردەیەکی گرانبەهایە هەروەك ئەوەی دەرمانی ژەهراوی و شمەکی خراپ بنێرێت وابوو.

جا لە وڵاتانی عەرەبیدا بەریتانیا جامیعەی عەرەبی دامەزراندو ئەمریکایش پرۆژەیەکی ئامادە کرد تا زنجیرە کودەتایەکی نەتەوەیی سۆسیالیستی ڕووبدەن، بەوە نەتەوایەتی عەرەبی شێوەیەکی هزری و ئاڕاستەی ڕۆشنبیری وەرگرت دوای ئەوەی پێشتر تەنها هەستێکی سادەو ساکاری بوو.

لەناوچەی دڵیشدا قەوارەی رەگەزپەرستی سەهیۆنی دانرا کە بارێکی بەسەر ناوچەکەدا دەسەپاندو ڕەوایی دەدا بە بیری عەرەبی تاوەك ئاڕاستەیەکی سیاسی هزری هەبێت.

# (باسی دووەم)

# (سەردەمی چاکسازی ئایینی)

لە ئەورووپا لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەی زاینیدا دوو رشووداوی گەورە روویاندا کە کاریگەری ڕوون و بەهێزیان هەبوو لە مێژووی ئەوروپاو ڕۆژئاوادا بەگشتی، ئەوانیش بریتیبوون لە:

یەکەم: زۆرێك لەسەرکردەکانی ئەوروپا پەیوەندی خزمایەتییان بەست، ئەمە بوو بەهۆی یەکسختنی میرنشینەکانیان لە ڕێگەی میراتیەوە تا ئەوەی کە دەگەینە لای ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم دەبینین فەرمانڕەوایەتی ئیمپراتۆریەتێکی کردووە کەدوای رشووخانی ئیمپراتۆریەتەکەی شار لەمان تا ئەوکاتەی شتی وا نەبووە، بەڵکوو ئیسپانیاو ئیتالیاو داگیرکەرەکانی ئیسپانیا لە پشت دەریاکانەوە لە نێو سنورە فراوانەکەیدا بوون.

دووەم: بەرپابوونی شۆڕشێکی ئایینی لە ئیمپراتۆریەتەکەی شار لەماندا کە کەسی ئایینی ناو ڕۆژئاوای ڕامالی و مەزهەبی پرۆتستانتی هێنایە کایە کە تا ئێستاش لە زۆربەی بەشەکانیدا زاڵە، مەبەستمان لەم باسەدا ئەوەیە شتێك لە سەر هەڵدان وگەشەسەندنی ئیمپراتۆریەتەکەی شارلەمان و ئەو پێشەکیە ڕامیاریانەی بزانین کە ڕێخۆشکەر بوون بۆ شۆڕشی ئایینی.

پێش ئەوەی چیرۆکی ژن و ژنخوازی نێوان پاشایانی ئەروپا بگێڕینەوە. پێویستە چاوێك بگێڕین بەبنەماڵەی هۆبسبۆرگدا کە شار لەمان سەربەوان بوو، پاشان هۆکاری سەرهەڵدانی ئیسپانیاو چوونە نێوەندی ڕکەبەری نێودەوڵەتی ڕۆژئاوای لێکبدەینەوە.

رۆدۆلف یەکەمین کەسی ناسراوی بنەماڵەی هۆبسبۆرگ بوو کە لەساڵی ١٢٧٣ز دا وەك ئیمپراتۆر هەڵبژێردراو دەستگرت بەسەر دۆقی نەمساو دۆقی

ستیریادا و لە دوای خۆی ئەو دەسەڵاتەی بەجێهێشت کە چاکترین هۆی بەرزی و شانازی بنەماڵەی هۆبسبۆرگ بوو و هەردەم پشتیان پێ دەبەست.

ئەوەیەك بەسەر مردنی ڕۆدۆلفدا تێنەپەڕی تا ئەوەی سەرکردەکانی ئەڵمانیا ئیمپراتۆری خۆیان لەفەرمانڕەوایانی ناوچە نەمساویەکانی هەڵبژارد، بەوە ئەو پێگەیە لە هۆبسبۆرگەکاندا بەر تەسك بوویەوەو ئەوانیش هێندەی گرنگیان بەماڵ و سامان و سەروەتی تایبەتی خۆیان دەدا، هێندە گرنگیان بە ئیمپراتۆریەت نەدەدا، بەوە ناوی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز بوو بە خەیاڵێك کە هیچ ڕاستیەکی نەبێتز

ڤۆلتێر ڕاست دەڵێت کە لەبارەیەوەدەڵێت: ئەوە ئیمپراتۆریەت و ڕۆمانی و پیرۆزیش نیە، کاتێك مەکسیمیلیانی یەکەم لەسەرەتاکانی سەدەی شانزەدا بوو بە ئیمپراتۆر، کچی شارلی پاشای بەرگەنمایی بەهاوسەر گرت بەمە زەویە نزمەکان و بەلجیکاو چەند بەشێکی فەرەنسای ڕۆژهەلاتی تا نەمسا کەوتە ژێر ئیمپراتۆریەتەکەی، پاشان کوڕەکەی کە میراتگری دەسەڵاتی بوو (فلیپ)کچە میراتگری کورسی دەسەڵاتی ئیسپانی بەمیرات گرت، بەمە دەسەڵاتی هۆبسبۆرگ چەند بەرامبەر زیاد بوو، ئەرکی سەرشانمانە کەمێك ڕوومان بەرەو ئیسپانیا وەرچەرخێنین تا بزانین لە ژێر دەستی موسڵمانان‌دا لەماوەی دەسەڵاتیان لە ئیسپانیا چی بەو وڵاتە هات؟

فەتحی ئیسلامی بۆ وڵاتی ئەندەلوس ڕێڕەوی مێژووی ئەو وڵاتەی گۆڕی و وای لێکرد لە مێژووی هەموو گەلانی دیکەی ئەوروپی جیاواز بێت، لەیەکەمین ئەنجامەکانی بریتیبوو لەگۆڕینی بەشێکی گەورەی دانیشتوان بۆ ئایینی ئیسلامی و بەهۆی ئیسلامەوە ئیسپانیا گەیشتە پلەیەکی باڵای پێشکەوتن لەماوەی سەدەی دەیەمدا.

لەو سەدەیەدا ئەوروپا نغرۆی نێو تاریکایی نەزانی و پشێوی دەرەبەگایەتی بوو، لە و ڕۆژانەدا شاری ئاشتی پێگەیشت و خەڵکی ئەندەلوس بە قووت و عەرەب و بەربەرەوە تێکەڵ بوون و کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی زۆر بە

خێرایــی بــەو پێــشکەوتنی بــرد و زانــست گەشــەی ســەند و خونــچەی هونــەر کرایەوەودەنگی شاعیران و گۆرانی بێژان بەدەرکەوت و کۆشکە بەرزو ڕازاوەکان بە نەخشونیگاری جوان هەیکەلی بەرزەوە دەرکەوتن و ئاوکێشی تیایاندا ئەنجام دراو لە بوارە جیاجیاکانی شیعرو فەلسەفەو ئەدەبدا قسە ئالوگۆڕ دەکرا.

قورتوبە ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە نیو ملیۆن کەس، لە هەموو لایەکیەوە زانکۆ و کۆشکی پاشایەتی هەبوو و پڕ بوو لە مزگەوت و ژمارەی مزگەوتەکانی چوار هەزار مزگەوت بوون ئەمە لەگەڵ منارە بەرزو ڕاوەستاوەکانیدا، ژمارەی حەمامە گشتیەکانی سێ سەد حەمام یان زیاتر بوون، لەو ماوەیەدا قورتوبە لە گەورەترین شارەکانی جیهان بوو ئەگەر یەکەمین شاری گەورەی جیهان نەبووبێت، تیایدا هەزاران خوێندکار دەبینران کە لە بەشە جیاجیاکانەوە بۆ وەرگرتنی زانست هاتبوونە ئەوێ.

کەسێك کە چەندین کاتژمێر لەدەرەوەی شاردا ڕێی دەبڕی، هێشتا تیشك و ڕووناکی قورتوبە ڕێی بۆ ڕووناك دەکردەوە، ئیدی پایتەختی ئەندەلوس وەك ڕووناکیەکی ناوجەرگەی تاریکایی وابوو، تاریکایی ئەو تاریکایی شەوو تاریکایی نەزانی و ئەو خورافانەی کۆمەڵگەی بەربەری ئەورووپی گرتبوویەوە، لەو ماوەیەدا زانستەکانی ئەورووپا لە دەماغی تەسکی پیاوانێکی ئاینیدا بەرتەسك ببوویەوە لەکاتێکدا ئەوانە خوێندنەوەو نوسینیان باش نەدەزانی، بەڵام ئەو شارە پرشنگدار و ڕازاوەیە سەد ساڵ زیاتر نەژیا تا ئەوەی لە نیوەی سەدەی یانزەیەمی زاینیدا خیلافەتی قورتوبە ڕووخا و وڵات شلۆقی تێکەوت و بەربەرەکانی ئەفریقیا شاڵاویان بردە سەرو دواتر چەرمەسەری یەکلەدوای یەك ڕوویکردە ئەندەلوس.

پاشان مەسیحیەکان لە باکوور خۆیان ئامادە دەکرد تا نیمچەدوورگە بۆ جاری دووەم بگرن، جا هەر لە ساڵی (١٠٠٠ز)ەوە چەند شانشینێکی بچووك لە باکوری ئیسپانیا دامەزران وەك (قشتالە)و (ناڤار) و (ئارکۆن)، یەکەمیان لە هەموویان بەهێزتر بوو، بۆیە لەگەڵ موسڵماناندا جەنگاو لەساڵی( ١٠٧٥ز )دا طلیطلة ی گرت.

ئارکۆنیش ناوچەی خۆی بەگرتنی بەرشەلۆنەو دۆڵی ئەبروا فراوانکرد، هەر لەساڵی (١٢٥٠ز) هان قشتاڵە دەسەڵاتی خۆی بەسەر باشووردا سەپاند و قورتوبە کەوتە نێو بازنەی دەسەڵاتیەوە.

دوای ئەوە مەغریبیەکان ماوەی دووسەد ساڵ لەناوچەی شاخاوی غەرناتە لە نیمچە دوورگەدا مانەوە، قشتالە لەو ماوەیەدا سەرقاڵی بارگرژی ناوخۆیی خۆی بوو و جەنگی نێوانیان ڕووی لە توندی کرد، بەڵام وا ڕوویدا لەساڵی( ١٤٦٩ز) دا ئیزابیلا شاژنی قشتاڵە هاوسەرگیری لەگەڵ فردیناندی بەرپرسی ئارکۆن ئەنجامدا، لەم یەکیتیەوە هێزێك پێکهات کە ناوێکی گەورەی بۆ ئیسپانیا پەیدا کرد لە نێو وڵاتاندا تا ئەوەی بوو بە بەهێز ترین دەوڵەتی جەنگی ئەوکاتی ناو ئەورووپا، فردیناند و ژنەکەشی لەیەکەم ڕۆژی هاوسەرگیریانەوە جەنگی دژ بە موسڵمانان و گرتنی نیمچە دوورگەیان لە ئەستۆی خۆیان گرت، لەساڵی( ١٤٩٢ز) دا غەرناتە کەوتە دەستیان و کلیلەکانی کۆشکی سووریان کەوتەدەست، ئەوکۆشکە لەوپەڕی بەرزی بنیادی ئیسلامیدا بوو، بەوجۆرە ئەستێرەی موسڵمانان لە ئەندەلوس کەوتە خوارەوەو تەنها چەند یادگاریەکی شێوە خەیاڵیان بۆ مایەوە و بیسەر کەدەبیسێت وەك خەیاڵ دێتە پێش چاوی.

لەهەمان ئەو ساڵەی تیایدا غەرناتە کەوت، کۆڵۆمبس ئەمریکایی دۆزیەوە، بەمە دەرگایەك بۆ ئیسپانیا کرایەوە کە لەوێوە خەزێنەی زێڕو زیوی بێ سنوری کۆدەکردەوە ئیدی پیاوە ستەمکارەکانی وەك (کۆرتین)و (بزراو)کەوتنە ستەم لە خەڵکی مەکسیك و پیرۆو ماڵو سامانیان بردن و دەیانناردەوە بۆ ئیسپانیای وڵاتیان، بەهۆی ئەو سامانەی کە لەجیهانی نوێوە دەیهێنا وایکرد لە ئەورووپادا پایەیەکی دیارو بەرچاوی هەبێت.

بەڵام وڵات لەبەر بەخت خراپی خۆی چاکترین کەسەکانی لەدەست دا، ئەوانەی زیاترین چالاکییان هەبوو کە بریتیبوون لەعەرەب و جوولەکە، ئەوانە چاکترین ڕشەگەزی بەرهەمهێنی نیمچە دوورگە بوون بەڵام مەسیحیەکان زۆر

بەتونـدی دەیانـچەوساندنەوە، ئیـزابیلایش دادگاکـانی پـشکنینی گێڕایـەوەو هەرکەسـی بکەوتایەتەدەسـت بـەبیانووی ملـهوڕی دەیکوشـت یـان دەیـسوتاند، سـەدەیەکیش بەسـەر مردنیـدا تێنەپـەڕی تـا ئـەوەی کۆتـا موسـڵمانان لـەو وڵاتـەدا دەرکرا کە پێشتر بەچەند نەوەیەك ئینجا بنیادیان نابوو، بە چوونی موسڵمانەکان چاکترین ڕەگەزی کار نەماو بزووتنـەوەی ئابووری پـەکی کـەوت وتـا ماوەیـەکی زۆر هۆشی بەبەرخۆیدا نەهاتەوە.

وتمـان ئیمپراتـۆر مەکسیمیلیان کچی فلیپـی میراتگـری کورسـی فەردنیانـد و ئیزابیلای هێنا، بەڵام فلیپیش پاش لەدایکبوونی شارلی کوڕی بەچەند ساڵێك دوای ئـەوە مـرد، ژنەکەیـشی دوای مردنـی تێکـچوو، بـەوە شـارلی کـوڕی و نـەوەی مەکسیملیان نیازی کورسـی دەسـەڵاتی ئیسپانیاو تـاجی ئیمپراتۆریشی هـەبووە، ئەو ئاواتەشی هاتە دی کاتێك لـە سـاڵی( ١٥١٦ز) دا ماکسیمیلیانی باپیری مرد، شارل لەو ماوەیەدا گەنجێکی شانزە ساڵ بوو، لـە منداڵیشەوە لـە زەویـە نزمەکانـدا گەورە ببوو، بۆیە زمانی ئیسپانی بەباشـی نەدەزانی یـان دەروونـی ئیسپانیەکانی نەدەناسی بەرەو هـەر کوێ بڕۆیشتایە هەستی بـە کـەنارگیری خـۆی دەکـرد، خێـرا گومـان وگورزی بەرهەڵستکاری لـە هـەموو میرنشینە ئیسپانیەکاندا ڕووی تێکـرد، چونکە ئیسپانیا وڵاتێکی یـەکگرتوو نـەبوو هـەر بەشـێکی وڵاتەکـەش داوای دەکـرد دان بە مافە تایبەتیەکانیدا بنرێت و ئەو چاکسازیانەش کە دەیەوێت ئـەنجام بدرێن پێش ئەوەی دان بە پاشایەتی شارلدا بنێت.

کاتێك شای گەنج هەوڵیدا دەسەڵاتی خۆی لە وڵاتی ئیسپاندا بەهێز بکات تـا نازنـاوێکی گـەورەی دەسـتکەوت کـە ڕۆڵـی زیـاتر دەکـرد، ئـەویش نازنـاوی ئـەو ئیمپراتۆریەتە بوو کە مەکسیملیان هەوڵێ بۆ دەدا تا دوای خۆی بۆ نەوەکەی بێت، سەرکردەکانی ئەڵمانیا شارلیان وەك ئیمپراتـۆر هەڵبـژارد، تەمـەنی ئـەوکاتی بیـست سـاڵ بـوون لـە فرانـسوای یەکـەمی پاشـای فەڕەنـساش بـەرزتریان ڕاگـرت، بەمـە بـە ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم یان (شارلەمان)ناو دەبـرا، شـارل کـە هـات بـۆ وڵاتـی نوێی

هیچی لێ نەدەزانی، تەنانەت ئەو زمانەی کە هەرگیز فێری نەبوو بوو، دەسەڵاتیشی کە دەستی پێکرد شەپۆلی چاکسازی ئایینی تیایدا دەرکەوت، بۆیە بەدرێژایی ژیانی تووشی هیلاکی کرد و گرفت لەدوای گرفت دەهاتە ڕێی.

ئەگەر بمانەوێت لەو جەنگە تێگەین کە بەدرێژایی ماوەی دەسەڵاتی شارلی پێنجەم هەڵگیر سابوو، پێویستە لایەك بکەینەوە بەلای ئەو کێشانەدا کە جێی ململانێی نێوان هاوڕێ پاشاکانی بوون پێش ئەوەی بێتە سەر کورسی دەسەڵات، یەکەم باسوخواسیش کێشەی ئیتالیا بوو کە بەماوەیەکی کورت بوو بە مەیدانێکی جەنگی وڵاتانی ئەوروپا لە ئیسپان و فەڕەنسا و ئەڵمانیا.

شارلی هەشتەمی پاشای فەڕەنسا (١٤٨٣ز-١٤٩٨ز)پیاوێکی دانانەبوو تا بتوانێت مافی تەواو بە بارودۆخەکان بدات، بەڵکو هەر لەیەکەم ڕۆژیەوە چاوی بڕیە گرتنی قوستەنتینیە وهێرش بردنە سەر تورکەکان، بۆبەدیهێنانی ئەو ئاواتەشی بڕیاریدا سەرکردایەتی سوپاکەی بەرەو ئیتاڵیا بکات و دەستبگرێت بەسەر ناپۆلیدا، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد ناپۆلی بەمیرات لە باوکی وەرگرتووە، ئەوکات لە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەراکۆندا بووە، ئەوەی یارمەتیدا ئەو ئاواتەی بێتەدی پشێوی باری سیاسی ناو ئیتاڵیاودابەشبوونی وڵات و پێکدادانی توندی نێوان دەوڵەتە بچوکەکانی بوو.

لە ئیتاڵیا هێزێك نەبوو ڕێ لە هاتنەناوی بیانی بۆ ناو وڵات بگرێت و یەکێتی نێوان بەشەکانی بەدیبهێنێت، لەساڵی( ١٤٩٢ز) دا لۆرینزۆی پاشای فلۆرەنسا لە بنەماڵەی مەدیتشی مرد، ئەو بەهێز ترین کەسێك بوو کە توانی بەتەواوەتی هەوڵبدات بۆیەکخستنی وڵات، دوای مردنی شوێنەکەی چۆڵ بوو تا لە فلۆرەنسا پیاوێکی ئایینی بەناوی (سافوناروڵا)شوێنی گرتەوە، لەناو خەڵکدا وتاری دەدا و بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکرد و هەڕەشەی خراپەیەکی توندی ئەو بارگژیانەی دوچاری بەشەکانی وڵات ببون تووشی وڵات ببێت.

کاتێك سافوناڕولا هەواڵی هاتنی پاشا ئەفرەنسیی بیست کە هاتبوو هێرش بێنێتە سەر وڵات پێشینیەکەی خۆی دووپات کردەوە و وتی ئەوە ئەو خراپە چاوەڕشوان کراوە بوو، کاتێك شارل لەشاری فلۆرەنسا نزیك بوویەوە خەڵکەکەی لەدژی بنەماڵەی مەدیتشی ڕاپەڕین و هێرشیان بردە سەر کۆشکەکانیان و سێ کوڕەکەی لۆرینزۆیان دەرکردن، بەوە سافوناڕولا بوو بە تاکە کەسێك کە چاوەکان ڕووی تێبکەن، شارل پێش ئەوەی بێتە ناو شارەکە سافوناڕولا دەرفەتی پێدا، بەڵام فلورەنسیەکان بەشێوەی بێزراوی ناڕەزای بوون و پێیان وت کە ڕازی نین وەك داگیرکەرێك بۆ ماوەیەکی زۆر لە شارەکەیاندا بمێنێتەوە، بۆیە پاش هەفتەیەك بەسوپاکەیەوە پاشە کشەی کردو بەرەو باشوور چوو تا بیگرێت.

هێزی دووەم کە شارل لە هەڵمەتی ئیتاڵیا بەرەو ڕووی بوویەوە، هێزی پاپا بوو کە ناڕازیبوو بە بوونی سەربازگەی فەڕەنسی لە پاڵیداو لێی دەترسا، بەڵام پاپا نەیدەتوانی بەرامبەر ئەو سوپا زۆرە بوەستێتن بۆیە بەجێی هێشت و بەرەو باشوور ڕووەو ناپۆلی کشا.

شارل لەسەرەتادا سەرکەوتنێکی دیاری بەدەستهێناو خێرا ناپۆلی کەوتەدەستی، بەڵام جوانی سەرکەشی و ڕازاوەیی ئیتاڵیا سوپاکەی لەناو برد، دوژمنانی توانیان یەك بگرن، فردیناندی پاشای ئەراکۆن نەیدەتوانی شارل ببینێت لە نزیك سقلیەی ژێر دەستیدایە و دەترسا دەستی بەسەردا بگرێت، هەروەك مەکسیمیلیان ڕازی نەبوو ئیتاڵیا بکەوێتە ژێر دەستی پاشایانی فەڕەنسا، لەباری لەو جۆرەدا شارل دەیویست ڕۆژێك زووتر بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی و ڕووی وەرچەرخاندو سوپاکەشی بەدوایدا گەڕانەوەو ئەوەی لە دەروونی خۆیدا هێشتەوە کە لەو هەڵمەتەیدا شکستی نەخواردووەو جگە لە جەنگێکیدا نەبێت لەکاتی گەڕانەوەی لەو وڵاتەی کە دەیویست بگیرێت.

هەڵمەتەکەی شارل بۆ سەر ئیتاليا هەر لە یەکەم هەنگاویەوە ناگرنگ بوو، بەڵام کاریگەریەکەی گەورە بوو، ئەو هەڵمەتەدەوڵەتانی ئەوروپای لە لاوازی هەستی نەتەوەیی لای ئیتاليا بێدار کردەوە، ئەوەش چاوچنۆکی ئەو دەوڵەتانەی بزواند تا

داگیری بکەن، بۆیە تا نیوەی سەدەی نۆزدەیەمی ملکەچی دەسەڵاتە بیانیەکان بوو، بەتایبەت ئیسپانیاو نەمسا، ئەویش هۆکار بوو بۆ گواستنەوەی بزووتنەوەی ڕێنسانس لە ئیتالیاوە بۆ باکووری ئەوروپا، چونکە فەڕەنسیەکان لەماوەی مانەوەیان لەوێ فێری ئاستی هونەری ئیتالی و ڕۆشنبیری ئیتالی بوون و تۆوی ڕێنسانسیان لە ئیتالیاوە بۆ باکوور هەڵگرت و هەرگیز بۆی نەگەڕانەوە.

بێگومان لێرەدا چەند هەوڵێکی گەورە هەن کە فەڕەنسیەکان لە چەسپاندنی جێبێیان لە میلاندا خستیانە گەڕن هێندە بەسە بڵێین شارلی هەشتەم پاش گەشتەکەی ئیتالیای هێندەی نەبرد مرد و لویسی دوانزەیەم شوێنی گرتەوەو داوای دۆقیەی میلانی دەکرد لە باکورن،بەڵام فرۆشتنی بەفردینانەی پاشای ئەراکۆن و ناپۆلی لەباشوور، بەڵام شکستی خوارد و بەهۆی دژایەتی پاپا بۆی هیچی دەستنەکەوت.

لەساڵێ (١٥١٥ز) دا گەنجێکی بیست ساڵە هاتە سەر کورسی دەسەڵاتی فەڕەنساو قەدەری وا بوو دوای ماوەیەکی کەم بێتە یەك لەناو دارترین پاشاکانی فەڕەنسا، ئەو گەنجە نەرمونیان و سەرقاڵی هونەر و پیاوانی هونەری بوو، گرنگی بەزانست و ئەدەب دەدا و زۆر سەرقاڵی بینای جوان و بنیادنانیان بوو، فرانسوا بەسەرکەوتنێکی دیار لە هەڵمەتێکیدا بۆ ئیتالیا دەستی بەدەسەڵاتداری خۆی کرد، ئەو بە سوارەکانیەوە لە ڕێگەیەکەوە کە کەس بڕوای نەبوو ئەسپ پیادا تێپەڕ بێت کەوتە ڕێ و سویسریەکانی تێکشکاند، سویسریەکان لە خزمەتی پاپا دا بوون، پاشان میلانی گرت و بەدوای ئەوەشدا دەرگای دانوستان لەگەڵ پاپا (لیۆی دەیەم)کرایەوەو پاپا وەك دۆقی میلان دانی بە فرانسوا دا ناو ئەویش بەرامبەر بەوەدەستبەرداری فلۆرەنسا بوو و بۆ جاری دووەم فلۆرەنسا گەڕایەوەدەست بنەماڵەی مەدیتشی، پاپا لیۆش سەربەو بنەماڵەیە بوو، پاش چەند ساڵێك کۆماری فەرەنسا دانی نا بە دۆقیەی (توسکانی)داو پێگەی گەورەی خۆی لەدەستداو دوای ئەوە ئەو پێگەی بۆ نەگەڕایەوە.

سەرەتا پەیوەندی دۆستایەتی نێوان هەردوو پاشای گەنجدا (فراشواو شارل)زاڵبوون بەڵام چەندین هۆکار وایلێکرد پێکدا بدەن و زنجیرە جەنگێکی بێسنور بەرپا بکەن، گرنگترین ئەو هۆکارانەش بریتین لە:

١- فەرەنسا دەکەوتە نێو هەردوو لەپی ئەڵمانیاو ناوچەکانی شارل لە باکوورو باشوور گەمارۆیان دا بوو، سنووری سروشتی پێویستی ئاستی دەوڵەتیش قەرەبووی بۆ کردوەتەوە.

٢-فەرەنسا و ئەڵمانیا لە ململانێدا بوون لە سەر چەندین بەشێکی بەرگەندی، هەر کامیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد مافی خاوەندارێتی بۆ ئەوەو هیچکام نەیاندەدایە دەست ئەوی دیکە.

٣- شارل پێی وابو ئەو میلانی لە ماکسیمیلیانی باپیرەوە بەمیرات وەرگرتووە، بەڵام پاشایانی فەرەنسا لە پێناو ئەوەی لە دەستیاندا بمێنێتەوە سەربەخۆ مانەوە، ئەو هۆکارانە و هۆکاری دیکەی لەوجۆرە ژیانی هەردووپاشای ڕکەبەرو هاوسەردەمەکانیان پڕ جەنگ کردو هێزی هەردووکیان ماندوو پەککەوتە بوون. ئاگری ئەو جەنگەی ئەو دوانە بەرپایان کرد دوو سەد ساڵ دوای مردنیان بەردەوام بوو ئاگرەکە توندتر بوویەوەو بەلەناو چوونی بنەماڵەی هۆبسبۆرگ و زاڵبوونی فەرەنسا کۆتایی پێهات.

شتێکی ئاسایی بوو هەریەک لەو دوو پاشا ڕکەبەرە داوای یارمەتی لە پاشای ئینگلتەرا بکەن، ئەویش گەنجێکی جوان و خۆشەویست بوو، کە هاتە سەر کورسی دەسەڵات تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، هێنان و تەڵاقدانی ژنی زۆر ناوی دەرکردبوو، گەردینال (توماس ولزی) وەزیری کوشتی، ئەمەش کاتێک ژنی یەکەمی (کترین تارکۆنی)تەڵاقدا. هنری لەو چیرۆکەدا کە شارل و فەرەنسوا پەیرەویان دەکرد ڕۆڵێکی گرنگی بینی، ئەو نێوەندی پاراستنی هاوسەنگی نێوان دوو هێزو پاڵەوانی سێیەمی ڕۆمانەکە بوو.

لەساڵی( ١٥٢٠ز) دا شارل بەرەو ئەڵمانیا کەوتە ڕێ و تاجی ئیمپراتۆریەت لە ئەکس لاشایل چاوە ڕەوانی دەکرد، لە ڕێگەیدا بە ئینگلتەرا دا تێپەڕ بوو تا هنری هەشتەم بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، بۆیە دیاری بەسەروەزیری و کەردینالی ڕێنوێنید (دولزی)ڕژاند تا ڕەزامەندی ئەو بەدەست بهێنێت پاشان درێژەی بە ڕێی خۆی دا بەرەو ئەڵمانیا، لۆثترکە بانگەوازی توندی شۆڕشی دژ بە بە پاپای دەکرد لەوێ چاوەڕوانی بوو.

# ئەڵمانیا پێش چاکسازی ئایینی

ئەو شۆڕشە پرۆتستانتیەی لەسەدەی شانزەدا ڕوویدا، یەکەم شۆڕشی نەبوو بەڵکو پێش ئەوە شۆڕشی لە بنچینەکان لەباشووری فەڕەنساو بوهیمیەکان هەبوو بۆ بوهیمیەکان لە نوسینەکانی (وکلف)ەوە سروشتیان وەردەگرت و لەنەریت و ئاکاریاندا لەکڵێسا جیابوون، کڵێسا بەهۆی دادگاکانی پشکنینی و بەندینخانە تاریکەکانی و کوشتن و سوتاندنی خەڵکەوە توانی ئاگری ئەودوو شۆڕشە بکوژێنێتەوە.

لەگەڵ ئەو توندی و هێزەی کە کڵێسا پێوەی دەنازی، بەڵام خەڵکی بۆی ڕوون بویەوە کە ئیدی ئەوە نەما کە هەموو دانیشتوانی ڕۆژئاوای ئەوروپا ملکەچی دەسەڵاتی پاپا بن، مارتن لۆتەر لەساڵی(١٥٢٠ز) دا خوێندکارانی زانکۆی (وتبرك)ی کۆکردەوەو بردنی بۆ دەرەوەی شارو لەوێ دەستورو دروشمی کڵێسای سووتاندو بەوەش یاخیبوونی خۆی لەکڵێسا و پاپاش ڕاگەیاند، ئەویش بەسوتاندی ئەو نوسراوەی پاپا دژ بە لۆتەرو ڕێنماییەکانی ئاڕاستەی کردبوو.

خێرا لەبەشە جیاجیاکانی ڕۆژئاوا لە ئەڵمانیاو سویسرا و ئینگلتەراو ناوچەکانی دیکەی خەڵکی کەوتنە ڕەخنە گرتن لە کڵێسای کاسۆلیکی و هەوڵیاندەدا چەندین کڵێسایەکی دوور لە دەسەڵاتی پاپا دابمەزرێنن، لەمەشدا ئەو سەرکردانە پاڵپشتیان بوون کە خێرا بنە نوێکانیان وەرگرتبوو، بەو جۆرە ئەوروپا دابەشبوو بۆ دووبەشی پرۆتستانتی و کاسۆلیکی، پرۆتستانتی لە باکوور (باکوری ئەڵمانیا، ئینگلتەرا، سکۆتلەندا و بەشێکی سویسرا و ئیسکەندەناڤیا)، کاسۆلیکیش لە باشوور (ئەو زەویانەی لە حەوزەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بون جگە لە ئینگلتەرا)، هەموو پرۆتستانتەکان لە نێو خۆیاندا یەکدەنگ نەبوون جگە لە دوو خاڵ نەبێت، ئەوانیش جیا بوونەوە لە پاپاو دەسەڵاتەکەی و گەڕانەوە بۆ ئینجیل و بنەما یەکەمینەکانی مەسیحیەت.

شۆڕشی دژ بە کڵێسا بانگەوازێك بوو بۆ کودەتایەکی گشتی لە شێوەی ژیان و بیریاندا کڵێسای کاسۆلیکی بە درێژایی چەندین سەدە هەزموونی خۆی هەبوو پەنجەی لەسەر کاری گەورەو بچوکی مرۆڤەکان دادەنا، قەشەکانیان کتێبیان دەنوسی و سەرۆکایەتی دەزگاکانی حکومەتیان دەکرد و وەزیرو ڕاوێژکاری بوون و حەل و عەقدو بڕیاردانیان لەدەستدا بوو. لەمەوە دەردەکەوێت کڵێسا تەنها دامەزراوەیەکی ئایینی نەبووە، بۆیە شۆڕشی دژی شۆڕشێکی ئایینی نەبووەو بەس، بەڵکوو ئایینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریش بوو، لەگەڵیشدا توندوتیژی و کۆمەڵێك چەرمەسەری لەگەڵدا بوو کە دوو سەدە یان زیاتر بەردەوام بوو و هیچ بەرژەوەندیەکی گشتی یان تایبەتیشی لە بواری کۆمەڵایەتی یان تاکەکەسی یان ئایینیەوە بەجێ نەهێشت، گەلان بەرامبەر بە یەکدی بڕیاریاندەدا، شانشینەکان ڕووەو دراوسێکانیان تیریان دەهاوێشت، ماڵەکان دابەشبوون و خەڵکیان تێدا نەماو دڵی خەڵك پڕ بوو لە ڕق و کینەو سۆزو میهریان لێ داماڵرا.

ئەڵمانیا لەسەردەمی شارلەماندا دەربڕی کۆمەڵەی دووسەد یان سێ سەد دەوڵەتۆکەیی بچووکی جیا لە یەکدی بوو لە ڕووی فراوانی و سیستمی کارگێڕیەوە، هەندێکیان دۆقێك فەرمانڕەوایی دەکرد، هەبوو کۆنتێك فەرمانڕەوایی بوو، هەشبوو لە ژێر کارگێڕی سەرۆکی قەشەکان یان قەشەیەك یان سەرۆك دێرێك دابوو. هەندێ دەوڵەتۆکە تەنها یەك شار بوون وەك (نورنبرك)و (ئۆکسبرك) و (فرانکفۆرت)، ئەو شارانە لە ڕووی سەربەخۆییەوە لە دۆقیە فراوانەکانی وەك باڤاریا و سەکسۆنیا کەمتر نەبوون، چەند دەوڵەتۆکەیەکی دیکەش بەدیدەکەین کە تەنها گوندێکی بچووك بون و لە ژێر سایەی قەڵایەکدا بوون و لە پشت دیواری قەڵاکەیەوە ژمارەیەك سوارچاك هەبوون کە لە کاروباریاندا سەربەخۆ بوون و خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە دەبرد.

ئیمپراتۆر لەگەڵ شانازی کردنی بە پێشینەی شکۆی خۆیەوە، کەسێکی لاوازی بێتوانا بوو ماڵ و سامان و کەس و سەربازی بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی

کەم بوو، هێزی حەقیقی بەدەست کەسانی بەهێزی شوێنکەوتەوە بوو، گنگترین ئەوانەش ئەو حەوت هەڵبژێردراوە بوون کە هەر لە سەدەی سیانزەی زاینیەوە مافی هەڵبژاردنی ئیمپراتۆریان هەبوو، ئەوانەش بریتیبوون لە (ماینس، تریف کۆلۆن، بلاتینات، برندنبرك، سەکسۆنی، بوهیمیا).

ئەو شارانەی کە لەو شۆرشە ئابوریەی لە بازرگانیەوە لە سەدەی سیانزەهەمەوە هاتە مەیدان دروستبوون چەند پێگەیەکی زیندووی ڕۆشنبیری نوێ بوون لە باکووری ئەڵمانیا، بۆ نموونە(نورنبرك)بە جوانی و کۆشکەکانی خۆیەوەدەینازی و بەردەوام تا ئەمڕۆش چەندین شوێنەواری هونەری ماون کە هونەرمەندانی سەدەی شانز بەرهەمیان هێنا، هەندی لەو شارانە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە ئیمپراتۆرەوە هەبووە و لەکاروباردا سەربەخۆ بون.

هەرێمە سەربەخۆکانی سوارچاکان پارویەکی ڕەوان بوون بۆ هەموان، لە هەموان دەترسان و ڕقیان لە هەموو کەس بوو، ڕشقیان لەسەرکردەکان بوو، چونکە هەمیشە سەرکردەکان بەچەند ئامانجێکی سادە دەیانڕەوانیە ئەو هەرێمانە.

لەمەوە دەردەکەوێت هەرێمەکانی ئەڵمانیا بەرەو ڕووی یەك و تێکئالاو بوو، لێرەدا دۆقیە هەبوو و لە نێوەندیشیدا دەوڵەتۆکەیەکی بچووکی کۆمەڵێك سوار چاك هەبوو، لەلایەکیەوە هەرێمێك هەبوو کە پیاوێکی ئایینی فەرمانڕەوایی دەکرد، لە لایەکی دیکەیشەوە شارێکی سەربەخۆی پەیوەست بە ئیمپراتۆر هەبوو، هەروەها دەوڵەتۆکەکانی دیکەش هەروا بوون، بۆیە ململانێ و جەنگ ڕووی لە زیاد بوون دەکرد، لێرەشدا هێزێکی مەرکەزی بوو کە بتوانێت خواستەکانی خۆی جێبەجێ بکات، چونکە کەس ملکەچی یاسادانراوەکانی ئیمپراتۆریەتی لاواز نەبوو، بەڵکو هەر سەرکردەیەك جەنگ و تالان و بڕی بۆخۆی ڕەوا دەبینی، یاسایش مۆڵەتی بەوە دەدا بەرامبەر بەوەی لە جەنگدا چەند بنەڕەت و یاسا و ڕێکخستنێکی دیاریکراو بگرێتە بەر، بۆ نمونە سەرکردە بۆی هەبوو هێرش بباتە سەر هەرشارێك بەرامبەر بەوەی بەلایەنی کەمەوە سێ ڕۆژ پێش هێرشەکەی هەواڵ بە شارەکە بدات.

ئەڵمانیا لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزەدا هەستی بە خراپی بارەکە کردو کۆڕی نیشتیمانی هەوڵیدا وڵات لە پشێوی و شلۆقی ڕزگاربکات و پێشنیاری

دامەزرانـــدنی دادگایـــەکی جـێـگیری بـەردەوامی کــرد بـۆ چارەســەرکردنی ئـەو ناکۆکیانەی لە نێوان سەرکردەکانی دەوڵەتۆکە جیاجیاکاندا ڕوویانـدەدا، هـەروەك پێـشنیازی کـرد بـۆ دابەشـکردنی ئیمپراتۆریـەت بـۆ چـەند هـەرێمێك کـە لەهـەر یەکەیانـدا هێزێکـی جـەنگی هـەبێت و جێبـەجێکردنی بڕیارەکـانی دادگـای پـێ بسپێردرێت.

چـەند سـاڵێك تێپـەڕی بـەبێ ئـەوەی بارەکـە زۆر چـاك ببێـت. بـەڵام کـۆڕی نیشتیمانی ئەمجاز بەوردەکاری و ڕێکخستنەوە کۆبوویـەوە، ئەمـە دەرگـای کـردەوە تـا لـە بـوارە گـشتیەکاندا لێکۆڵینـەوە بکـەن ئیـدی شـارەکان لەسـاڵی( ١٤٨٧ز) وە نوێنـەرانی خۆیـان نـارد، بـەڵام سـوارەکان و زۆربـەی خانەدانـەکان ئامـادە نـەبوون ملکەچی بڕیارەکانی و بڕیارەکانی ئەو دادگایە بن کە دایانمەزراندبوو.

نوسـەران ڕا جیـاوازن لـە نیـشاندانی بـاری ئـەڵمانیا لـەو ڕۆژانـەدا، ئەمـەش شـتێکی ئاسـاییە، چـونکە پرۆتـستانتەکان بـە پەڕەیـەکی بـە ئـازادی دەزانـن و مێژوونوسـە کاسـۆلیکەکانیش چـەندین سـاڵ لێکۆڵینـەوەیان دەکـرد تـا ئـەوە بسەلمێنن ئەڵمانیا لەو ماوەیەدا لەوپەڕی خۆشگوزەرانی و کامەرانییەکی بێسنوردا بووە، بۆیـە لـۆثـەربە بانگەوازەکەیـەوە هـات و وڵاتـی بـۆ چـەند دەسـتەو کۆمـەڵێك دابەشکردو کەوتنە لێدانی یەکدی، بەمە هەموو لە تاو سەختی و کوشتاردا کەوتنە هیلاکی و قوڕبەسەری.

لە ڕاستیدا ژیانی ماددی و هزری لە پەنجا ساڵێ پێش شۆڕشـی پرۆتـستانتی لە ئەڵمانیاو زۆر جیا و ناتەبا بووە زانستەکان لەلایەکەوە پێش دەکـەوتن و خـەڵکی حەزیان بەزانست زیادی دەکرد و هەموو حەزیان بەهونەری چاپخانەی نـوێ هـەبوو و کاریگەری ڕێنسانسی ناو ئیتالیاو هـەواڵی جیهـانی نـوێی ئـەو دیـوو ڕووبـاری لە خۆ دەگرت، بازرگانانی دەوڵەمەندی ئەڵمانیا جێی سەرسوڕمانی ئەوانی دی بوون، چونکە ماڵ و سامانیان کۆکردەوەو لەو پـەڕی خۆشگوزەرانیدا بوون یان لـە پێنـاو هانـدانی هونـەرو ئـەدەب و بنیادنـانی خوێندنگـەو کتێبخانەکانـدا داهـاتی خۆیـان خەرج دەکرد.

لەلایەکی دیکەوە تووڕەیی خەڵك زیادی کردو پشێوی لەوڵاتدا بڵاو بوویەوەو دز و جەردە لە هەموو بەشەکان بڵاو بوونەوەو خورافە وڵاتی گرتەوەو دڵەکان ڕەق بوون و جێی سۆزو چاکە لە دڵەکاندا نەمایەوە، هەموو هەوڵەکانی چاکسازی ناو حکومەت شکستیان خوارد، هەواڵی پێشڕەوی تورکەکان بۆ سەر جیهانی مەسیحی هات و پاپایش داوای لە دانیشتوانی ئەڵمانیا دەکرد تا لە نوێژەکانیاندا لە خوا بپاڕێنەوەو کڵێساکانیش زەنگی خۆیان لێدا تا لە خراپەی دوژمنە نامەسیحیەکانیان ڕزگاریان بێت، کاتێك قسە لەو بارودۆخە دەکەین کە بوویە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی پرۆتستانتی، دەبینین کۆمەڵێك هۆکار دێنە ڕێمان، لەوانە:

١- گۆڕینی توند بۆ هەموو دیاردەکانی حیشمەت و نەریتە کۆنەکانی پەیوەست بە ئاین و بڕوا بوونی بەو بە بەڵگەو موعجیزەکان و زیاد بوونی پایە ئایینیەکان، ئەمانە وای لە پرۆتستانتەکان کرد خێرایی لێیان دوور بکەونەوەو دەستبەرداریان بین.

٢-ویستی بەهێزو توندی خوێندنەوەی ئینجیل و بڕوا بوون بەوەی باوەڕ یەکە یەکە مرۆڤ لە تاوانەکان ڕزگار دەکات نەوەك بزووتنەوەو دیاردە دەرەکیە ڕەسمیەکان.

٣- بڕوا بوون بەوەی زانایانی لاهوت چەند کۆت و بەندێکی وایان بۆ ئایین زیاد کردووە کە بەزیاد کردنی پێناسی وردی مەنتیقی دەڕۆیشتن و سنوری بۆنەبوو.

٤- دواجار بیری کۆنی گشتی بڵاو بوویەوە، ئەو بیرە دەیوت سەرکردەکانی ئایین لە ئیتالیاو لە نێو ئەوانەشدا پاپا هیچ ئامانجێکیان نیە جگە لە کۆکردنەوەی پارە لە ئەڵمانەکان چونکە هەزرەو سووك سەیری ئەڵمانەکان دەکەن و پێیان وایە بە ئاستی ڕازی دەکرێن و گاڵتە بە عەقڵیان دەکرێت.

پیاوانی ڕێنیسانسی ئەڵمانیا لە نێو ڕیزە یەکەمینەکانی ڕەخنە گراندا بوون، یەکەمیان (ڕۆدۆلف کریکولا)بوو، ئەگەر ئەم کەسە یەکەم کەس نەبێت کە زانستە کۆنەکانی خوێندبێت و وتبێتیەوە ئەوا یەکەم کەسە کە خەڵکانی هانداوە تا ئەو

زانستە بخوێنن، ئەمەش لەبەر بەهێزی تواناى ڕاکێشانێك كە لە كەسايەتيدا هەبوو، ڕۆدۆلف لەوەدا لە هەموو هاوسەردەمیەکانی جیاوازە کە زۆر سەرقاڵی زمانی نەتەوەیی بووە، سەرەڕای سەرقاڵبوونی زۆری بەزمانی لاتینی و ئیغریقی، بانگەوازی دەکرد بۆ وەرگێڕانە نوسراوە کۆنەکانی لاتینی و ئیغریقی.

کاتێك پیاوانی ڕێنسانس زیادیان کرد، کەوتنە هێرشبردنە سەر زانکۆکان و ڕەخنەیان دەگرت لە گرنگیدانی زیادەی زانکۆکان بە مەنتیق و لاهووش خوێندنگەیی کە گوڕوتینی یەکەمی خۆی لەدەست دابوو و تەنها مشتومڕێکی ساردی بێسوود بوو، زۆری ئەو هەلانەی کە مامۆستاو خوێندکارەکان لە زمانی لاتینیدا دووچاری دەبوون بێزاری کردبوون، بۆیە بڕیاریاندا خۆیان کتێبە خوێندنگەییەکان بنووسن و بانگەوازیان دەکرد بۆ ئەوەی وانەی شاعیران و وتاربێژانی ئیغریق و ڕۆمان ببرێتە خوێندنگەکانەوە.

بەلام مامۆستایانی زانکۆکان بەرەو ڕوویان وەستان، بەمە جەنگی نێوان هەردوولا ڕووی لە توندی کرد کەمێك پێش هاتنی لۆثەر هەردوو لا پێکیاندادا، شاعیران (وەك ئەوەی خۆیان بە پیاوانی زیندوو بوونەوە ناودەبرد)لەلایەك و بەربەرەکان (کە بەمامۆستایانی زانکۆکان ناودەبران) لە لایەکی دیکەوە دەجەنگان، هۆکاری ئەو جەنگەش پیاوێك بوو بەناوی (ركان) کە سەرقاڵی وانەکانی زمانی عیبری بوو،بانگەوازی بۆ دەکرد تا وەك پێناوێك بێت بۆ ئەوانەی ئایینی مەسیحی.

بەلام مامۆستایانی زانکۆی کۆلۆن لە ڕوویدا وەستان شاعیران کەوتنە پاڵپشتی کردنی و چەند پەیامێکیان نووسی و ناویان نا (پەیامەکانی پیاوە پۆستە خوازەکان)و ئاڕاستەی مامۆستایەکی زانکۆیان کرد و ناوی خوێندکارێکی کۆنی ئەو مامۆستایەیان لێنا، لەو پەیامانەدا گاڵتەجاری و سوکایەتی نواندن بە مامۆستایان و نەزانیان بەدیدەکەین، بەو جۆرە ڕێخۆشکەرییان کرد بۆلۆثەرو شوێنکەوتەکانی تا ڕەخنە لە کڵێسا بگرن و بەرەخنە و سوکایەتی پێکردن بەرهەڵستکاران تێکبشکێنن.

(ئەرزم)سەرکردەو گەورەی تەواوی شاعیران بوو، ناوی بڵاو بوویەوەو خەڵکی بەشێوەیەکی وا خۆشیان دەویست کە لەناو ئەدیبانی جیهاندا مەگەر تەنها بۆ ڤۆلتێر هەیانبووبێت، زانا یان لەو پەڕی ئەورووپا بۆ ئەمپەڕی بە پیرۆزیان دادەنا، ئەرزم لەگەڵ ئەوەی لەشاری (رۆتردام)ی هۆڵەندی لەدایك بووە، بەلام هۆڵەندی نەبوو، بەڵکوو دەدرێتەوە پاڵ هەموو جیهان،ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بانگەشەیان بۆ دەرکرد، لە هەریەك لەو سێ دەسەلاتەدا ئەرزم ماوەیەك ژیانی بردە سەر و کاریگەریەکی قووڵی لە بیری خەڵکەکانیدا بەجێهێشت، ئەرزم وەك پیاوانی تری باکووری رێنسانس سەرخۆش بە چاکسازی ئایینی بوو، بە نوسینەکانی وێنەیەکی بالای بۆ ئایین دەکێشا کە لەو ئایینەی خەڵك لەسەری ڕاهاتبوون جیاواز بوو، خراپەی پیاوانی ئایینی و قەشەکانی بەشێوەیەکی تایبەت دەخستە بەر چاو، چونکە لە ڕۆژگارێکی تەمەنی منداڵیدا ناچار ببوو لە دێرێکدا بژیت، بە درێژایی تەمەنی چاوی لە ڕابردووی خۆی بوو و ئەو ڕۆژە سەختانەی دەهێنایەوە پێش چاو کە بەناچاری لەو دێرەدا بەسەری بردبوون.

ئەرزم ماوەیەك لە ئینگلتەرا بوو، لەوێ بوو بە هاودەمی زانایانی ئەوێ و سەرسامی دوانیان بوو، لە (تۆماس مۆر)کە یۆتۆپیای ناوداری نووسی یۆتۆپیا چیرۆکێکی خەیاڵیە و تیایدا کۆمەڵگەیەکی لەو پەڕی بەختەوەری و پێشکەوتندا خستوەتە ڕوو، هەروەها (جۆن کولت)کە مامۆستای زانکۆی ئۆکسفۆرد بوو، کولت لەبارەی پۆلسەوە وانەی دەوتەوە، بە گوڕوتینی خۆی ئەرزمی هانداو کردی بە دەریای زانیاریە زۆرەکانی لە زمانە کۆنەکاندا لە بواری ئاینییەوە.

لەو ماوەیەدا کتێبە ئاینیەکان پڕ بوون لە هەڵەی مێژوویی، بەهۆی لاوازی نوسەرەکانیان لەزمانە کۆنەکاندا ئەو هەولانە زیاتر بوون، بۆیە ئەرزم وەرگێڕانی خۆی بۆ کتێبی (العهد الجديد)بەزمانی لاتینی لەگەڵ نوسخەیەکی وردەکاری لەسەر کراوی بەزمانی ئیغریقی لەساڵی( ١٥١٦ز )دا بڵاو کردەوە، بەمە سوکایەتی بە

پیاوانی لاهوت کرد و بێ ڕەحمانە پەردەی لەسەر چەندین هەڵەی ئابڕو بەرانەی پیاوانی لاهوت هەڵدایەوە.

ئەرزم پێی وابوو مەترسی حەقیقی لە سەر ئایینی دروست خۆی لەمانەدا دەنوێنێت:

١-بتپەرستی کە زۆربەی پیاوانی ڕێنسانسی لە ئیتالیا گەڕان بۆی و بە ئەدیبە کۆنەکان سەرسام بوون.

٢- دەستگرتنی جەماوەر بە دیاردە دەرەکیەکانی ئاینیەوە وەك سەردانی گۆڕی پیاوچاکان یان نوێژکردن بەشێوەیەکی مکانیکی دوور لە بیرکردنەوە.

هۆکاری ئەوەشی گێڕایەوە بۆ تەمبەڵی و گوێ نەدانی کڵێساو دەرفەتدانی بە پیاوانی ئایینی و لاهوت تا ئەو بنەما کەمانەی مەسیح هێنا بوونی لە ژێر هەزاران باسی وشك و بۆنەی کوێرانەی داهێنراودا بەخاك بسپێرن، پاشان ئەویەوە لە پێنوسەکەی و کەوتە نووسینی ئەوەی بنەڕەتی ئایینی ئێمە ئاستی و خۆش ڕەفتاریە، ئەمەش هەرگیز نایەتە دی مەگەر ئەوەی کۆنەکان لابرێن و تاك ئازاد بکرێت تا بەئازاری ڕای خۆی لەزۆربەی کاروبارو بارەکاندا هەبێت ئیرزم کتێبێکی نووسی و ناوی نا (مدح الطیش)تیایدا هێرشی بردە سەر قەشەو پیاوانی لاهوت و ئەو جەماوەرەی لەسەر گۆڕی قدیسەکان فرمێسك دەرێژن و هەروا پارە دەبەخشن تا پسولەی لێخۆشبوون بکڕن تا پارچەیەك لە زەوی بەهەشتی پێ بکڕن.

کتێبەکە پڕیەتی لەگاڵتە کردنی توندو تاڵ و گاڵتە بە هەموو شتێك دەکات، ئەوەی لاپەڕەکانی ئەو کتێبە هەڵدەداتەوە خەریکە ئەو قسەی لۆثەربەڕاست بزانێت کەدەڵێت (ئەرزم گاڵتە بە هەموو شتێك دەکات، تەنانەت بە ئایین و بەخودی مەسیحیش)، بەڵام کۆکردنەوەی زانیاریەکان لەبەرزینەدوو کردنەوەی زانستە کۆنەکان نەبوو، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی ڕێنسانسێك بوو لە ئایینی مەسیحیەتدا، ئەو بڕوای وابوو ڕێگەی ڕێنسانس دەبێت هێدی بێت و گەردەلوولی شۆڕشی نەبێت، چونکە شۆڕش بەسەر پاپاو کڵێسادا بە بڕوای ئەو زیاتر لەوەی کە سوودی هەبێت

زیانی دەبێت، چونکە بارگرژی و خوێن ڕشتنی لەگەڵدا دەبێت، بۆیە بانگەوازی بۆ ئەو کودەتایە دەکرد کە دەیویست لەڕێگەی گەشەسەندنی لەسەرخۆو چەسپاوەوە و لابردنی خورافە لە مێشکی خەڵکیدا بێت ئەویش بەوەی پشکێکی باشی تێگەیشتن ڕاستیان پێ ببەخشێت.

لەکاتێکدا ئەرزم پێی وابوو ئارەزووەکانی لەسەرکەوتن نزیك بوونەتەوەو بارودۆخ هاتوەتە کایەوە تا پەیڕەویان بکات، بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك پاشا هاتنە سەر کورسی دەسەڵاتی ئەورووپی کە ئەدەبیان خۆش دەویست و خۆیان بە پارێزەری پیاوانی ئەدەب نیشان دەدا وەك مەکسیمیلیان و هنری هەشتەم و فرانسوای یەکەم پاپا لیۆی دەیەمیش هاتە سەر کورسی کڵێساکە ناسرا بوو بە سۆزداری بۆ پیاوانی شاعیران ئەمە پاڵێ بە لۆ ثترەوە نا تا ئەو شۆڕشەی ڕا بگەیەنێت کە مەسیحیەکانی بردە جەنگێکەوە کە تیایدا چاوەکان پڕ فرمێسك بوون ئەرزمیش چاوی بڕیبوویە گۆڕەکەی و خەفەت چاوانی پێ لەدەستدا بوو و بێهیوایی دڵی داگرتبوو.

لێرەدا پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان ماڵ و مێشکدا، ئەگەر یەکێکیان گیراکاریگەری لەسەر ئەوی دیکەش دەبێت، پاپا بەهۆی هێزەوە دەستیگرتبوو بەسەر ماڵوسامانی ئەڵمانیادا، بەمە خەڵك بە هەموو چینەکانیانەوە لێی بێزار بوون، پاپا بۆ تالآن و بڕی وڵات پێگەی ئایینی خۆی بەکار دەهێناو پێگە گەورە ئاینیەکانی بەنرخی گران بەکڕیارانی دەفرۆشت و شوێنەکەوتە ئیتاڵیەکانی خۆی دەنارد تا پایە باڵاکان داگیر بکەن.

بەمەش لە باخەڵی ئەڵمانەکانەوە پارەیەکی زۆری بۆ خۆی کۆدەکردەوە، نووسەرانی سەدەی شانزدەهەم بێزاری گشتی خۆیان لەو بارە گاڵتە کردنیان بە پیاوانی ئایینی لاوازی کەم عەقڵ و پڕ ئارەزوو پەرستی و منگەرایی خستوەتە ڕوو، بەلاّم سەرەڕای هەموو ئەمانە خەڵکی بیری لە شۆڕش نەدەکردەوە، بەڵکو ئەوەی داوایان دەکرد بریتیبوو لە وەستاندنی لافاوی پارە بردن بۆ ڕۆماو هێشتنەوەی لەوڵاتداو چاککردنی ئاکارو ڕەوشتی پیاوانی ئایینی.

بەڵام نووسەرێك كە بانگەوازێكی شێوە شۆڕشگێڕی كردبێت لەوكاتەی لۆثـتر هێرشەكەی خۆی دەستپێكرد، (ئۆلرخ ڤۆن هۆتن)بوو (١٤٨٨ز-١٥٢٣ز)ئۆلرخ لە خێزانی سوارچاكێكی هەژار لە دایك بووە، ڕۆژانی سەرەتای وەك سوار چاكەكان لەقەڵادا بردەسەر، بەڵام لە ژیانی كەنارگیری بێزار بوو و ڕوویكردە زانكۆكان و بڕیاریاندا شارەزایی لەسەر ئەدەبی كۆن وەربگرێت، چونكە ئەو كات لەناوخەڵكدا دەنگۆی بڵاو بوو.

بۆ ئەمەش ڕوویكردە ئیتالیاو لەوی لە ئاكاری پیاوانی ئایینی بێزار بوو لەبارەی پاپالیۆی دەیەمەوە شتێكی نووسی و باسی شێوەی خەرجكردنی ئەو داهاتانەی كرد كە لە ئەڵمانیاوە بۆی دێت، بەشێكی بۆ نزیكان و بەشێك بۆ دەربارو ئەنجومەنی خۆشگوزەرانی باپەوی و بەشی سێیەمیش بۆ هاوەڵان و دۆستان دەبوو.

بارودۆخی ئەڵمانیا بەتەواوەتی ئامادەی پێشوازیكردن و بڵاو كردنەوەی بانگەوازەكەی لۆثتر بوو كاتێك ئەو بانگەوازە بوو خێرا چوویە ناو جەستەی هەموو یانەوەو لەرینەوەیەكی توند هاتەكایەوە هەموو چینەكان پێی كاریگەر بوون، چونكە بارەكە ئەوەی دەخواست چاكسازی بكرێت و گەلانیش بانگەوازیان بۆ دەكرد، ئەمە ئاسانكاری بۆ (مارتن لۆثتركنك)كرد تا شۆڕشە گەورەكەی دژ بە كڵێسای پڕتەنگرە بەرفراوان و سەركەوتوو بێت.

********************

## * لۆثەر و شۆڕشی ئەڵمانیا دژ بە پاپا:

مارتن لۆثـەر لەساڵی( ١٤٨٣ز) لە بنەماڵەیەکی هەژارە کە کاری کانزاکاری دەکرد لەدایکبوو، باوکی لەگەڵئەوەی هەژار بوو، بەڵام بڕیاریدا کوڕەکەی پارێزەر بێت، بۆیە ناردی بۆ زانکۆی ئەرتفرت، پاش ئەوەی لۆثەر خوێندنی زانکۆی تەواو کرد و ئامادەی وتنەوەی وانەی ماف بوو، لەکتوپڕێکدا هەڵگەڕایەوە و تاوی دایە بواری کەنارگیری، چونکە بەرامبەر ئەو گومانانە زۆر دوودڵ و بێزار بوو کە بەدەرونیدا دەهات، بۆیە دەترسا ئەو هەموو نوێژو پاڕانەوانەی لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری نەکەن.

دواجار چارەسەرێکی دۆزیەوە کە لەو دوودڵیە ڕزگاری کرد، ئەویش بڕوا بوون بوو بەوەی کە بیروباوەڕی پوخت و ڕاستی بە سۆزی خودای بەسە بۆی تا ڕزگاری بکات نەوەك نیشاندانی دیمەنی پیاوچاکانی لە خواترس، لۆثەر متمانەو ڕێزی سەرۆك دێری بەدەستهێنان کاتێك فردریکی دانای هەڵبژێردراوی سەکسۆنیا هات تا مامۆستایانی زانکۆ نوێکەی لەوتنبرك بپشکنێتن لۆثەر پێشنیاری بۆکرد تا وانەی ئەرستۆ بڵێتەوە.

بەوە بوو بە مامۆستا ساڵان تێپەڕی و لۆثەر گومانی لەو وانەیە هەبوو کە دەیوتەوە هەم خۆی و هەم هاوڕێکانی ناو زانکۆیشی دواجار بڕیاریدا ئەرستۆ واز لێ بهێنێت، چونکە پێی وابوو کەسێکی بتپەرستەو هیچ لە ئایینی مەسیحی نازانێت، کەوتە بانگەواز کردن بۆ پشت بەستن بە ئینجیل و خوێندنەوەی ئینجیل لە جیاتی فەیلەسوفی ئیغریقی.

بڕوای وابوو مرۆڤ گەیشتۆتە بارێکی خراپی و گەندەڵی وا کە ناکرێت لەگەڵ ئەوەشدا خوا ڕازی بکات، هەتا کەسێك مرۆڤ دەیتوانێت پاشگەز بوونەوەیەتی لە تاوانەکانی و بڕوا بوونیەتی بە میهرو لێبوردەیی پەروەردگار، لەو باوەڕەدا تاکە ڕێگەی ڕزگار بوون لە تاوانەکان دەبێت نەوەك لەو کردارانەدا کە کڵێسا دەیوتن وەك ئامادە بوون لای کەسانی پیرۆزو دووبارە کردنەوەی نوێژو حەج و سەردانی شوێنە

پیرۆزەکان کەس گوێی بە ڕێنماییەکانی لۆثەر نەدا تا ساڵی( ١٥١٧ز) هات ئەوکات تەمەنی سی و چوار ساڵ بوو، لەو ساڵەدا ڕووداوێك ڕوویدا کەوایکرد لۆثەر بەرچاو بکەوێت.

ئەویش ئەوە بوو کە پاپاکان ماوەیەك بوو کەوتبونە نۆژەن کردنەوەی کڵێسای قدیس بوترس لە ڕۆما، بۆ کردنەوەی پارەی پێویست لیوۆی دەیەم پسولەی لێبوردنی بە شێوەیەکی فراوان لە هەموو بەشەکانی ئەڵمانیادا بڵاو کردەوە، بۆیە لەساڵی (١٥١٧ز) دا ڕاهیبێکی نارد بۆ وتنبرك تا بانگەوازی پێویستی بۆ بکات ئەویش دەیوت پسولەی لێبوردن هێزێکی هەیەو لۆثەریش دژی ئەوە بوو و دەیوت لەگەڵ بنەماکانی ئایینی مەسیحیەتدا ناگونجێت، نەوەدو پێنج ماددەشی نووسی و تیایدا بەرەو ڕووی ئەو پسووڵانە وەستاو لەسەر دەرگای کڵێسا هەڵیواسی و بانگەوازی کرد کێ حەزی پێیە با مشتومڕی لەسەر بکەن، لۆثەر بەم کارە نەیدەویست هێرش بکاتە سەر کڵێسا یان سەختی و چەرمەسەری بێنێتەوە، ئەمەش بەبەڵگەی ئەوەی ئەو ماددانەی و بە زمانی لاتینی نووسی، بانگەوازەکەیشی تەنها ئاڕاستەی چینی ئایندار کرد.

لە گرنگترین ئەو بڵاوکراوانەی کە لۆثەر وتەی خۆی بۆ خانەدادانی ئەڵمانیا نووسی ئەوە بوو، لەو وتارەدا لۆثەر سەرکردەو سوارەکانی بانگهێشت کرد تا چاکسازی لە کڵێسادا بکەن، چونکە بڕوای وابوو تەواو پێویستی بە چاکسازی هەیەو ناکرێت چاوەڕوانی پاپاو قەشەکان بین تا ئەو کارە بکەن، لەو وتارەیدا بێزاری دەربڕی بەرامبەر بەودیدەی دەڵێت پیاوانی ئایینی پیرۆز یەکیان هەیە کە ڕێ بە فەرمانڕەوای سەردەم نادات دەریانبکات با لە ئەرکی پیرۆزی خۆشیاندا کەمتەر خەمی بنوێنن.

هەروەك لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی دەکرد مافی سەرکردەکان و بەڵکو ئەرکیشیانە سزای ئەو پیاوە ئاینیانە بدەن کە هەڵە دەکەن، هەروەك چۆن نزمترین و ڕاسترین پیاوی دنیایی سزا دەدەن بۆیەبەژماردنی ئەو خراپانەی دەبێت بۆ

دەرباز بوونی ئەڵمانیاو چاککردنی باری ئابووری لێیان دەرباز بن کۆتایی بە وتارەکەی هێنا، تیڕوانینیشی بۆ ئایین لەسەر دەسپێکردنی خێرای شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی وەستا بوو.

بۆیە داوای کەمکردنەوەی ژمارەی دێرەکانی کرد بۆ دەیەکی ئەو ژمارانە و دەرفەت دان بەوەی دەیەوێت واز لە ژیانی کەنارگیری بهێنێت، ئاماژەشی کرد بە زیانەکانی زۆری ئەو جەژنانەی کە بونەتە هۆی دواخستنی خەڵك لە کاری ڕۆژانە، داواشی کرد دەرفەتی بە پیاوانی ئایینی بدرێت تا وەك کەسانی دی هاوسەر گیری بکەن و زانکۆکان چاك بکرێت و خوێندنی ئەرستۆ لە مەنهەجی زانکۆکاندا لەکار بخرێت و لابرێت.

لۆثەر بە درێژایی ئەو ماوەیە چاوەڕوان بوو تا بێبەریکردنی پاپای پێ بگات و چاوەڕوانیەکەشی زۆری نەخایاند تا ئەو بڕیارە لەساڵی( ١٥٢٠ز) دا دەرچوو تیایدا زۆربەی ڕاکانی لۆثەر تێکشکاندو بەبیدعەیەکی گومڕاکەری دانان و فرمانی کرد تا کتێبەکانی بسوتێنرێن و نەخوێندرێنەوە، لۆثەریش شەش ڕۆژی بۆ دانرا تا لە بیروڕاکانی پاشگەز بێتەوە.

ئەو وتارە زۆرێك لەسەرکردەکانی ئەڵمانیای بێزار کرد، ئەو سەرکردانەی کە بانگەوازیان بۆ چاکسازی دەکرد، بۆیە گرنگیان پێنەدا، فردریکی هەڵبژێراوی سەکسۆنیا لۆثەری دەپاراست، بەڵکوو زیاتر ئاگای لێ دەبوو، لۆثەریش بەرامبەر بەوە هەنگاوێکی سەرسوڕهێنەری گرتە بەرو یاخیبوونی خۆی لەبەردەم خەڵکدا بە سوتاندنی فرمانەکەی پاپا ڕاگەیاند.

دوای ئەوە نامەیەکی بۆ هاوڕێیەکی خۆی نووسی و تیایدا وتی ئەو گەردە لولەی ناویەتیەوە تا ڕۆژی دوای دانامرکێتەوە، بەلام لۆثەر لەگەڵ ئەمانەشدا بانگەوازی بۆ شۆڕشی خوێناوی نەدەکرد، بەڵکوو بە توندی دژی بە توندی چاکسازی کتوپڕی بوو، چونکە شۆڕش خۆی دێت. کاتێك شارلی پێنجەم گەیشتە خاکی ئەڵمانیا تا کۆبونەوەی یەکەمی کۆڕی ئەڵمانی لە ساڵی (١٥٢٠ز) دا ببەستێت، نوێنەری پاپا کتێبەکەی لۆثەری بۆ خستە ڕوو و داوای لێکرد بێبەریکردنی پاپا دژ بە لۆثەر بە خێرایی جێبەجێ بکات.

بەڵام شارل نەوێرا هیچ هەنگاوێکی لە ڕوودا بگرێتە بەر چونکە بەرەو ڕووی مەترسیەکی گەورە دەبوویەوە، چونکە لەبەر چاوی خەڵکدا ببوو بە پاڵەوانێکی وڵات. هەڵبژێردراوی سەکسۆنیش بەردەوام دەیپاراست، هەر وەك زۆرێك لە سەرکردەکان سۆزیان بۆی هەبوو لە بانگەوازەکەی و ڕەخنەگرتنی لە گەندەڵیەکانی کڵێسا دڵنیا بووە، پاش مشتومڕێکی درێژ خایەن بڕیاردرا لۆثەربۆ ورمز بانگهێشت بکرێت و دەرفەتی پی بدرێت تا نوێنەرانی گەلی ئەڵمانی و ئیمپراتۆریش ببینێت.

داوایشی لێکرد تا دان بەوەدا بنێت کە ئەو خۆی ئەو کتێبە ملهوڕیانەی نوسیە کە دەدرێتەوە پاڵی و تا ئێستاش هەمان ئەو ڕایانەی هەیە کە پاپا پێیان ناڕازیە مەبەست لەمە دەرفەت کردنەوە بۆ لۆثەر نەبوو تا لەبەردەم کۆڕەکەدا بەرگری لە بیروباوەڕی خۆی بکات، بەڵکو تەنها ئەو پرسیارەی لێ دەکرا کە ئایا ئەو نوسراوانەی بەلاتینی یان ئەڵمانی نووسراوی بە پێنوسی ئەو نوسراون یان نا، وە ئایا ئەمادەیی هەیە دەستبەرداری بیروباوەڕەکانی بێت و پاشگەز بێتەوە ئەویش دانی بەوەدا نا کە خۆی نووسیویەتی و دانیشی بەوەدا ناکە هەندی جار هێرشەکانی بۆ سەر کڵێسا زۆر توند بون.

بەڵام ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە ئەو بڕیارانەی بەناوی پاپاوە دەرچون هەندێ جار پێچەوانەی ویژدانی مەسیحین و گەلی ئەڵمانیش بەدەست تالان و بڕی کارمەندانی کڵێساوە دەناڵێنن، ئامادەیی خۆشی دەربڕی تا لە ڕاکانی پاشگەز ببێتەوە ئەگەر بێتو ئەوان بەبەڵگەکانی ناو کتێبی پیرۆز ڕازی بکەن، بەڵام ئەگەر ئەوە نەتوانن ئەوا لەسەر وتەکانی خۆی دەمێنێتەوە ئەو کات بڕیای ورمز لەسەر لۆثەر درا ئەو بڕیارە لۆثەری بێبەری کرد بەو بیانووەی ئەو سوکایەتی بە پاپاو پیاوانی ئایینی کردووە، و چینەکانی دیکەی هانداوە تا دەست بخەنە خوێنی ئەکلیرۆسەوەو خەڵکی لە ئارەزووی دنیاویستی یەك ئاگادار دەکردەوە کە لۆثەر بانگەوازی بۆ دەکرد و ڕێ لە خەڵك گیرا لەوەی کتێبەکانی دەساو دەس پێکەن یان لەچاپ بدەنەوە یان تەنانەت نەدەبوو نان و ئاوو پەناگەشی پێبدەن.

دەشبوو بگیرێت و بدرێتە دەست پاپا، سوکایەتی و گاڵتە جاڕیەکی گشتی بەرەو ڕووی ئەو بڕیارە کرایەوەو تەنها خەڵکێکی کەم لەبەرچاویان گرت، شارلیش خێرا ئەڵمانیای بەجێهێشت و چوو بۆ ئیسپانیاو لەوێ جەنگێکی دەساڵە سەرقاڵی کرد.

# دەستپێکردنی شۆڕش

کاتێك لۆثــەر لەڕێگەی گەڕانەوەیدا بوو پیاوانی فریدریکی هەڵبژێردراوی سەکسۆنیا فڕاندیان و بردیانە قەڵای ورنبرك و ژیانیان پاراستن، لۆثــەریش لە پەناگەکەیدا کەوتە وەرگێڕانی ئینجیل بۆ زمانی ئەڵمانی.

کاتێك لۆثـەر لەکەنارگیریەکەیدا بە لەسەر خۆیی و ئارامی کاری دەکرد، ئەو ئاگرەی نابوویەوە زۆر خێرا کڵپەی دەسەندو بڵاو دەبوویەوە هەموو یەکدەنگ بوون لەسەر چاکسازی و سەرکردەکان ئەوەیان بەدەرفەت زانی تا هێرش ببەنە سەر سەروەت و سامانی زۆری کڵێسا، جوتیارانیش وایان دەبینی ڕێنماییەکانی لۆثەر دەستی درێژی پیاوانی ئایینی لە ڕوویاندا بڕێت تا ئیدی پارەو سامانیان لێ کۆنەکەنەوە ماوەیەکی زۆری نەخایاند تا هەواڵ هات هەندی ڕوهبانی خێرو کەنارگیری خۆیان واز لێهێناوەو تاویان داوەتە ژیانی دنیا.

ئەو هەواڵانە لۆثەری دوودڵ کرد تا ئەوەی بانگەکەی خۆی بەجێهێشت و چوویەوە ناو خەڵك و ئەو کارەی بەباش نەزانی و چونکە بانگەی ڕێگە توندو تیژیەکانی شۆڕش باش نیە، بەڵکوو ئەو هیوادار بوو چاکسازی خوازراو لە ڕێی حکومەتەوە بکرێت نەوەك لە ڕێی گەلەوە، بەڵام کەس گوێی بەو داوایەی لۆثەر نەدا.

جا لەساڵی( ١٥٢٥ز) دا کۆیلەکان بە ناوی (دادپەروەری خودایی)یەوە ڕاپەڕین تا تۆڵە لەوانە بسەننەوە کە خراپەیان لە ڕوودا نواندون، لۆثەریش لەو شۆڕشەیان بەرپرسیار نەبوو سەرەڕای ئەوەی هاریکاری هاندانی گیانی هەڵگەڕانەوە نێو دەرونیان بوو، هەندێ لە خواستەکانیان جێی ڕاستی بووە و لە دوانزە ماددەدا کۆکرابونەوەو پوختەکەی ڕزگار بوون بوو لەو گەورەو بەرپرسە مەسیحیانەی وەك ئەوان وابوون، چونکە ئینجیل بەندەو گەورە لێك جیاناکاتەوەو بەپێویستی دانابێت یەکەم باج بە دووەم بدات.

چەند سەرکردەیەکیان بانگەوازیان بۆ زێدەڕۆیی و توندوتیژی دەکردو کەوتنە کوشتنی قەشەو خانەدانەکان و یەک لەدوای یەک قەڵاو دێرەکانیان تەختی زەوی دەکردن، کۆمەڵێك لە خانەدانەکانیان بە شێوە گەلێکی زۆر توندو دڕندانە کوشتن، لۆثەریش کە لە چینی جوتیاران بوو سەرەتا سۆزی بۆیان هەبوو ئامۆژگاری کردن تا لەسەر خۆو ئارام بن، بەڵام ئەوان کە دەستبەرداری شۆڕشەکە نەبوون، ئەویش لێیان هەڵگەڕایەوەو داوای لە حکومەت کرد بە توندی و ڕقی لەناو یان ببات.

سەرکردەکانیش چوون بەدەم داواکەی لۆثەرەوە و کەوتنە کوشتنی جوتیاران و دوانزە هەزاریان بە ناشیرین ترین شێوە لێ کوشتن، باجیان لەسەر زیاد کردن، بەهۆی ئەمەوە پشێوی کەوتە وڵات و بۆچەند سەدە دوای ئەو چەرمەسەریە بەبێ کەمبوونەوەی قوربەسەریەکانی کۆیلایەتی درێژەی کێشاو بەردەوام بوو.

*******************

# دابەشبوونی ئەڵمانیا

لەو ماوەیەدا ئال لەگەڵ فرانسوادا لە مللملانێیەکی سەختدا بوو، بۆیە نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیاو دژ بە لۆثەر و شوێنکەوتەکانی بڕ یارەکەی ورمز جێبەجێ بکات، ئەڵمانیا لەو کاتەدا بە سەدان میرنشنی سەربەخۆی جیاجیا دابەش ببوو، نەدەکرا هەموو سەرکردەو سوارەکان و هەڵبژێردراوانی و خەڵکی شارەکان لەسەر پێویستی کارکردن بەرامبەر کێشەی چاکسازی کڵێسا یەکدەنگ بن، چونکە باشوور هەواداری پاپا بوون.

باکوریەکانیش هەواداری ڕێنماییە نوێکان بوون و هێندەی نەبرد هەموویان لە پاپا جیابونەوەو مەزهەبی پرۆتستانتیان وەرگرت، هێزێکی بەهێزیش نەبوو و بارەکە یەکلا بکاتەوە، ئەو کۆڕەی لە سپیر لەساڵی( ١٥٢٦)ز بەسترا بڕیاری دا هەرسەرکردەیەك مافی هەڵبژاردنی ئەو مەزهەبەی هەبێت کە شوێنکەوتەکانی وڵاتەکەی دەیانەوێت.

بەڵام لە دانیشتنی دووەمی لەشاری سپیر لە ساڵی( ١٥٢٩ز) دا ئیمپراتۆر شارل بڕیارێکی دەرکرد و تیایدا داوای جێبەجێکردنی بڕیاری ورمزی دژ بە ملهوڕانی کرد، بۆیە پشتوانانی لۆثتر نارەزاییان دەربڕی و دەیانوت بۆ زۆرینە نیە بڕیاری ئەنجومەنی پێشوو هەڵبوەشێنەوە لەکاتێکدا بڕیارەکە بەکۆی دەنگ بووە، ئەوانەی ئەو نارەزاییە یان دەربڕی پێیان وتراو پرۆتستانت دواتر ئەو ناوە لەهەر کەسێك دەنرا کە ڕێنماییەکانی کڵێسای کاسۆلیکی قبوول نەکردایە.

لەماوەی دانوستانی ورمزدا ئیمپراتۆر لە ئیسپانیا سەرقاڵی کۆمەڵێك جەنگ بوو لەگەڵ پاشا فرەنسی دوژمنی سەرسەختیدان بەڵام دەرفەتی ئاشتی کاتی ساڵی( ١٥٣٠ز) قۆستەوەو گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا تا هاوڵاتیە ئەڵمانیەکانی لە کۆڕێکدا کۆ بکاتەوە کە لە ئۆکسبرك ببەسترێت تا ئەو کێشە ئایینیە چارە سەر بکرێت کە شارل شارەزایی لێی نەبوو، بۆیە فرمانی بە پرۆتستانتەکان کرد تا بیروباوەڕی خۆیان دیاری بکەن، ئەوانیش دانپیادانانی ئۆکسبرکیان پێشکەشکرد

و تیایدا مەزهەبی خۆیان ڕوونکردەوەو مامناوەندی و ژیرییان بەکارهێنا تا وانیشان بدەن جیاوازی نێوان ئەو دوومەزهەبە شتێکی سادەو هیچە، هەروەك شارل فرمانی بە کاسۆلیکەکان کردتا دیدی پرۆتستانی بدەنە بەر نەشتەری ڕەخنە.

دوای ئەوە بانگەشەکانی پرۆتستانتی بە پووچەڵ ڕاگەیاند و داوای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ کڵێسای کاسۆلیکی واز لە هێرشبردنە سەر پشتیوانانی ئەو کڵێسایە بهێنن و ماڵوزەدی دێرو کڵێسەکان بگێڕنەوە، بەڵێنیشی پێدان داوا لە پاپا بکات بۆ ساڵی دواتر بۆ چاکسازی کڵێسا بە پێ ی ڕای بەشی ئازادی کاثۆلیکی کۆڕێکیان بۆ بگرێت.

پاش دەساڵ لەوە ئیمپراتۆر هەر سەرقاڵێ چەند جەنگێکی نوێ بوو لە باشووری ئەورووپادا، سوڵتان سولەیمانی قانونی هەڕەشەی لە شارل دەکرد، پەیوەندی نێوان شارل و فەرەنسایش تێکچوو بارودۆخی ئیسپانیاش شڵەژاو بەدەستهێنانی یارمەتی پرۆتستانت لەو ماوە سەختەدا پێویست بوو بۆیە نەرمی لەگەڵیاندا نواند و هەر کاتیش بارەکە هێور ببوایەتەوە تۆڵەی توندی لێ دەسەندنەوە.

بەڵام ژمارەی شوێنکەوتەکانی لۆثەر بەردەوام لە زۆر بووندا بوو و زۆرێك لەسەر کردەکان دایانە پاڵی لەساڵی( ١٥٥٥ز) دا ڕێککەوتنی (ئۆکبرك)بەسترا، بەو پێیە هەموو سەرکردەیەك یان هەموو شاریان دەستەیەکی سەربەخۆیان سوارەیەك مافی هەڵبژاردنی ئەو بیروباوەڕانەی هەبوو کە لە ڕێککەوتنەکەدا هاتبوون، لەگەڵ بیروباوەڕە کۆنەکانی کاسۆلیکیدا هەر تاکێکیش هاومەزهەبی ویلایەتەکەی نیە بۆی هەیە کۆچ بکات و هەموو شمەکی خۆیشی لەگەڵدا ببات، ئەگەر سەرکردەیەکی ئاینیش چوویە سەر مەزهەبی پرۆتستانتی، ئەوا دەبێت ماڵو موڵکی خۆی بۆ کڵێسا بەجێبهێڵێت.

لەو ڕێککەوتنەدا چەند کەموکورتیەکی دیاربەدیدەکرێت کە لەداهاتودا چەند کێشەیەکی گەورەیان لێکەوتەوە، گنگترینی ئەو کەمو کورتیانەش بریتیبوون لە:

١- نەبوونی ئازادی ئایینی بۆ تاکەکان بەڵکوو بواری ئایین درا بوو بە دەست فەرمانڕەوای تاکەکان.

٢- باسی هیچ چاکسازێکی دیکەی جگە لە لۆثتر نەکرابوو وەك کالڤن و زۆنگلی.

٣- هێزێك نەبوو بڕیارەکانی جێبەجێ بکات، بەتایبەت لە گێڕانەوەی ماڵومولکی کڵێسا دا، بەڵکوو تەنها نوسینی سەرکاغەز بوو، لێرەدا پیاوانی ئۆکسبرك لە ئازادی بیروباوەڕی تاك دڵنیا نەبوون، پێویستە لەوەدا زیادە ڕۆیی نەکەین، چونکە هۆشی ئەوەی سەدەی شانزە هێندە نەبوە کەموکورتی لەوەدا بەدی بکات، بەڵکو بەشێکی ئاسایی زانیوە حکومەت یان سەرکردەکەی لەدیاریکردنی مەزهەبی تاکدا بڕیاری یەکلایی بدات، چونکە لەماوەی سەدەکاندا بەدرێژایی مێژووی ئەورووپا سیاسەت تێکەڵ بە ئایین کراوە و کەسی ئەورووپیش لەوکاتەدا خەونی بەوەوە نەدبینی دەرفەت بەتاك بدرێت کە خۆی خاوەنی هۆش و ویستی خۆی بێت لە هەڵبژاردنی ئایین یان مەزهەبی خۆیدا.

********************

# (باسی سێیەم)

# (چاکسازی ئایینی لە سویسراو ئینگلتەرا)

## چاکسازی لە سویسرا

سەد ساڵ پاش مردنی لۆثەر ململانێی نیوان کاسۆلیك و پرۆتستانت لەهەموو ناوچەکانی ئەوروپادا جگە لە ئیتالیاو ئیسپانیا بەردەوام بوو، چەند شۆڕشێکی توند لە سویسراو ئینگلتەراو فەرەنساو هۆڵەندا ڕوویاندا و کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لە ڕێکردەی مێژوویی ئەو ناوچانەدا، ئێمەش هەوڵدەدەین دیدێکی کورت لەسەر ئەو وڵاتانە بخەینە بەرچاو تا یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتن لەو گۆڕان و گەشە سەندنانەی دواتر لە هەر کامیاندا ڕوویاندا.

سویسرا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز و لەبەشەکانی ئەڵمانیای باشوور جیابوویەوە، بەڵام هێندەی نەبرد سێ ویلایەتەکەی دەوری دەریاچەی (لۆسرن)لە سەدەی سیانزەدا یەکیان گرت بەمە ئازادی خۆیان لەدەست هێرشی بنەماڵەی هوبسبرگی دراوسێیان پاراست، ئەوەش یەکێتی نوێی سویسری بوو. ماوەیەکی زۆری نەبرد تا ویلایەتی لۆسرن و شاری (زوریخ)و شاری (برن)یش هاتنە ناو کۆمەڵەکەوە.

دوای ئەمە سویسریەکان لە پێناو پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان و ڕێگرتن لە شاڵاوە چاوچنۆکیەکانی بنەماڵەی هۆبسبۆرگ بۆ دەستگرتن بەسەریاندا تێدەکۆشان. بە تێپەڕ بوونی ساڵانیش ویلایەتە دراوسێکانیش پەیوەستی یەکێتی سویسری بوون و چەند ناوچەیەکی دامێنی شاخەکانی ئەلبی دراوسێکانیش پەیوەستی یەکێتی سویسری بوون و چەند ناوچەیەکی دامێنی شاخەکانی ئەلبی ئیتالیاش دایانە پاڵی.

پاشان ئەو پەیوەندیانەی ویلایەتەکانی بە ئیمپراتۆریەتەوە دەبەستەوە ڕوویان لە پچڕان کرد تا لە ساڵی( ١٤٩٩ز) دا سویسرا بە شێوەی کرداری

سەربەخۆیی وەرگرت و ڕوویان لە پچڕان کرد تا لە ساڵی (١٤٩٩ ز) دا سویسرا بە شێوەی کرداری سەربەخۆیی وەرگرت و لەدەست دەسەڵاتی ئیمپراتۆر ڕزگاری بوو.

سەرەڕای ئەوەی یەکێتی یەکەم لە نێوان گەلانێکدا بوو کە بەزمانی ئەڵمانی قسەیان دەکرد، بەڵام کاتێك دواتر چەندویلایەتێکی گەورە کە بە فەرەنسی و ئیتالی قسەیان دەکرد دایانە پاڵیان بارەکە گۆڕا، چونکە سویسریەکان گەلێکی تەباو یەکگرتووی خاوەن کەسایەتیەکی ڕوون و ڕۆشنبیریەکی یەکگرتوو نەبوون، ئەمە وایکرد یەکێتی سویسری بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لاواز و ڕوو لە هەڵوەشان و کەم ڕێکخستن بێت.

قەشەیەك بەناوی (زۆنگلی)کە یەك ساڵ لە لۆثەر بچووکتر بوو سەرکردایەتی شۆڕشی سویسرای دژ بە پاپا دەکرد. زۆنگلی لە دێرێك لە نزیك دەریاچەی زوریخ دەژیا، خەڵکی بۆ بینینی موعجیزەکانی ئەوی دەچوونە سەردانی ئەو دێرە. لێرەوە زۆنگلی کەوتە بانگەواز بۆ چاکسازی کڵێسای کاسۆلیکی و ڕەخنەی لە پسووڵەی لێبوردن دەگرت و بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد دەرفەت بە قەشەکای بدرێت تا هاوسەرگیری بکەن و پشت بە ئینجیل ببەستن، بەڵام بەشەکانی یەکێتیەکەی دەوری لۆسرن لە ترسی لەدەستدانی ئەو قەڵەمڕەوەی هەیانبوو (هەرچەندە بچووك و ساوایش بوو) لە دژی وەستان.

بۆیە لە ساڵی (١٥٣١ز) دا جەنگی یەکەمی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانت ڕوویداو تیایدا زۆنگلی کوژرا، پاشان هەرێم و شارەکانی سویسرا بەردەوام لە ململانێی نێوان خۆیاندا بوون و هەندێك هەواداری کاسۆلیك ئەوانی دیکەش هەواداری مەزهەبی پرۆتستانتی بوون.

پاش زۆنگلی کالڤن دەرکەوت و ناوبانگ و کاریگەریەکی تایبەتی لە ئینگلتەرا و ئەمریکادا هەبوو، ئەو شاری جنێفی سەر سنوری یەکێتی سویسرای کردە مەڵبەندێك بۆ بلاو کردنەوەی بانگەوازەکەی کالڤن لە ساڵی (١٥٠٣ز) لە فەرەنسا لە دایکبووە و کاریگەر بووە بە لۆثەر و لەگەڵ پرۆتستانتە چەوسێنراوەکانی ڕۆژانی

فرانسوای یەکەمدا دەرکراوە، بۆیە چووە بۆ شاری بازڵی سویسری و لەوی کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی بڵاو کردەوە (بنەماکانی ئایینی مەسیحی)کە بەیەکەم کتێبی ڕێکوپێک دادەنرێت کە لە دیدی پرۆتستانتیەوە ڕاڤەی ڕێبازی مەسیحیەتی کردبێت.

پاشان شاری جنێف پاش وەرگرتنی سەربەخۆیی لە دۆخی ساڤۆی بانگی کرد تاکارو باری ڕێکبخات کالڤنیش کارگێری کاروباری ئایینی دایە دەست وەزیرو پیاو ماقولان و دەسەلاتی مەدەنی و ئایینی یەکانگیر کردو پیاوانی سیاسەتی تێکەڵ بەکارگێری کاروباری کڵێسا کرد، بۆ ئەمەش مافی داتا چاودێری نەریتە گشتیەکان و سزا دانانی ئەوانەی لە نوێژ دوادەکەون یان داوێن پیسی و خراپە دەکەن بەجێبگەیەنن بنەماو ڕێبازی کالڤن لە فەرەنسا بڵاو بوویەوەن ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ جەنگەکانی هیکۆنۆت، لە سکۆتلەنداش کڵێسای پرۆتستانتی لەسەر بیرورشاکانی کالڤن پێگەیشت.

لە هۆڵەنداش ئەو ڕایانە وای لە هۆڵەندا کرد دژ بە ئیسپانیا خەبات بکات، لە ئینگلتەرایش لەسەر دارو پەردەی ئەم بیرو ڕایە تاقمی (یەبوریتان) هاتە دنیاوە، کالڤن تاکاتی مردنی لە ساڵی (١٥٦٤ز)دا وەك فەرمانڕەوای سیاسی و ئایینی شاری جنێف مایەوە.

********************

# چاکسازی لە ئینگلتەرا

هنری هەشتەم لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوویە دەسەڵاتداری ئینگلتەرا و مامۆستاو رشێنیشاندەرەکەش کاردینال (ولزی)بوو، ماوەیەك سیاسەتی ولاتی بۆ بەڕێوە دەبرد، گنگترین هەوڵەکانی ولزی جەختیان دەکردەوە لە ڕێگرتن لە پاشاکەی تا نەچێتە جەنگەکانی کیشوەری ئەورووپاوە، چونکە پێی وانەبوو ئینگلتەرا بتوانێت بگاتە ئەو گەورەییەی کە لە ڕێگەی ئاشتیەوە بە دەستی دەهێنێت نەوەك ڕێگەی جەنگ، چاکترین پێناویش بۆ چەسپاندنی ئاشتی پاراستنی هاوسەنگی نێودەوڵەتیە لەسەر کیشوەرو ڕێنەدانە بە هیچ دەوڵەتێك بۆ فروانخوازی تا ئەوئاستەی نەبێتە مەترسی بۆ ژیانی دەوڵەتانی دیکە، ئەو بیروبۆچوونە لە جیهانی ڕامیاری ئەورووپیدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی، بەڵام خودی ولزی ماوەیەکی زۆری بۆ نەمایەوە تا سیاسەتەکەی جێبەجێ بکات و بیباتە مەیدانی پەیڕەو و کارەوە.

هنری لەگەڵ بکترین ئەرکۆندا هاوسەرگیری کرد، تەنها کچێکی بۆ مایەوە کە ئەویش (ماری)بوون بەڵام هنری دەیویست کوڕێکی هەبێت تا بێتە میراتگری دەسەڵاتی دوای خۆی لە ترسی ئەوەی نەوەك ڕێگە نەدرێت ئافرەتێك کورسی دەسەڵاتی ئینگلیزی وەربگرێت، هەروەك لە بکترین بێهیوا بوو دەیویست لەدەستی ڕزگاری بێت، چونکە تەمەنی لە هنری زیاتر بوو.

ئەم خواستەشی ئەو کات زیاتر بوو کە کچێکی شانزە ساڵی لە کۆشکەکەیدا بینی و کچەکەش بەدووچاوە جادووگەراکەی سەرنجی ڕاکێشاو خستیە داوی خۆشەویستی خۆیەوەن ئەو کچەش ناوی (بۆلین)بوون ولزی فرمانیکرد تا پاپا ڕازی بکات تا ژنەکەی بۆ تەڵاق بدات، کاتێك هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوون پاشا لێی تووڕە بوو و لەدەسەڵاتەکەی دەریکردو دەستیگرت بەسەر هەموو ماڵ و سامانیدا، بەوە ولزی لەو شوێن و پایەوە گەیشتە ئەو پەڕی هەژاری و پاش ماوەیەکی کەم مرد.

لەگەڵ ئەمەشدا هنری پەرلەمانی ڕازی کرد تا هەندی لە داهاتی پاپا لە ئینگلتەراوە ببڕن بەو هیوایەی پاپا تەلاقەکەی بۆ بەجێ بگەیەنێت، بەلام کاتێك بینی ئەم کارانە بێ سوودن خۆڕاگری خۆی لەدەستداو (ئان بۆلین)ی بەهاوسەر گرت، بەلام ئەمەی بەنهێنی کرد بەو هیوایەی دواتر تەلاقدانی بکترینی بۆ بێت.

پەرلەمان کە بەپێی فرمانەکانی پاشا بەڕێوە دەچوو، هاوسەرگیری هنری بکترینی بەناشەرعی و هاوسەرگیری ئان بۆلینی بەشەرعی و یاسایی ڕاگەیاند.

هەر کە ساڵێ( ١٥٣٤ز) هات پەرلەمانی ئینگلیزی شۆڕشی کڵێسای ئینگلیزی دژ بە پاپای ئەنجامدا، ئەویش بەبەخشینی مافی دیاریکردنی هەموو سەرکردە ئاینیەکانی ناو ئنگلتەراو هەڵسوکەوتکردن بەهەموو داهاتی کڵێسای ئینگلیزی بە پاشای ئینگلیز لە دەقەی دەسەلاتداریدا پەرلەمان ڕایگەیاند پاشا گەورەی کڵێسایە لە ئینگلتەراو هەموو مافێکی ئەو نازناوەی هەیە.

پێویستە ئەمە وامان لێ نەکات بڕوامان وا بێت هنری پرۆتستانتیەکی لۆثەری بووە، بەڵێ ڕاستە ئەو پەیوەندی کڵێسای ئینگلیزی بە کڵێسای ڕۆماوە پچڕانە کاتێك لە پاپا (کلمنتی حەوتەم)یاخی بوو کاتێك پاپا ئامادە نەبوو مافی دەسەلاتداری کاروباری ئایینی و دنیایی بە هنری بدات، بەلام سەرەڕای دوورکەوتنەوەی لە پاپا لە پرۆتستانت نزیك نەبوویەوە وەك ئەوەی شوێنکەوتەکانی لۆثەر و کالڤن و زۆنگلی کردیان، بەڵکوو بە پێچەوانەوە کەوتە چەوساندنەوەیان، پاشان فرمانی کرد وەرگێڕانێکی نوێی ئینجیل بکرێت بۆ زمانی ئینگلیزی و هەموو کڵێساکانی ناچار کرد تا دانەیەکی لێ بگرنەوە تا هەموو کەسێك بتوانێت دەستی پێ بگات.

هنری دوای ئەوەی بوو بە سەرۆکی بالای کڵێسای ئینگلیزی، گرنگترین کارێك کردی لەکارخستنی کڵێسا زۆر دەوڵەمەندەکان بوون ئەوانەی یەك پێنجی زەوی وڵاتیان لەدەستدا بوو، کاری دوەمیشی لە ڕوودا وەستانی پیاوانی کڵێسا بوو بۆ سیاسەتەکەی بەرامبەر بە پاپاو داوای سەرۆکایەتی کڵێسا، بۆیە

ڕوهبانەکانی بە بەدڕەفتاری تۆمەتبار کرد دوای ئەوەی کۆمەڵێك کەسی خۆی نارد تا لەبارەی دێرەکان بکۆڵنەوە، فرمانیکرد دەستبگرن بەسەر هەموو شتەکانی دێرەکاندا، سەرەڕای ئەوەی چەنددێرێکی گەورە وەك خوێندنگەو نەخۆشخانەو ئوتێل وابوون و یارمەتی هەژارانیان دەداو دەرگایان بۆ داران والآ بوو.

پیاوانی پاشا دەرفەتیان قۆستەوەو هەموو شتەکانیان بردن تەنانەت زەنگ و دار و پەردەکانیشیان بردن و بەوێرانەیی بەجێیان هێشتن، ئەو سامانەش کە لەدەستی پاشادا کۆ ببوویەوە بۆ دامەزراندنی خوێندنگەو زانکۆ خەرجکرا یان دابەشکرا بەسەر بنەماڵە خانەدانەکاندا، بەمە چینێکی ئەرستۆکراتی نوێ هاتە مەیدان کە بەتوندی دژ بە کڵێسای ڕۆمان دەجەنگا تا پارێزگاری لە دەستکەوتەکانی بکات.

کێشە خێزانیەکانی هنری بە (ئان پۆلین) کۆتاییان پێنەهات، بەڵکوو لە میش بێزاو پێتاقەت بوو و بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ ئان پۆلین دەرکرد و پیسترین تۆمەتی بۆ داتاشی،دە ڕۆژ تێنەپەڕی تا هاوسەرگیری سێیەمی خۆی لە (جین سیمۆر)ی ڕاگەیاندو ئیدواردی شەشەمی لێبوو کە بوو بە میراتگری دەسەڵاتی، ئینجا میراتگری دەسەڵاتی ئینگلیزی ڕشێکخراو ئیدوارد مافی یەکەمی هەبوو، ئەگەر ئەو بە پێی جێگرەوەیەك لە مرد ئەوا ماری کچی بکترین ئەرکۆن دەبێتە شا، پاشان ئەلیزابێتی کچی ئان پۆلین. هنری لەساڵی (١٥٤٧ز )دا مردو ئەو کێشە ئاییندەی بۆ منداڵەکانی بەجێهێشت کە هەڵیگیرساندبوو هەر یەك لەوانیش بۆ پاکتاو کردنی کێشەکە ڕێبازێکی تایبەتیان دەگرتە بەر.

شۆڕشی ئینگلتەرا دژ بە پاپا لەسەرەتاکانیەوە حکومەت دەستی پێکرد لە ڕۆژانێکدا کە زۆربەی گەل پەیوەستی نەریتە کاسۆلیکیەکان بوون، بەڵام ژمارەیەك لەو پرۆتستانتانەی داوای ئەو گۆڕانانەیان دەکرد کە لە ڕۆژانی هنریدا کرابوون و داوای هێرشی توندیان دەکرد بۆ سەر پاپا و کڵێسا، لەزیاد بوونی بەردەوامدا بوون، لە ماوەی شەش ساڵی دەسەڵاتی شای گەنجدا (ئیدوارد)پیاوانی دەسەڵات دەرفەتیان قۆستەوەو و چی بنەمای پرۆتستانتیان دەویست بردیانە ناو

دەسەلاتەوەو مامۆستا پرۆتستانتەکانیان لە هەموو بەشەکانی کیشوەرەوە هێنا تا کار بکەنە سەر بیروباوەڕی خەلك و بەرەو مەزهەبی نوی ڕاکێشیان بکەن.

بڕیاری لەکارخستنی هەموو مەرسومە پیرۆزەکان درا و وێنە ڕەنگاو ڕەنگە جوانە نەخشێنراوەکانی سەر کلێساکان بران و پاشا خۆی قەشەکانی دیاری دەکردو پرۆتستانتەکان پایە بالاکانی نێو کلێسایان داگیر کردو پەرلەمان دەرفەتی بەچینی ئەکلیرۆس دا لەوە بەدوا هاوسەرگیری بکەن.

ماری دوای مردنی ئیدوارد لە سالی (١٥٥٣ز) گەیشتە کورسی دەسەلات، ئەو بەدیدێکی کاسۆلیکی پێگەیشتبوو، بۆیە دەیویست ناوچەی دەسەلاتەکەی بگێڕێتەوە بۆ کۆشی کلێسان بۆ ئەمە کارەشی بەلگەیەکی وای بەدەستەوە نەبوو، هێشتا زۆربەی دانیشتوان لە دلەوە پەیوەستی مەزهەبی کاسۆلیکی بوون و زۆرێکیان لەسیاسەتی وەزیرەکانی ئیدوارد بێزار بوون، چونکە دەیانویست لە ڕێگەی توندوتیژیەوە چاکسازی بکەن.

کاتێك ماری لەگەل فلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیاو کوڕی شارلی پێنجەمدا هاوسەرگیری کرد، بانگەوازی کاسۆلیکی بەرەو پێشەوە چوو، بەلام گەلی ئینگلیزی ئامادە نەبوو پاشای ئیسپانی دەست وەربداتە کاروباری ولاتیان و هەنگاویان نا تا لەدوای ژنەکەی ڕێ نەدەن کورسی دەسەلاتی ئینگلتەرا بگرێتە دەست، ماری توانی لێوانی کلێسای ڕۆما و ئینگلتەرا ڕێکبخات، بۆیە پەرلەمان بڕیاری دەرکرد بە پێی ئەو بڕیارە دەبوو بگەڕێتەوە بۆ حیبری ڕۆمانی و ئەندامانیش دەبوو لەسەر ئەژنۆ بکەون تا دەستی نێردراوی کلێسا ماچ بکەن تا لە تاوانی بیدعەو دووبەرەکی ڕزگاریان ببێت.

بەمە خۆشی ڕۆمانی گرتەوە، چونکە کوڕە گومڕاکە گەڕایەوە بۆ مالی باوکی، کاتێك کاسۆلیکی گەڕایەوە بۆ ولات ئاڕاستەی بزووتنەوەی چەوساندنەوە گۆڕشاو ئەمجارە دەبوو پرۆتستانتەکان بچەوسێنرێنەوە، ئەمەش گەیشتە ئاستێك کە مێژووی ئینگلتەرا شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، دووسەدو حەفتاو حەوت کەس بەهۆی وەرنەگرتنی بنەماکانی مەزهەبی کاسۆلیکیەوە لەسێدارە دران، زۆربەی

قوربانیەکانیش لە پیاوانی بێهیوای چینی ناوەڕاست بوون، ماریش بڕوای وابوو سووتاندنی ملهوڕان (پرۆتستانتەکان)دەبێتە هۆی ڕاگرتنی بڵاوبوونەوەی بانگەوازەکەیان.

بەڵام ئەمە بە پێچەوانەوە بوون بەڵکوو ژمارەی ناڕەزایان زیادی کرد و زیاتر سەرسامی ئەو قوربانیە پرۆتستانتیانە بوون کە گیانی خۆیان لە پێناو مەزهەبەکەیاندا دەکردە قوربانی، ڕۆژانی تێپەڕی و جارێکی دی ئاراستەکە گۆڕاو ئەمجار لە ڕۆژانی ئەلیزابیت و جیمی یەکەمدا ڕووکرا بەکاسۆلیك و هەر کەس دانی بەدەسەڵاتی ئیانی پاشا دانەنایە مەرگ بەشی بوو، ئەو سزا ماددیە قورسانەی لەسەر ئامادە نەبوانی پەرستشی پرۆتستانتی دانران دیاربوون، دەڵێن ئیلیزابیت سزای مەرگی بەسەر دووسەد راهیبدا سەپاندووە و ژمارەیەکی زۆریشی لە بەندینخانەو لە ژێر توندترین جۆرەکانی سزاداندا لەناو بردووە، پاش ئەوەی ئیلیزابیت ململانێی ئایینی چارەسەر کرد، ئینگلتەرا ماوەی چەند ساڵێك لە ژێر سایەی ئەو ژنەدا ئاشتی بەخۆیەوە دی، ئلیزابیت نزیکەی نیو سەدە فەرمانڕەوایی کرد و تیایدا دەوڵەت چەند هەنگاوێکی فراوانی پێشکەوتنی ناوخۆیی ناو توانی ئەو هێرشانە بەرپەرچ بداتەوە کە لەدەرەوە هەڕەشەیان لێدەکرد.

چینێکی مامناوەندی دەوڵەمەند دەرکەوتن کە سامانی خۆی لە ئاژەڵ لەوەڕاندن و پیشەسازی و بازرگانی و فراوانکردنی چوارچێوەی بازرگانی ئینگلیزیەوە بەدەست هێنا، ئیدی ناویان دا بەزەریاکان تا بۆ ڕێگەی نویێ بگەڕێن و کەشتیەکانی ئیسپانەکان دەستبەسەردا بگرن و داگیرگە ئیسپانیەکان تالان بکەن و بازرگانی بەو کۆیلانەوە بکەن کە لە ئەفریقا ڕاویان دەکردن و لە ئەمریکا دەیانفرۆشتن.

ماڵەکان لە پێشتر گەورەتر و خۆشتر بوون ودەوڵەمەندان جلی جوانیان دەپۆشی و مەی وڵاتانی کیشوەری ئەوروپی گرتەوەو شمەکە کانزاییەکان شوێنی قاپ و قاچاخی تەختە یان گرتەوە شوشە بۆ کاروباری ماڵەکان بەکارهات و ڕووناکی ماڵەکان زیاتر بوو و فەرش و پشتی شوێنی لبادی قەڵبی و حەسیری پێشووی گرتەوە.

بەڵام خەڵکی لەگەڵ ئەمەشدا هەر بە پەنجەکانیان یان بە چەقۆ نانیان دەخوارد، چونکە چنگاڵیان نەدەناسی، لەگەڵ ئەوەی ئاژەڵ بەخێو کردن وکارێك بوو بۆ زیاد بوونی سامانی دەستەیەکی کەمی وڵات، بەڵام زۆرێك لە جوتیارە بچوکەکانی هەژارخست و ئاژەڵ بەخێوکەرە دەوڵەمەندەکان دەستیاندەگرت بەسەر زەویەکانیاندا و وەك لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەکانیان بەکاریان دەهێنان.

جووتیاریش دوای ئەوە ئیشێکی بۆ نەدەمایەوە و هێندەی تر ژیانی سەخت بوو کاتێك لەوەڕگا گشتیەکان کەوتنەدەست خانەدانەکان ئەوانیش پارەیان لەسەر ئاژەڵی جوتیاران وەردەگرت، ئەگەر ئاژەڵە کەمەکانیان لەناو ئەو زەیانەدا بلەوەڕییان، پێشتر هیچیان بەکەس نەدەدا، جەردە و ڕێ بڕ زۆر بوون و بەناو وڵاتدا دەگەڕان هەم بەتاك و هەم بە تاقم، بەمە بوون بەمەترسی لەسەر ئاسایشی گشتی، بۆیە حکومەت ناچار بوو چەند یاسایەك دەر بکات تا بیانژیەنێت.

ئەو یاسایانە تا نیوەی سەدەی نۆزدەیەم جێبەجی دەکرا، سەردەمی ئیلیزابیت ناسراوە بە نووسەری زۆردیاری (نەمر)وەك (شکسبیر)و (باکون)و (سینسر) و لەو ماوەیەدا شیعرو پەیکەرتاشی و زانست بەجۆێك پێشکەوت کە تا ئەمڕۆش شوێنەواری ماوەتەوە.

بینیمان چۆن حکومەتی ئینگلیزی لەکاتی مردنی شاژنە ماری دا بۆ جاری دووەم بویەوە بە پرۆتستانی و شاژنە ئیلیزابێت چاپێکی نوێی پەروەردەکاری کتێبی (نوێژەکان)ی دەرکرد کە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی ئیدواردی شەشەمدا ئاماژە دەکرا بوو، هەموو هاوڵاتیانی ناچار کرد تا دیدی ئەو وەربگرن و بچن بۆ کڵێسان هەروەك قەشەکانی ناچار کرد تا کتێبی نوێژی ڕەسمی بەکار بهێنن.

ئیلیزابیت سوودی لەو سیستمی بریستیریە وەرئەگرت کە کالڤن بانگەوازی بۆ دەکرد، بەڵکوو چەند خەسڵەتێکی ئایینی کۆنی هێشتەوە لەوانە ئۆسقوخەکانن بەمە هێڵێکی نیوەندی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانتی بۆ خۆی ڕاکێشاو ئەمەش بوو بە بنەڕەتی (کڵێسای ئینلگیزی )لەدواتردا باری سکۆتلەندا هۆکاری بارگرژی

بوو بۆ ئیلیزابێت، چونکە کڵێسای کاسۆلیکی لەوێ لە دوای هاتنی ئیلیزابێت بۆسەر کورسی دەسەلات پاش کەمێك لە کارخرا، چونکە خانەدانەکان زۆر تامەزرۆی ئەوە بوون دەست بەسەر زەوی پیاوانی ئاینیدا بگرن و بەو داراییانە بحەسێنەوە، لە نێویاندا کەسێکی زۆر چالاك هەستاو مەزهەبی (بریسترینی)بردە وڵات ئەم رێبازە تا ئەمڕۆیش لەوێ زاڵە.

ماری لە ساڵی( ١٥٦١ز) دا پێی خستە خاکی سکۆتلەندا، لەوێ مێردەکەی (فرەنسیی دووەمی پاشای فەرەنسا)ی لە دەستدا، لەگەڵ ئەوەی هێشتا تەمەنی ماوەی لە نۆزدە ساڵێ تێپەڕیبوو، ماری زۆر جوان بوو، بەڵام گەلی سکۆتلەندی هەستیان بەوە دەکرد ئەو کچە بەوێ نامۆیە، ئەمەش بەهۆی رۆشنبیریە فەرەنسیەکەی و دەستگرتنی بەبیرو باوەڕی کاسۆلیکیەوە، ماری نەوەی خوشکی هنری هەشتەمی پاشای ئینگلیز بوو، بۆیە داوای کرد دوای مردنی ئیلیزابیت کورسی دەسەڵاتی ئینگلتەرا بۆ ئەو بێت، بەمە شاژنەجوانی سکۆتلەندی بوویە ئامانجی چاوی کاسۆلیکەکان بەتایبەت فیلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیاو بنەماڵەی هێنری (کین)لە فەرەنسا، دایکی ماری سەربەو بنەماڵەیە بوو.

ماری بە ئاکارەکانی خۆی کاسۆلیك و پرۆتستانتەکانیشی تووڕە کرد، بەوە خەڵك حەزیان بە کوشتنی (لورود دارنالی) مێردی دووەمی بووە تا شوو بە (بوسول)بکات و بەتۆمەتی کوشتنیش لەسەر کورسی دەسەڵات دایانبەزاند، ئیدی نەگەڕایەوە بۆ سەر کورسی دەسەڵاتەکەی، بەڵکوو دەستبەرداری بوو بۆ جیمیسی شەشەمی کوڕی خۆی و پەنای بردە بەر ئیلیزابیت و داوای پاڵپشتی و هاوکاری لێکرد، ئەویش لە ئاکاری گەلی سکۆتلەندی بەرامبەر بە ماری تووڕە بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا لە داواکاریەکانی ماری دەترسا، بۆیە گرنگیەکی زۆری دابە چاودێریکردنی ماری وەك نیمچە دیلێکی لای خۆی لێکرد.

بەتێپەڕ بوونی کات ئیلیزابیت نەیتوانی لە هەڵسوکەوتیدا بەرامبەر کاسۆلیکەکان لەسەر سیاسەتی مامناوەندی و نەرمی نواندن بمێنێتەوەو

شۆڕشەکەی باکووری ئینگلتەرا تێی گەیاند کە ژمارەیەکی زۆر هەن دەیانەوێت بەڕزگار کردنی ماری لەبەندینخانەو کردنی بە شاژنی ئینلگیز کاسۆلیکیەت بۆ وڵات بگێڕنەوەو بەدوای ئەوەشدا بڕیاری تێپەڕیکردن لەلایەن پاپاوە دژ بە ئیلیزابیت دەربکەن و هاوڵاتیانی ملکەچی نەبن.

بەڵام لە بەختی باشی ئیلیزابیتدا شۆڕشگێڕان نەیانتوانی هیچ یارمەتیەکی فلیپ یان پاشای فەڕەنسا بەدەستبهێنن، چونکە ئیسپانیا سەر قاڵی جەنگ بوو لەگەڵ زەویە نزمەکاندا، شارلی نۆیەمی پاشای فەڕەنساش لەوکاتەدا لەگەڵ (کولینی)سەرکردەی هیکۆنۆتەکاندا لە ڕێککەوتنێکی تەواودا بوو، بەمە ئیلیزابیت توانی دەستی شۆڕشگێڕان بنبڕ بکات، بەڵام کاسۆلیکەکان داوای یارمەتییان کردو دەرگای پەیوەندییان لەگەڵ دۆقی (ئەلفا)دا کردەوەو بانگهێشتیان کرد تا هێرش بێنێتە سەر وڵات و ئیلیزابیت لاببات و ماری بخاتە شوێنی، دۆق ئەلفایش پێی باش بوو پیلانێك دابڕێژێت بۆ کوشتنی ئیلیزابیت یان گرتنی بەڵام فێڵەکەی ئاشکرا کراو سەری نەگرت.

هێندە ماوە شتێکی دیکە هەیە باسی بکەین، ئەویش ئەوەی کاسۆلیکەکان هیوایان بە شوێنێك بوو تا بیکەنە بنکەیەك بۆ هێرشبردنە سەر ئینگلتەرا، ئەویش ئێرلەندا بووکە هەر لە کۆنەوە تا ئەمرۆیش لە ململانێدایە لەگەڵ ئینگلیزی داگیرکەردا، زۆرێك لە بنکەکانی کاسۆلیك چەندین جار لەوێوە هەڵیانکوتایە سەر سوپاکانی ئینگلیزو سەربازانی ئیلیزابییتسش لەگەڵیاندا جەنگاون و بەسەریاندا سەرکەوتن، بەڵام ئێرلەندا لەساڵی (١٥٨٢ز) دا بەرەو خراپە و یەککەوتەیی چوو خەریکبوو دەمرد تا ئەوەی زیاتر لە سی (٣٠)هەزار کەس لەتاو برسێتیدا مردن.

ئێرلەندا لە ساڵی (١٥٨٠ز) دا دوو لە یەسوعیەکانی نارد بۆ ئینگلتەرا تا هانی کەسانی وا بەستە بەکاسۆلیکیەت بدەن، پەرلەمان دەمارگیری بۆ ئایینی نوێ زیاد بوو باجی زۆرو بەندینخانەی کردە پاداشتی ئەو کەسەی بچێتە کۆڕەکانیان یان ئامادەی نوێژی ئینلگیزی نەبێت.

بۆ نموونـە حـوكمی لـە سـێدارەدانی بەسـەر یـەكێك لـە موژدەبەرەكانـدا دا بـە تۆمەتی ناپاكی نواند لە ڕووی وڵاتدا، ئەوەی دیكە شیاوی ناچار بوو ڕا بكات بۆ كیشوەر لـە بەهاری( ١٥٨٢ز )دا یەكـەم هـەوڵی تـیرۆر كردنـی شـاژنە ئیلیزابیـت بـە ئامـاژەی شـا فیلیـپ درا، بـە پێـی نەخـشەكە سواپای دەنـارد بـۆ ئینگلتـەرا دوای ئـەوەی بـۆ هاریكـاری كاسـۆلیكەكانی ئـەوێ لەگـەڵ شـاژندا بجـەنگێت و شـاژن بكوژێت.

مـاری شـاژنی سـكۆتلەندا نـەژیا تـا ئـەوە ببینێـت، چـونكە تۆمـەتبار كـرا بەشداریكردنی لە پیلانی دووەمی كوشتنی ئیلیزابیتدا، پەرلەمان پێی وابوو ئەگەر مـاری لـە ژیانـدا بمێنێتـەوە ئـەوا ژیـانی ئیلیزابیـت لەمەترسـیەكی بەردەوامـدا دەبینێت، چونكە فلیپی دووەمی پاشای ئیسپانیا هەوڵی دەدا ئیلیزابیت بكوژێت تـا مـاری كاسـۆلیكی بخاتـە شـوێنەكەی، جـا ئەگـەر مـاری نەمایـە فلیـپ هـیچ بەرژەوەندیەكی لە كوشتنی ئیلیزابیتدا نەدەبوو، چونكە میراتگری دەسەڵات دوای ماری (جیمیسی شەشەمی)كوڕی بوو كە ئەویش وەك ئیلیزابیت پرۆتستانتی بوو، بۆیە وەزیرەكان ئیلیزابیتیان ڕازیكرد تا شاژنە جوانی سكۆتلەندی بكوژن، ئەویش فرمانیكرد بۆ ڕزگار بوون لەدەستی بیكوژن.

لەسێدارەدانی مـاری بوویـە هـۆی ئامـادە كردنـی كەشـتیگەلێك كـە چاكترین كەشتیە ئیسپانیەكانی لـەخۆ دەگـرت، ئـەو كەشـیتگەلە دژ بـە ئینلگلتـەرا ئاڕاسـتە كرا، چونكە مـاری شاژنی سـكۆتلەندا پێش مردنـی كوڕەكـەی خـۆی لـە میراتگـری بێبـەری كردبوو وەسـیەتی بۆ فلیپی دووەمی پاشـای ئیسپانیا كردبوو تـا داوای كورسـی دەسـەلاتی ئینگلتـەرا بكـات، بۆیـە فلیـپ بڕیاریـدا وەك جێبـەجێكردنی ئـەو مافە ڕێپێدراوەی (لەلایەك وەسیەتی ماریەوە)دورگەی پرۆتستانتی بگرێت و تۆڵەی مـاری بـسەنێتەوە و سـزای ئیلزابیـت بـدات لەسـەر یارمەتیـدانی هاوڵاتیـە هۆلەندیەكانی و حەزیبی بەلەناو بردنی بزووتنـەوەی چاكسازی ئەورووپا هـەبوو بـە كشاندنەوەی ئینگلتـەرا كـە ببـوو بەڕێبـەری بزووتنـەوەی پرۆتـستانتی كەسـێتیە ئینگلیزیەكان لە قەبارەدا بچوك و لە ژمارەدا زۆر بوون.

چەند سەرکردەیەکی ڕاهێنراوی وەك (فرەنسیس دریك)و (هۆکنس)سەر کردایەتی ئەو کەشتیانەیان دەکرد کە بە دەریاوانانی نێو زەریاکان دادەنران ئەوانە دەیانزانی چۆن بەبێ نزیکبوونەوە لە کەشتیە ئیسپانیەکان لەو کەشتیانە بدەن،کاتێك ئیسپانەکان هاتن دەرفەتیان بۆ کرایەوەو هاتنە ناو نۆکەندی ئینگلیزیەوە و بایەکی بەهێزیش پالی پێوە دەنان تا دوای کەمێك بوو بەڕەشەبا، کەشتیە ئینگلیزیەکان کەوتنە شوینیان و دەیاندا لەو کەشتیە قورس و قەبانەی کە نەیاندەتوانی ئەملاو لا بکەن و لە ئەرمادا تەنها (٢٤)کەشتی بەشکستخواردوویی گەڕانەوە، ئەوانی دیکە بە شەپۆلی توندی دەریاو هێزی گەلی ئینگلیزی تێکشکان، ئینگلیزەکان یەکدەستانە بەکاسۆلیك و پرۆتستانت و خانەدان و هەژارەوە ڕاپەڕین و بەرگریان لە خاکی باوباپیرانی خۆیان کرد. لە ئەنجامی سەرکەوتنی ئیلیزابیت بەسەر ئەرمادادا یەکبوونی نەتەوەیی ئینگلتەرا دژ بە هێرشبەری بیانی کامڵ بوو، ئەمە یاریدەدەر بوو تا هەموو دەستەکانی گەلی ئینگلیزی لە دەوری دەسەلاتەکەیدا کۆببنەوە و بەشێوەیەکی یەکجارەکی پرۆتستانتی لە ئینگلتەردا بچەسپێنێت.

********************

# (جەنگە ئاینیەکان)

# کۆبونەوەی (ترنت)یەشوعیەکان

لەبەشەکانی پێشوودا زانیمان چۆن لە باکوری ئەڵمانیاو ئینگلتەرا و چەند بەشێکی سویسرادا چەند شۆڕشێکی توندی ئایینی ڕوویاندا کە بوونە هۆی جیاکردنەوەی ئەو ناوچانە لە پاپاو دامەزراندنی چەند کڵێسایەکی پرۆتستانتی سەر بەخۆ لەهەر یەك لەو ناوچانەدا.

بەلاَم وێڕای ئەمەش چەند بەرەو ڕەوتێکی گەورە لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەردەم دڵسۆزی پاپا بوون و پەیوەست بوون بەو بیروباوەڕە کۆنانەیانەو کە چەندین سەدە بوو لەسەری ڕاهاتبوون، لێرەوەو لە پێناو ڕوانین بۆ کاروباری کڵێساو چاکسازی و چارەسەری کێشە ناو خۆییەکان پاپا لەساڵی (١٥٤٥ن) دا کۆبونەوەیەکی گەورەی لەشاری تونت بەست کە دەکەوێتە سەر سنوری ئەڵمانی ئیتالی کارەکانی ئەم کۆبوونەوەیە لە بیست ساڵ یان نزیك بەوەدا تەواو بوون، توانی چەندین خراپەو گەندەڵی شارەوەی ناو جەستەی کڵێسای کۆن لاببات و بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە لە هەموو ئەو باسو خواسانەی چاکسازان و ڕوژاندبوویان بڕیاری یەکلایی بدات.

لەوانە ڕایگەیاند نەریتەکانی کڵێسا وەك بەڵگەیەك لە ئاست کتێبی پیرۆزدان تا پێستیان پێ ببەسترێت پاڵپشتی ئەوەشی کرد کە پاپایی سیستمێکی خوداییەو چی لەلایەن مارتۆن لۆثەرەوە بیانو هێنراوەتەوە بۆ ئەوەی ئیمان بە تەنها بەس بێت هەمووی بە پووچەڵ داناو بە پێویستی دانا ژیانی کاهین و قەشەکان پاکێتی و ئاکارە مەسیحیەکاندا نمونە بێت، وەرگێڕانی لاتینی کۆنی ئینجیلیش بەبنەڕەتێك زانی بۆ پشت پێ بەستنی و نیشاندانی هەر ڕایەکی ناو ئینجیلی بەقەدەغە دانا گەر ئەو ڕایە بە پێچەوانەی بڕیاری کڵێسا بێت. لەسەر داوای کۆبوونەوەکەش پیاوانی پاپایش لیستی ئەو کتێبانەیان نووسی کە نەدەبوو کاسۆلیکەکان بیخوێننەوە نەوەك باوەڕیان بە بنەماکانی کڵێسا لاواز ببێت، ئەم نەریتە دواتر ڕەگی داکوتاو لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ چەندین لیستی کتێبی قەدەغە کراو دەرچوون و بلاو کراونەتەوە.

ئیدی کڵێسای کاسۆلیکی دامەزراوەیەکی بەهێزی دامەزراندبوو تا پاپا و ڕێنمایەکانی کاسۆلیکی بەرز ڕاگرێت و ناوی (کۆمەڵەی یەسوعیەکان)ی لەخۆ نابوون ئەو کۆمەڵەیە لەلایەن (ئەطناتیۆس لیولا)وە دامەزرا کە پیاوێکی ئیسپانی بوو و لە ناو سوپادا لە جەنگێکی ئاینیدا پێی شکابوو، ئەوکات ناوی دایە خوێندنەوەی ئینجیل و نەخۆشخانەی بەو جۆرە بردە سەر، کە چوویە دەرەوە بڕیاری داژیانی خۆی بۆ مەسیح و ئاینەکەی دابنێت، لە نێو هاوڕێکانیدا کۆمەڵێکی کۆکردەوەو لەساڵی( ١٥٣٨ز) دا لە خزمەت پاپادا کۆی کردنەوەو ئەویش دانی بە کۆمەڵەکەدا ناو ڕێی بە ئەندامانی داتا بانگەوازەکەیان بڵاوبکەنەوە.

ئەوانیش کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان و ڕێ بڕین، پەروەردەی سەربازی ئەوکەسایەتیە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە سیستمی کۆمەڵەکەدا، چونکە گوێڕایەڵی کوێرانە بوو بە ئەرکی هەموو تاکێك، ئەویش بۆ پاپا ناکە لە دیدی ئەواندا تەنها نوێنەری مەسیحە لەسەر زەوی، بەڵکو بۆ هەموو کەسێك کە لەبەرزترین پلەدایە، ئەندامی کۆمەلەکە دەبوو هەر فرمانێکی پێبدرێت چەندەش قورس بێت یەکسەر بەجێی بگەیەنێت و گیانی خۆی تاو بداتە ناو گێژاوو سەختیەکانی جیهان و خۆی بەرەو ڕووی چەندین مەترسی بکاتەوە ئەگەر هاتوو فرمانی وای پێکرا، ئەم سیستمە بوویە هۆی پێشکەوتن و بڵاو بوونەوەی کاریگەری کۆمەڵەکە لە هەموو بەشەکانی جیهاندا.

بە پێی سیستمەکەیان هەرتاکێکی ئەندامی کۆمەڵەکە دەبوو بەڵێن بدات ژیانێکی پاك بگرێتە بەرو پەیوەستی هەژاری و نیاز پاکی بێت، ژمارەیەکی زۆری ئەندامە قەشەکاینان بە ناو خەڵکدا دەگەڕان و ئامۆژگارییان دەکردن یان گوێیان لە دانپێدانانەکانیان دەگرت یان هانیان دەدان تا خۆیان بۆ خوایەکلا بکەنەوە، بەڵام کارەکەیان لێرەدا نەوەستا، بەڵکو جگە لەمەش مامۆستای ڕاهێنەر بوون و خوێندنگەیان کردەوەو کۆڕو بازنەی وانە وتنەوە لێکۆڵینەوەیان گرتە بەر تا بە

منداڵی دەشیانگرت بەسەر منداڵانداو بە پێی بنەماکان و ڕێبازی خۆیان ڕایانهێنان و بەچاکی پیشەی وانەوتنەوەیان بەجێگەیاند تا ئەوە خودی پرۆتستانتەکان منداڵەکانی خۆیان بۆ ئەو خوێندنگانە دەنارد.

یەسوعیەکان کاری خۆیان تەنها لە ئەورووپادا بەرتەسک نەکردەوە، بەڵکو خێرا بە هەموو بەشەکانی جیهاندا بڵاو بوونەو فرەنسی زافیر کە ئەندامێکی دامەزریان بوو گەیشتە هێندستان و یابان، بەرازیل و فلۆریداو مەکسیك لەماوەیەکی کەمدا پڕ بوون لەمۆژدەبەری یەسوعی، لەکاتێکدا پرۆتستانتەکان ئاینەکەی خۆیان نەدەبردە بەشە بتپەرستیەکان.

*********************

# جەنگەکانی سەربەخۆیی زەویە نزمەکان

فیلیپی دووەمی کوڕی شارلی پێنجەم گەورەترین سەرخەرو پشتویانی پاپا و جزویت بوو لە جەنگی پرۆتستانتیدا و ڕێی لە بڵاو کردنەوەی پرۆتستانتی دەگرت، لە باوکیەوە(کەلە دەسەلآت کەناری گرت و پێش کات خۆی بەهۆی ئەو گرفتە گەورانەی لە ڕۆژانی دەسەلآتیدا هاتنە ڕێی پیر بوو) دەسەلآتی ئیسپانیاو داگیرکەکانی لە ئەمریکاو میلان و هەردوو صەقلیە زەویە نزمەکاندا بە میرات گرت.

ناوچە ئەڵمانیەکانی شارلەمانیش ئەوا دەستبەرداری بوو بۆ فردیناندی برای کە دەستیگرتبوو بەسەر هەرێمی بوهیماو هەنگاریاشدا، ئەمەش لە ڕێگەی میراتگریەوە ببوون بەو جۆرە ناوچەیەکی زۆر بەرفراوانی لەژێر دەستدا بوو ناوچە نزمەکان یەکەم ئەو ناوچانە بوون کە ئاڵای شۆڕشی دژ بە فیلیپپیان هەڵکرد، بۆیە یەکەم کێشە و گەورەترین گرفتی هاتە ڕێ کە حەڤدە هەرێمی لەخۆ دەگرت، ئەویش ئەوانە بوون کە شارلی پێنجەم لە دایە گەورەیەوە (ماری کچی شارلی سەرکردەی بەرگەندی)یەوە بە میراتی گرتبوون ئەو وڵاتەش هۆڵەنداو بەلجیکای ئەمڕۆ دەگرێتەوە.

ڕەگەزە بەهێزە جەرمانیەکانیش زەویە نزمەکانی باکوریان گرتبوو و تیایدا چەندین شاریان دامەزراندبوون وەك (هارلم)و (لیدن)و (ئەمستردام) و (ڕۆتردام)، هەندێکیان بەچەند بەربەستێکی پتەو چواردەوردرا بوون، لەباشوریش چەند شارێکی وەك (کانت)و (برکر)و (برۆکسل)و (ئەنتورب)هەبوون کە بە پیشەسازی و ئابووری چەند سەدە ناویان هاتووە.

دانیشتوانی زەویە نزمەکان لەسەرەتادا بەو پەڕی بێزاریەوە لەگەڵ هاتووەکاندا دەژیان، جا کاتێك فیلیپ هات قورەکە خەستر بوویەوەو هەرکارێك کە پێویست بوو بۆ توورە کردنیان ئەنجامیدا و فرمانی بەدادگاکانی پشکنین کرد تا چالاکی خۆیان دەست پێبکەنەوەو هەموو شوێنەوارەکانی ملهوڕی بەتوندی لەناو ببەن بەمە دانیشتوان تەواو گیرۆدەی دەست چەوساندنەوەیەکی دە ساڵە بوون و پاشاش لە جیاتی ئەوەی گوێ لە سکاڵای سەرکردە دڵسۆزە کاسۆلیکەکانیان بگرێت، کەچی بڕیاری لەناو بردنی وڵاتی دا.

لەسـاڵی( ١٥٦٦ز )دا پێـنج سـەد خانـەدانی وڵات وەك سـكاڵا لـە سەرسیاسـەتەكەی چـوون بـۆ لای كەچـی فیلیـپ لـە جیـاتی ئـەوەی هـەوڵ بـدات چاكسازی بكـات هـەنگاوی یەكـەمی خـۆی رووەو شـۆڕش نـا، كاتێـك شـۆڕش هەڵگیرساند بڕیاریدا، بیكوژێنێتەوە، ئەویش بەناردنی كەسێكی توندی دڵڕەق بۆ باشـوور تـا ئـەوەی ئاسمـان و زەوی لـە سـتەمی دەسـڵەمینەوە، شـەش سـاڵ فـەرمانڕەوایی كـردو تیایـدا خـۆی و سـەربازەكانی خـراپترین جـۆری تاوانیـان ئەنجامدا، ئەو كەسەش (دۆق ئیلفا)بوو.

وڵات بێزار بوو و دیمەنی خوێن بێتاقەتی كرد، بۆیە كەسایەتی (ولیەمی میری ئورەنجی)بە سەركردەی ڕزگاركەرو پاڵەوانی نەتەوەیی دەبینی، ئەویش بڕیاری دا وڵات و نیشتیمانەكەی لەدەست پاشای بیانی ڕزگار بكات، ئیسپانەكانیش پێیان وابوو ولیەم تەنها خانەدانێكی دەستەوسانە و سەركردایەتی دەستەیەكی جوتیاران و ماسیگران دەكات دژ بـە پاشـایەكی بـەهێزی خۆسـەپێنی وا كـە دنیـای لـە ژێـر دەستەو فەرمانڕەوایی دەوڵەمەندترین وڵاتانی جیهان دەكات.

ولیـەم بـە پلـەی یەكـەم هێـزی خـۆی لەسـەر هەرێمـەكانی بـاكوور دادەنـا، گرنگترینیـان هۆڵەنـدا بـوو، چونكە هۆڵەندیـەكان سـەربە ڕەگـەزی جـەرمانی بـوون و مەزهەبی پرۆتستانتیان هەبوو، بەڵام ئەوانەی باشوور تا ئەمڕۆیش سەربە مەزهەبی كاسۆلیكین، لە ڕووی خوێنیشەوە لە دانیشتوانی فەڕەنسا باكوور نزیكترن سەربازە ئیسپانیەكان بۆ سەركەوتن بەسەر ولیەم و سەربازەكانیدا سەختیان بە دینەكرد.

ولیـەم هـەمو جەنگـەكانی دۆڕانـد، بـەڵام یـەك شـتی هێشتەوە ئـەویش هیـواو هێـزی بڕیـاردان بـوو، بـاوەڕ بەسـەر چـەكدا سـەركەوت و چـەند سـەركەوتنێكی بەدەسـتهێنا ئـەویش بـەوەی دەریاوانـە هۆڵەندیـەكان توانییـان دەسـتبگرن بەسـەر كەشـتیەكانی ئیـسپانیاداو بیانفرۆشـن بـە ئینگلتـەرای پرۆتـستانتی ئـەم سـەركەوتنەش زۆرێـك لـە شـارەكانی بـاكوورو هەرێمـە هۆڵەنـدی و ئێرلەندیـەكانی هاندا تا ولیەم بێت بەسەر كردەیان بەو جۆرە هەر دوو ناوچەكە بوون بە بنـەڕەتی یەكێتی زەویە نزمەكان.

ئیلفاش دەستیگرت بەسەر چەند شارێکی ڕاپەڕیودا و بەشێوە ناسراوە و خۆی سزای دان و ژنان و منداڵانیش سەربەرشی بەجێی هێشتن تا لە ناو خوێناویاندا بگەوزێن، بەڵام ئاگری شۆش لە جیاتی ئەوەی بکوژێتەوە کڵپەی سەندو هەرێمە کاسۆلیکەکانی باشوور ڕاپەڕین، بەڵام شۆڕشەکەی باشوور درێژەی نەکێشا، بۆیە فلیپ ئیلفای گۆڕی و چەند فەرمانڕەوایەکی نەرم و لەسەر خۆی هێنان کە توانیان کاسۆلیکی باشوور ڕازی بکەن تا بگەڕێنەوە بۆ لای پاشا کۆنەکەیان.

بەو جۆرە باکوور بەتەنهایی لە ژێر سەرکردایەتی ولیەمدا مایەوەو ئامادە نەبوو دان بە ئیسپانی ستەمکاردا بنێت بێتە فەرمانڕەوای تا ئەوەی ساڵی (١٥٨٩ز) هات و لەو ساڵەدا حەوت هەرێمەکەی باکووری ئاوەڕێژگەی (ڕاین)و (شلت)یەکیان دەگرت و یەکێتی (ئەترخت)پێکهات، ماددەکانی ئەو یەکگرتنە چەند بەندێکی یاسایی بنەڕەتی کۆماری هۆڵەندایان پێکهێنا، ئەو کۆمارەی کە دوای دوو ساڵ بە شێوەیەکی ڕەسمی سەربەخۆیی خۆی لە ئیسپانیا ڕاگەیاند.

فیلیپ زانی ولیەم ڕۆحی شۆشەکەیان بۆیە خەڵاتی گەورەی پارەو نازناوی گەورەی بۆ ئەو کە سەدا ناکە بتوانێت پیاوی نیشتیمانی هۆڵەندی بکوژێت، چەندین هەوڵ دران تا ولیەم تیرۆر بکرێتن بەڵام هەموو یان شکستیان خوارد تا ئەوەی ساڵی (١٥٨٤ز) هات و ولیەم بە تیرێ بکوژێت لە ماڵی خۆیدا سەری نایەوە، ولیەم هەڵبژێردرا بوو تا بێتە فەرمانڕەوای میراتگری هەرێمە یەکگرتوەکان.

هۆڵەندیەکان دەمێك بوو بەچاوی فریاگوزاریەوە دەیانڕوانیە شاژنە ئەلیزابێت و فەرەنسای دراوسێیان، بەڵام هیواکانیان سەریان دەگرت تا ئەوەی دواجار شاژنی ئینگلیز بڕیاریدا سوپایەك بنێرێت بۆ یارمەتیدانیان، ئەو کارەیش فیلیپی توورە کرد بۆیە بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر ئینگلتەرا (وەك پێشتر ئامارەمان پێدا).

بۆ ئەمەش کەشتیگەلی گەورەی خۆی (ئەرمادا)ئامادەکرد، بەڵام کەشتیگەلەکە تێکشکا، ئەمە ڕێی لە فیلیپ گرت تا نەتوانێت بۆ ملکەچکردنی هەرێمە

یەکگرتووەکان کارێکی چاك بکات، هەروەك خەریکبوو داهاتی ئیسپانیا لەناو بچێت، ئیدی ئەو وڵاتەی بەدەست سامانیەوە نازو کەشخەی دەنواند بەرەو دەستبەتاڵ و بێدەرامەتی دەچوو هەر چەندە لە پشت دەریاکانەوە کانزاو سامانی دەهێنا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئیسپانیا بێهیوانەبوو لە گێڕانەوەی ئەو دەسەڵاتە لەدەست چووەی کە ئێستا بووە بەدەوڵەتێکی چالاکی گرنگ هەرچەندە قەبارەی کەمە لەساڵی ( ١٦٤٨ز )لە پەیماننامەی (وستڤاليا)دا ئینجا دان نرا بە سەربەخۆیی زەویە نزمەکاندا.

کاتێك فیلیپ چاوی داخست تا لەساڵی ( ١٥٩٨ز )دا کۆتا هەناسەی هەڵکێشت، سەیری کرد نەیتوانیوە هیوا سیاسیە گرانبەهاکانی بەدەستبهێنێت، بەڵکوو کەشتیگەلی ئەرمادای تێکشکاو نەخشەکەی بۆ گێڕانەوەی ئینگلتەرا بۆ کۆشی کڵێسای کاسۆلیکی بەشێوەیەکی یەکجارەکی شکستی هێنا.

بەهاتنی پاشایەکی پرۆتستانتی بەسەر کورسی دەسەڵاتی فەڕەنسا جەنگە ئایینیەکان کۆتاییان پێهات، ئەمە پاشایە لەگەڵ پرۆتستانتەکاندا نەرمی نواندو سەرۆك وەزیرانی پێدان و ئامادە نەبوو دەرفەت بە ئیسپانیا بدات تا گەمە بە کاروباری فەڕەنسا بکات، لەو دەسەڵاتەی لەباوکیەوە بۆی بەجێما، دەوڵەتێکی بەهێزی پرۆتستانتی پێکهێنا کە توانی لە سیاسەتی ئەورووپیدا ڕۆڵێکی گرنگی وا ببینێت کە لە ڕۆڵی خودی ئیسپانیا کەمتر نەبێت، ئیسپانیاش چوویە پلەی دووەمی دەوڵەتە ئەورووپیەکان، ئەمەش لەدوای مردنی فیلیپ و بەهۆی ئەو هەمووجەنگانەوە بوو کە وڵاتی داتەپاند و داهاتی هاوردەی جیهانی نوێی کەمیکرد لەبەر ئەوەی قەڵەمڕەوی کانزا گرانبەهاکانی لەدەست نەما.

********************

# (جەنگەکانی هیکۆنۆت)

مێژووی فەڕەنسا لە نیوەی دووەمی سەدەی شانزەیەمدا تەنها زنجیرەیەکی بەردەوامی قەسابخانەی مرۆیی و جەنگی خوێناوی ناوخۆیی نێوان (کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان)بوو، فرانسوای یەکەم کە لەسەردەمەکەیدا ئەو ڕووداوانە ڕوویاندا زۆر گرنگی بەکاروباری ئایینی نەدەدا، بەڵکوو کۆمەڵێك ڕووداو بێزاری کردبوو کە دەدرانەوە پاڵ پرۆتستانتەکان، بۆیە فرمانیکرد تا ڕێ نەدەن کتێبەکانیان بڵاوبکرێنەوە، پاشان لێشاوی چەوساندنەوەی شەپۆلی دەدا و لەساڵی( ١٥٣٥ز )دا ژمارەیەك لە پەیوەستانی ئایینی نوێ سووتاندو کاڵڤن ناچار بوو ڕابکات بۆ بازل.

لەوێ لە پێشەکی کتێبەکەیدا (بنەماکانی ئایینی مەسیحی) بەرگری خۆی بۆ بیروباوەڕەکانی خۆی بڵاو کردەوە، پاشان ئەو لافاوەی شەپۆلی داو فرانسوا فرمانیکرد تا سێ هەزار جوتیاری کەنارگیری دانیشتووی لاپاڵێ شاخەکانی ئەلب سەربڕن، ئەوانە تاکە تاوانیان دەستگرتنیان بوو بە بنەماکانی (وەلدە نسیە ساکارەکان)ەوە.

کاتێك هنری دووەم هات (١٥٤٧ز-١٥٥٩ز) سوێندی خوارد هەموو پرۆتستانتەکان لەناو بات، بەوە ئاگری هەڵگیرسان و کڵپەکەی خەریکبوو جەستەی سەدان پرۆتستانت بسووتێنێتن بەڵام زۆر نەژیاو لە کتوپڕشێکد کوژرا، بەمە ناوچەکەی بۆ سێ کوڕی لاوازی خۆی بەجێهێشت، ئەوانەش کۆتا لقی بنەماڵەی (ڤالوری) بوون و یەکلەدوای یەك فەرمانڕەوایی وڵاتیان کرد.

وڵات بەردەوام چەرمەسەری بەسەردا هات و دووکەڵێ جەنگی ناوخۆیی ئاسمانی وڵاتی بەجۆرێك گرتەوە کە پێشتر نمونەی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، کاتێك شارلی نۆیەم (١٥٦٠ز-١٥٧٤ز)هاتە سەرکورسی دەسەڵات تەمەنی دەساڵان بوو، کاترین مدیتشی دایکی ڕاپەڕی و داوای مافی کارگێڕی حکومەتی کرد تا ئەو کاتەی کوڕەکە دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن و توانای کاریگێڕی کاروباری دەبێت.

لەوسەردەمەدا پرۆتستانتەکانی فەرەنسا تاقمێکی بەهێزیان هەبوو بەناوی (هیکۆنۆت)کە لە بیروباوەڕیاندا کەوتنە شوێن بنەماکانی کالڤن.

ژمارەیەکی زۆریان لە نێو ئەوانەشدا سەرکردەی گەورەیان (کولینی)سەر بە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو، هەروەك بوو بە پاشای هەرێمی (ناڤار)لەسەر سنوری باشووری فەرەنساو بە هەموو هێزەکانیەوە پاڵپشتی دەکرد، ئەو پاشایە سەر بە لقێکی بنەماڵەی فەرمانڕەوای فەرەنسا بوو کە ناسراو بە (بۆربۆن)بوون.

ئەم لقە دواتر کورسی دەسەڵاتی فەرەنسای گرتە دەست، ناچار هیکونوت دەبوو بچێتە مەیدانی ململانێی سیاسی و خەباتی دژ بە حکومەتەکەوە، بۆیە هیکۆنۆتەکان حیزبێکی سیاسی ئاینیان دامەزراندو زۆربەی جار لەبەر چەند مەبەستێکی دنیایی دەجەنگان.

لە ڕۆژێکی یەکشەممەدا کە (دۆق کیز)ی خانەدانی دەمارگیری کاسۆلیکی بەشاری (ڤاس)دا تێدەپەرێ، هەزار کەسی هیکۆنۆتی دی کە بۆ پەرستش کۆبوونەوە، شوێنکەوتەکانی دۆق بەرەو ڕوویان بوونەوە بە توندی چوونە ناویان و لە ئەنجامدا پێکدادانێکی نێوان هەردوولا ڕوویدا و تیایدا ژمارەیەکی زۆری ئەوانە لەلایەك سوپاو کوژران.

هەواڵی ئەو قەسابخانەیە بڵاو بوویەوەو هیکۆنۆتەکان ڕاپەڕین و ئاگری جەنگێکی سی ساڵ یان زیاتر هەڵگیرسان و چەند ماوە بڕیەکی کەمیش دەکەوتە نێوانەوە، ئیدی مەرگ بەوڵاتەدا دەگەڕاو گیانەکانی دەچنیەوە پەیوەندیەکانی نێوان شارلی نۆیەم و کنترینی دایکی لەلایەك و سەرکردەی هیکۆنۆت (کولینی)لە لایەکی دیکەوە لەو پەڕەی دۆستایەتیدا بوو تا ئەوەی کولینی پایەی شێوە سەرۆك وەزیرانی هەبوو پۆلینی حەزی دەکرد ڕیزەکانی کاسۆلیك و هیکۆنەتەکانی وڵات یەکبخرێن تا هێرشێك بکەنە سەر بنەماڵەی هۆبسبۆرگ لە ئیسپانیا.

بەڵام حیزبی کاسۆلیکی(کیز)پیلانێکی ترسناکی بۆ تێکشکاندنی ئەو پرۆژەیە داڕشت و کترینی ڕازیکرد تا وا بزانێت کولینی فێڵی لێ دەکات، بۆیە

لەگەڵ ئەو ژنەدا پیلانیان دانا بۆ تیرۆرکردنی کولینی، بەڵام کەسی جێبەجێکار تیری خۆی نەپێکاو کولینی تەنها بریندار بوو، لە ترسی ئاشکرا بوونی بارەکەو بەشداربوونی دایکی (کوشتنی ئەو وەزیرەی کە دڵسۆزو خۆشەویستی بۆ هەبوو) کاترین خێرا چوو چیرۆکی جیاجیای پیلانەکەی بۆ گێڕایەوە بەو بانگەشەیەی هیکۆنۆتەکان ویستویانە ئەوە بکەن، بەوجۆرە ئەمجارەش ئەویشی هاندا تا قەسابخانەیەکی گەورە ئەنجام بدات، ئەویش بە ئامارژەکردنێک لە ڕۆژی جەژنی (سانت برپلمیو)دا دەستپێبکات.

لەو ڕۆژەدا ئەو کارەساتە ڕوویداو لە پاریس لەماوەی کەمتر لە دووڕۆژدا دوو هەزار پرۆتستانت کوژران و هەواڵەکە گەیشتە هەرێمەکان و ژمارەی کوژراوانیش گەیشتە دەهەزار کەس یان زیاتر.

بۆ جاری دووەم جەنگی ناوخۆ هەڵگیرسایەوەو کۆمەڵێك بانگەشەکەری دەسەڵات لەسەر کورسی دەسەڵاتی فەرەنسا کەوتنە ململانێ و لە ئەنجامدا ناڤار و هیکۆنۆتەکان سەرکەوتن و نازناوی هنری چوارەم لە ناڤار نرا بەو جۆرە دەسەڵاتی فەرەنسا گوازرایەوە بۆ بنەماڵەی بۆبۆن.

پاشای نوێ هەستیکرد کە دوژمنی زۆرە و ئەو بارەی وڵات تووشی بووە خراپە، بۆیە وای بەباش زانی ئایینی زۆرینەی دانیشتوان وەربگرێت و داوای کرد تا بگەڕێنەوە بۆ کڵێسای کاسۆلیکی، ئەمەش لەساڵێ ( ١٥٩٣ز) دا بوو بەڵام دۆستە کۆنەکانی خۆی لەبیر کردو لەساڵێ ١٥٩٨ز دا مەرسومی (ناتن)ی دەرکرد کە تیایدا زامنی کۆمەڵێك ماف و دەسەڵاتی بۆ پرۆتستانتەکان دەکرد.

دەکرێت ئەو مافانە دابەش بکەین بۆ مافی ئایینی و مەدەنی و ڕامیاری، مافە ئاینیەکانیان بریتیبوون لە ئەنجامدانی بۆنەو ڕێورەسمی پەرش لە هەموو ئەو شارو گوندانەی پێشتر تیایاندا دەژیان لەگەڵ ڕێ نەدان بە نیشتەجێبوونیان لە پاریس مافە مەدەنیەکانیان دەرفەتدان بوو پێیان تا بچنە ناو هەموو پیشە گشتیەکانەوەو یاسایان بۆ پارێزراو بێت.

مافە سیاسیەکانیشیان کە دواتر بوو بە قوڕ بەسەری بۆیان مافی یاسادانان بوو بۆ خۆیان بە شێوەیەکی سەربەخۆو پاراستنی چەند شارێکی پاسەوانکراو بۆ خۆیان تا ئەگەر کەسێك هێرشی بردە سەریان بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن هنری (سولی)هەڵبژارد تا بێتە وەزیری، سولی کەسێکی ڕاسترە و بێ پێچ و پەنا بووە، هەوڵی خۆی خستە کار بۆ گێڕانەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە لەماوەی دەسەڵاتی سێ براکەی بنەماڵەی ڤالوریدا هێنری خۆی لەدەست دابوو.

لەساڵی (١٦١٠ز) دا هنری و ولیەمی بێدەنگیش تیرۆرکران، لەکاتێکدا وڵات لە پشت هەوڵە پڕ بەرهەم و چاکەکانیەوە پێشدەکەوت، ئەو بەهاریکاری وەزیرەکەی وڵاتی لە نەبوونی ڕزگار کرد و هانی پیشەسازی داو یەکێتی یەکی پێکهێنا تا هێرشی برێتە سەر بنەماڵەی هۆبسبۆرگ (سولی)ش نەیتوانی لەگەڵ ژنەکەی هنری دا هەڵبکات، چونکە ئەو ژنە لەبەر کەی‌می تەمەنی کوڕەکەی ببو بەسی، بۆیە پاش ماوەیەکی کەم سولی دەستی لەکار کێشایەوە.

چەند ساڵێك تێنەپەڕی تا لە فەرەنسادا پیاوێکی بەهێز دەرکەوت کە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر ڕێکردەی کاروباری ئەوروپا لەوماوەیەدا، ئەویش (ریشیلیو)بووئەم کەسە لەساڵێ (١٦١٤ز) تا ساڵی (١٦٤٢ز) بەدەستێکی پۆڵاینیەوە فەرمانڕەوایی وڵاتی کرد، لەوماوەیەدا لویسی سیانزەیەم پاشا بوو ریشیلیو لەسەر چەند فاڵێکی سەرەکی سیاسەتی خۆی ئەنجام دەدا، لەوانە:

١- دارمانی بنەماڵەی هۆبسبۆرگ، ئەو جەنگی سی ساڵەی کردە ڕێگەی بەدیهێنانی مەبەستەکەی

٢- کشاندنەوەی خانەدانەکان و لەناو بردنی قەڵەمڕەویان و دارماندنی قەڵاکانیان ئەم کارەشی ئەنجامدا.

٣- لێدانی هیکۆنۆتەکان و لێسەندنەوەی مافە سیاسیەکانیان، چونکە هەڕەشە بوو بۆ سەر ئاشتی و ئارامی وڵات، بۆیە هەرکامیانی بویستایە لێی دەداو دەری دەکرد، پاشان تەنها مافە ئاینیەکانی بۆ گێڕانەوەو مافەکانی دیکەی لێ زەوت کردن.

# (باسی چوارەم)
# (شالاوە خاچپەرستیەکان)
# هێزی دەوڵەتی سەلجووقی

دەوڵەتی سەلجوقی بۆبەرگریکردن لە موسڵمانان دژ بە دوژمنانیان هەستا، بۆیە سەرەتا لەگەڵ ئەوبوەیهیانەدا جەنگا کە دەستیانگرتبوو بە سەر خیلافەتی ناو بەغدادا، پاش لەناو بردنی بووەیهیەکان ڕوویانکردە عەبیدیە ئیسماعیلیەکانی ناو میسرو شام و شامیان لێپاك کردنەوەو بەرەو میسر دەریانکردن.

ئەوان دەیانویست هەموو دەوڵەتی فاتیمی لەناو ببەن، پاشان سەلجوقیەکان ڕوویانکردە بیزەنتیەکانی قوستەنتینیەو لە ئاسیای بچووك (تورکیا)سەنگەرنشین بوون ودەستیانگرت بەسەر شاری نیقیەی کە ناراوی ڕۆژهەلاتی دەریای مەرمەرەو بەرامبەری شاری قوستەنتینیەداو لەوێ سەنگەریان گرت و خۆیان بۆ چەند جەنگێکی درێژخایەن ئامادە کرد.

ئەو جیهادە سەلجوقیە هەر یەك لە بیزەنتی و عەبیدیەکانی ترساند، بۆیە پەنایان بردە لای پاپای کاسۆلیك تا ڕزگاریان بکات. بۆ ئەمەش پیرۆزیە نوسرانیەکانی ولاتی موسڵمانان و خێروسامانی زۆری ولاتی موسڵمانانیان بۆ خستە بەرچاو.

کاتێك لەولاتی شام جەنگی نێوان سەلجوقی و عەبیدیەکان ڕوویدا، زۆرێك لە مەسیحیە ئەوروپیە حاجیەکانی شوێنە پیرۆزەکانی ولاتی شام بەرەو ڕووی ڕفاندن و گرتن و کوشتن بوونەوە، بەتایبەت کە لەو ماوەیەدا حەجیان زیادی کرد.

ئەمە وای لە بوترسی ڕوهبانێکی فرەنسیەکان کرد کە لەو حەجەدا بەشدار بوو تا ڕق لە موسڵمانان و دەستگرتنیان بەسەر بەیتولمەقدیسدا هەڵگرێت، بۆیە گەڕایەوە بۆ ئەوروپا کەوتە هاندانی خەڵك بۆ جەنگی دژ بە موسڵمانان.

پاشان چوو بۆ لای پاشایانی ئەوروپاو پاپای کاسۆلیکی ئوربانی دووەم و هانیدا، پاپایش پێی دڵخۆش بوو هانیدا تا لەو بانگەوازو هاندانەی بەردەوام بێت.

باری خراپی ئابووری ناو ئەوروپا یاریدەدەر بوو، چونکە ئەو برسێتی و هەژاریەی نوێیان ببو سەخت سەرکردەکانی ئەوروپا دەیانویست ماڵو موڵك و سامانی خۆیان زیاد بکەن، خەڵکی گشتی دەیانویست لەو سیستمە دەرەبەگایەتیە چینیایەتیە ڕزگاریان ببێت کە تیایدا دەژیان، هەموو ئەمانە یاریدەدەر بوو تا زووتر بچنە ناو ئەو جەنگانەی کە دواتر بە جەنگە خاچیەکان ناسران.

*********************

# شاڵاوی خاچپەرستی یەکەم

ئەمە لە لایەن پاپا ئیربانی بوومەوە بوو کە پاپای ڕۆما بوو، دوای ئەوەی نامەی بۆ ئوسقوفەکانی فەرەنسا و وڵاتە دراوسێکان نارد داوای لێکردن لە (لیرمونت)لە فەرەنسا کۆ ببنەوە لەگەڵیدا و لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٠٩٥ ز دا کۆڕی (کلیرمۆنت)بەستراو نزیکی سێ سەد پیاوی ئایینی تیایدا ئامادە بوون.

پاپا ڕایگەیاند پاش چەند ڕۆژێکی دی دەقێکی گرنگ بڵاو دەکاتەوە، پاپا لە وتارەکەیدا باسی ئەوەی کرد کە حاجیە مەسیحیەکان چۆن لەکاتی گەشتیاندا سزاو سەختیان دێتە ڕێ ئینجا بانگەوازی کرد بۆ جەنگ خاچپەرستیەکان و سەرکردەکانی بانگ کرد تا ناکۆکیەکان وەلا بنێن و خاچی خستە بەرچاویان پاشان وتی با مەسیحیەکان لە ڕۆژئاواوە بچن بۆ ڕزگار کردن و فریاکەوتنی ڕۆژهەڵات، هەر کەس لەو جەنگەدا بکوژرێت تاوانەکانی دەسڕێنەوەو خوا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، نا بێت لادان و تەمبەڵی بنوێنین هاتنی هاوین ئامادەی ڕۆیشتن بن و خوایش ڕێنموریکەریان بێت.

خێرا هەموو چوون بەدەمیەوەو هاواری ئامادە بوانی لێکەوتەوە: (خوا وای دەوێت)کاتێک پاپا لەوتارەکەی بوویەوە، ئوسقوفێك لە شوێنی خۆی هەستا (لی بویە)و لەبەردەم کورسی پاپادا چەمیەوە و داوای لێکرد دەرفەتی بدات تا پەیوەستی ئەو شاڵاوە پیرۆزە بێت.

کاردینال (گریگۆری)ش هەمان شتی کردبو بە دەنگێك دیارو بەرز هاواری پیرۆزی دەکرد و خەڵکی ئامادەبوش لەگەڵیدا دەیانوتەوە، کاتێك نوێژ تەواو بوو، پاپا هەستاو دەقەکەی خوێندەوەو فرمانی بە بیسەرانیشی کرد تا بچنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، ئیربانی دووەم داوای لێکردن تا خۆیان سەرکردایەتی شاڵاوە خاچپەرستیەکان بکەن.

سوپاکان لە شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستیدا بۆ دووبەش دابەشبوون: بەشێ لەسەر ئاستی گەل و هەژاران کە بە شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستیدا بۆ دوو بەش

دابەشبون: بەشێك لەسەر ئاستی گەل و هەژاران کە بە شالاوی گەلان ناسرا، بەشی دووەم لەسەر ئاستی سەرکردەو فەرمانڕەواکان و ئیمپراتۆری بیزەنتی.

## أ: شالاوی گەلان:

بوترس سەرکردایەتی دەکرد و لە جوتیاران و خەڵکی شارو خانەدانە بچووکەکان و چەند جەردەو ڕێگرو تاوانبارێك پێکدەهات، پەیوەندیەکی وا ڕێکی نەدەخست تەنها پەیوەندی گوڕوتینی هێرشبردنە سەر ڕۆژهەلات و گرتنی ئەو زەویانە نەبێت کە پڕن لە هەنگوین و شیر، هەروەها بە نیازی دەستگرتن بەسەر گۆڕی مەسیحدا.

بوترس بەو سوپایەوە گەیشتە کۆلۆنیاو لەوی وەستا تا هەندێ لە ئەڵمانەکان پەیوەستی بوون و یارمەتی بەسوپاکەی گەیشتن، پاشان دوای هەفتەیەك سواری ولاخەکەی بوو بەرەو مەجەرو ئەڵمانیا چوو بەشەکەی دیکەی سوپاش بە پیادە بوو، هەروەها کۆمەڵێك لەوانەی بەوتەکانی مەسیحیەت گەرم بوون کەوتنە شوێنی ئەو سوپایە.

لەڕێگەیدا هێرشی دەبردە سەر چەند گوندێکی ئەورووپی و تالانیان دەکردن هەندی لەسوپاکە گەمارۆی شاری (سملن)ی ناو مەجەڕیان داو دەستیانگرت بەسەر قەلاکەیدا، لێرەدا زیاتر لەچوارهەزار مەجەری لەناو چوون، پاشان خێرا بە تێپەڕاندنی ڕووباری (ساف بەرەو زەوی بیزەنتی گەڕانەوە ئەمەش لە ترسی تۆڵە سەندنەوەی پاشای مەجەڕ.

بوترس بەسەربازەکانیەوە گەیشتە شاری (صوفیا)پاشان لەیەکەم ڕۆژی ئۆگەستسدا گەیشتنە قوستەنیتینیە، لەوێ ژمارەیەکی زۆر ئیتالیەکان سەریان بۆ دانەواند، پاشان لە بسفۆڕەوە پەڕیەوە بۆ ئاسیا، لە ڕێگەدا کەوتنە تالان و برین،ئیمپراتۆری بیزەنتە (ئەلکسیوس) پێشنیاری بۆ بوترس کرد تا چاوەڕوان بێت تا هێزە ڕێکخراوە خاچپەرستیەکان بگەن پێش ئەوەی هێرشی خۆی دەستپێبکات.

بەڵام سەرکردەکانی بوترس بە تالان و بڕی هەڵیانخەڵەتاند، بۆیە درێژەیان بەکشانی خۆیان دا تا گەیشتنە بەر دەرگای نیقیەی پایتەختی سوڵتان قلج ئەرسەلانی سەلجوقی، لەوێ شتێکی زۆریان بردو دڕندەیەکی گەورەیان نواند، لەوانە منداڵی ناو پێشکەیان دەکوشت، پاشان دەستەیەکیان کەوتنە تالانی و نیقیەیان تێپەڕاند تا گەیشتنە قەڵای (ئەکسیریەجور دون) و داگیریان کردن بەڵام موسڵمانان ناچاریان کردن تا خۆیان بەدەستەوە بدەن.

دەستەیەکی دیکەی خاچپەرستانی هێرشیان بردە سەر گوندو شارە ئیسلامیەکان و سەرکردەکانیش کەوتنە دووبەرەکی، کۆمەڵێکی فەڕەنسیان بەرەو نیقیە چوون، لە ڕێگەدا سەربازە موسڵمانەکان بۆسەیان بۆ نانەوەو ئاگر بارانیان کردن و گێڕانیانەوە بۆ قەلاکەیان، بەڵکو و قەلاکەیان بەسەردا دارماندن و زۆر بەخراپی تووشی شکستیان کردن و ژمارەیەکی زۆریان لێ بەدیلگرتن، جگە لە کوژراوەکانیشیان، ڕاوە دوویشیان نان بۆ قەڵایەکی دی کە ژمارەیەکیان ڕایانکردبوو بۆ ئەوێ، لەوێ ئەوانیشیان لەناو بردن.

## ب: شاڵاوی سەرکردەکان و ئیمپراتۆری بیزەنتی:

ئەمە زیاتر سیستم و وردەکارترین دەسەڵاتیان لەدەستدا بوو، پێشتر ماڵو سامان و ئامادە سازی وئامێرو شمەك وئامادەسازی سوپایان هەبوو،تیایدا گۆڕانی پاشایی ئەوروپاو سەرکردەکانی فەڕەنساو ئینگلتەراو سکۆتلەنداو ناوچەکانی دیکەش بەشدار بوون، پاپا داوای لێکردن لەدەرەوەی شورەکانی قوستەنتینیەدا کۆببنەوە.

کاتێك ئەوسوپایانە گەیشتنە قوستەنتینیە ئیمپراتۆری بیزەنتی بەڵێن و سوێندو پەیمانی لەسەر کردە جەنگاوەرەکانی ڕۆژ ئاوا وەرگرت تارێ بەسەربازەکانیان نەدەن لە خاکیاندا تالانی بکەن، ئەوانیش سەرەتا ئامادە نەبوون، ئەویش یارمەتی لێبڕین، بۆیە دوای سوێندی دان نان بە گەورەیی ئەویان بۆ خوارد تا چی ناوچەی موسڵمانان دەگرن ئەو بێتە گەورەی هەروەها سوێندیان خوارد نەچنە قوستەنتینیە، چونکە ئیمپراتۆر ئەگەر چی پەنای بۆ ڕۆژ ئاواییەکان برد.

بەڵام ترسی لەو سوپا زۆرە هەبوو بۆ سەرخۆی و دەسەڵاتەکەی دوای ئەوەی بینی سوپای ڕۆژئاوا زۆرو بەهێزە، پاش ئەوەی ئەوسوپایانە لە بسفۆڕ پەڕینەوە ئیمپراتۆر هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا دوای ئەوەی لێکتێگەیشتن و نەخشە دانان بۆ بەرەنگار بوونەوەی موسڵمانان لە نێوان خاچپەرستە ڕۆژئاوایەکان و خاچپەرستە بیزەنتیەکاندا گەیشتە ئەنجام.

ئامانجی هەموو ئەو سوپایانە دەستگرتن بوو بەسەر نیقیەی پایتەختی سەلجوقیەکاندا، پێیان باشبوو لەکاتی ئامادە نەبونی سوڵتان قلج ئەرسەلانی یەکەمدا هێرشی ببەنە سەر شارەکە نیقیە گەمارۆدراو لەگەڵ شالاوی هاتوی سوپای شالاوی گەلاندا یەکیانگرت، سولتانی سەلجوقی گەیشتە شارەکە و هەولیدا بچێتە ژوەرەوە، جەنگیکی یەك ڕۆژەی ڕوویدا.

بەلام نەیتوانی بچێتە ژورەوەو خاچپەرستانیش پاش زیانێکی زۆری گیانی پاشە کشەیان کرد وداوای یارمەتی دەرییان لە ئیمپراتۆر کرد، ئەویش یارمەتی دان، بەلام نەیانتوانی بچنە ژورەوە، بەلکوو دانیشتوانی شارەکە خۆیان دا بەدەستەوە، زۆربەیان مەسیحی بوون.

ئیمپراتۆر پاش گەمارۆیەکی نزیك بەیەك مانگ بەشەو چوویە ناوی و سولتانیش پێگەی خۆی گواستەوە بۆ قونیە، سوپا خاچپەرستیەکان خۆیان ئامادەکرد تا بەرەو قونیەش بکشێن و پشتیان بەستبوو بەچەند دەستەیەکی سوپای بیزەنتی سەرەرای یارمەتی و هاریکاریە گەیشتوەکان کاتێك خاچپەرستان لەناوخۆی ئاسیای بچوکدا سەرقاڵی جەنگی موسلمانانی بوون، بیزەنتیەکان لە بەشەکە ئاژاوە رۆژئاواییەکەیەوە بەرەو جەنگی موسلمانان دەرچوون پاشان خاچپەرستان نیقیەیان گرت دوای ئەوەی سولتانی سەلجوقی پاشەکشەی لێکرد.

دواتر بەردەوام فریاگوزاری ئەوروپیان پیدەگەیشت و ئەوانیش بەرەو شام دەچوون، ئینجا (فریجیا و (چورولیوم) و (هرقلە) یان گرت، دواتر سوپا خاچپەکان بۆ دوو بەش دابەشبوون: یەکەم بەرەو قیلیقیە دەچوو، دووەمیش بەرەو قەیسەر دەچوو دەستیگرت بەسەریداو دواتری (بلاکنتیا)و دواتر (مەرعەش)گیراو لەوێ خاچپەرستان چەند ڕۆژێك مانەوە.

ئیمراتۆری بیزەنتیش دەرفەتی قۆستەوەو هێرشی بردە سەر ئەزمیر و ئەفسوس ولید با و ڕۆژئاوای فریجیاو بەمەش دەستیگرت بەسەر بەشی ڕۆژئاوایی ئەنادۆلدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو شارانە لە دەوڵەتی سەلجووقی دابراو و دورر بوون. دیارترین ئەنجامی شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستی دەستگرتنی بیزەنتیەکان بوو بەسەر ئەنادۆلدا.

سەرکردە خاچیەکان لە نێوان خۆیاندا کەوتنە دابەشبوون و هەندێکیان (بلدوینی بۆلۆنی)بەرەو ڕوها چوون وەك بەدەمەوە چوونی ئەو سەرکردە پیرەلاوازەی کە هیچی پێ نەدەکرا، ئینجا چوونە ناوی و فەرمانڕەوای ڕوها لەسەر ئەوە دانوستانی لەگەل ئەنجامدان کە بلدوین ببێتە میراتگری دەسەلاتی لەبەرامبەر پاراستنی شارەکە لەدەست دوژمنانی.

بەمە پاش کەمێك شۆڕشێکی جەماوەری لە ڕوها ڕوویدا و تیایدا فەرمانڕەواکەی کوژراو دەسەلات و کارو بارکەوتەدەست بلدین، ئەویش میرنشینێکی نەسرانی لاتینی تیایدا دامەزراند، ئەو دەیویست لە ئەرمینیا دەوڵەتێکی خاچپەرستی دابمەزرێنێت، لەمەشدا ئەرمەنکان پاڵپشتی بوون گەمارۆیەکی حەوت مانگی، (بووهمندی ئیتالی)یشیان کرد بەبەر پرسی، مەسیحی و ئەرمەنەکانی ئەوێ زۆر بە گەرمی پێشوازییان لەخاچپەرستان کرد.

دواتر بەرەو بەیتولمەقدیس چوون، کربو قای بەرپرسی موسڵ و دقاقی بەرپرسی دیمەشق و جەناحودەولەی بەرپرسی حیمس چوون تا لەگەل خاچیەکاندا بجەنگێن، بەلام خاچپەرستان بەسەریاندا سەرکەوتن و چوونە ناو (معره النعمان) و گەیشتنە بەیتولمەقدیس و پاش گەمارۆیەکی چل و یەك ڕۆژی چوونە ناوی و پارێزەری قودسیش لە لایەن هیری فاتیمەوە یارمەتی بۆ نەهات.

بەوە خاچپەرستان توانییان شارەکە بخەن و سەربازانیش چوون ناو مزگەوتەکە تا خۆیان پەنا بدەن، ئەمەش پاش ئەوەی هەر بەرگریەکیان پێکرا ئەنجمیاندا، خاچپەرستانیش چوونە ناو مزگەوتەکەو بەو پەڕی دڕندەییەوە

سەریان بڕین و (قبه الصخره) یان تالآنکرد و زیاتر لە حەفتا هەزار کەسیان لە خەڵکەکەی کوشت و جۆگاوی خوێن هەستاو جودفری فەرەنسی وەك پاشای بەیتولمەقدیس دانراو نازناوی (پارێزەری گۆڕی مەسیح)ی لێنرا.

فاتیمیەکان پێشڕەوی خاچپەرستانیان لە باکوورەوە قۆستەوەو ئەوان لە باشوورەوە پێشڕەوییان کردو چونە بەیتولمقەدیس و سەلجوقیەکانیان دەرکرد هەر ئەمە پێش ئەوەی خاچپەرستان بگەنە ئەوێ، چەند دانوستانێك لە نێوان ئەفزەلولجەمالی وەزیری فاتیمی و خاچپەرستاندا ئەنجامدرا لە سەر ئەوەی باکووری وڵاتی شام بۆ خاچپەرستان و باشور بۆ فاتیمیەکان بێت، دواتر خاچپەرەستان کە هەستیان بەسەرکەوتن کرد پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە.

ئەو شاڵاوە زۆربەی جەنگاوەرانی خۆی لە دەستدا، کاتێك هات سێ سەد هەزار جەنگاوەری هەبوو و تەنها بە چل هەزار جەنگاوەرەوە چوویە ناو قودسەوە، هەر چەندە ژمارەی جەنگاوەرانی خاچپەرستی ڕۆیشتوو بەرەو (ڕوها) بنریاد دابنێین ئەوا ژماریان لە چل هەزار تێناپەڕێت، بەمە ژمارەی ئەو خاچپەرستانەی لەو هەڵمەتەدا هاتن تەنها هەشتا هەزار یان لێ مایەوە.

بەوجۆرە دوو سەد و بیست هەزار سەربازیان لەدەستدا، ئەمانە لە جەنگەکاندا یان بەدەستی ناڕەزایی خەڵك لە کارەکانیان دەکوژران، خەڵکی هەرچەندە دەیانزانی سەرەنجامیان چی دەبێت بەڵام لە دژی خاچپەرستان ڕادەپەڕین چونکە هەڵوێستی خاچپەرستان هێندە خراپ و ناشیرین بوو کە هەر کەس لەوپەڕی ترس و سەرشۆڕیشدا بوایە ئەوەی پێ قبووڵ نەدەکرا.

بەدەستگرتنی خاچپەرستان بەسەر بەیتولمەقدیسدا ورەی دانیشتوانی میرنشینە خاچپەرستیەکان بەرز بویەوە، ئیدی کەشتیەکانیان بەبەشەکانی دەریای ناوەڕاستدادەگەڕان و یارمەتی و پاڵپشتیان پێشکەشی خاچپەرستان دەکرد، بەوە توانییان حەیفا و قیساریە و عەککا و تەرابلوسیش پاش گەمارۆیەکی دوو ساڵە بگرن.

هەروەك لە هەمان ساڵدا (جبللەيان گرت، دواتر (صيدا)يان گرت، موسڵمانان داوای ئاگر بەستيان كرد، كەچی خاچپەرستان بەوە ڕازی نەبون، دواتر ئامادەييان دەربڕی بەمەرجێك موسڵمانان پارەيەكی زۆر زۆريان پێبدەن، پاش وەرگرتنی پارەكەش ناپاكييان لە ڕووی موسڵماناندا نواند و گەمارۆی شاری (صور)يان دا.

ئەو كات شاری صور بەدەست عەبيديەكانەوە بوو، تغتكينی بەرپرسی ديمەشق يارمەتی بۆ ناردن، بەمە خاچپەرستان نەيانتوانی صور بگرن،لە بەشی ناوخۆيشەوە خاچپەرستان لەبەری باشوورەوە هاتن و لەوێ ئەمينو دەولەی بەرپرسی ديمەشق بەرەو ڕوويان بوويەوەو تووشی شكستی كردن و كەوتە شوێنيان تا ملاتيە و توانی بچێتە ناو ملاتيەو بيگرێت.

خاچپەرستان لە باكوورەوە هێرشيان بردە سەر ديمەشق، بەڵام شكستيان خوارد و ميری خاچپەرستی روها بەديلگيرا، بەڵام لەهەمان ساڵدا توانييان بچنە قەڵای (ئەفاميا)، دانيشتوانی مەسيحی و ئەرمەە خاچپەرستيەكان پێشوازيەكی گەرميان لێكردن و بەخێرهاتنێكی گەورەيان كردن، ئەمەش لە چوونە ناو ئەنتاكيەو بەيتولمەقديسياندا دەردەكەوێت، هەروەك لە كاتی بوونيان لەوڵاتدا پاڵپشتيان كردن و هەموو يارمەتييەكيان پێشكەش كردن و كەوتنە كوشتنی موسڵمانان و بوون بە جاسوس بە سەر موسڵمانانەوە.

لە وڵاتی شامدا چوار ميرنشينی خاچپەرستی دامەزران، ميرنشينێك لە ڕۆما، ميرنشينێك لە تەرابلوس، ميرنشينی بەيتولمەقديس، ميرنشينی ئەنتاكيە، خاچپەرستان لە شام لەو ناوچانەی لەژێر دەستياندا بوون و ميرنشينيان تيدا دامەزراندبوون لەگەل ئەوەی سەركەوتبوون كەچی ئارامی و سەقامگيرييان بەدی نەدەكرد، چونكە موسڵمانان لە دژيان ڕادەپەرين ئەگەر دەرفەتێكيان بەدی بكردايە، هەروەك فەرمانڕەوا موسڵمانەكان لە پێناو دەركردنيان لە وڵات و بەرگريكردنيان لەو بيروباوەڕو پيرۆزانەيان كە خاچپەرستان سوكايەتييان پێدەكرن هێرشيان دەبردە سەريان.

# شالاوی خاچپەرستی دووەم

لە ولاتی موسڵماناندا ژیانی خاچپەرستان خۆش نەدەبوو، بەڵکوو بەردەوام بەرەو ڕووی هەڵمەت و هێرشی موسڵمانان دەبوونەوە، کاتێک پەیمانیان لەگەڵ فاتیمیەکاندا هەڵوەشاندنەوە لە باشوورەوە هەڵمەتی فاتیمی و لە باکوریشەوە هەڵمەتی سەلجوقییان کرایە سەر، فاتیمیەکان بەسەرکردایەتی فەرمانڕەوای پێشووی بەیروت هەڵمەتێکی گەورەیان بردە سەریان و لە عەسقەلانەوە بەرەو بەیتولمەقدیس و یافا چوون، بەلام هەڵمەتەکە شکستی خوارد.

عەبیدیەکان هەڵمەتێکی دیکەیان ئامادە کرد و بەرەو (لد)و (ڕەملە) چوون، پاشای خاچپەرستی بەیتولمەقدیسیش (بلدوین)بەرەو ڕویان چوو شکستی خوارد و ڕایکرد بۆ ڕەملەو موسڵمانانیش کەوتنە شوێنی، بەوە لە ڕەملەش ڕایکرد موسڵمانان ئەویشیان گرتەوە، پاشان لە یافا گەمارۆی بلدوینیان دا، چەند فریاگوزاریەکی دەریایی پێگەیشت و ئەویش هێرشی بردە سەر موسڵمانان و سەرکەوت پاشان فاتیمیەکان دوو هەڵمەتیان خستە ڕێ یەکێکیان وشکانی و ئەوی دیکەش دەریایی، بلدوین پەنای بردە بەر میری ڕوهاو میری ئەنتاکیە، ئەوانیش چون بەهانایەوەو، بەمە بلدوین سەرکەوت.

فاتیمیەکان سوپایەکی گەورەیان ئامادە کرد و بەکەشتیگەلێکی دەریایی پاڵپشتیان کرد، داوای پاڵپشتی سەلجوقیەکانیان کرد، ئەوانیش چوون بەدەمیانەوە، بەمە یەکەم جەنگ ڕوویدا کە تیایدا فاتیمیەو سەلجوقیەکان هاریکاری یەکدی بن بەلام ئەنجامەکانی ڕوون نەبوون شالاوە فاتیمیەکان بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەستی خاچپەرستان بەردەوامبوون و هێرشیان بردە سەر یافا، بۆ ساڵی دواتر هێرشیان بردە سەر خەلیل و بۆ ساڵی دواتر گەیشتنە شورەکانی بەیتولمەقدیس و هێرشیان بردە سەر یافا و بەیتولمەقدیس لەبەرەی باکوریشەوە سەلجوقیەکان شالاویکی خاچپەرستیان لەناو برد کە لە ڕۆژئاوای ئەورووپاوە هاتبوو بۆ پاڵپشتی بوونی خاچپەرستی لە بەیتولمەقدیس.

مـیر کمـشتکین بـۆ سـەیەکی بـۆ مـیری خاچپەرسـتی ئەنتاکیـە نایـەوەو بـەدیلیگرت، بـۆ سـاڵی دواتـر تـوانی ملاتیـە لـە خاچپەرسـتان بـسێنێتەوەو سـەرکردەکەی بـەدیلبگرێت، ئـەتا بـەگی موسـل _جگـرمش)و مـیر (سـقمانی کـوڕی ئەرتف)ی‌بەرپرسی ماردین چوون تا لەگەڵ خاچپەرستانی ناو روهادا بجەنگن و توانیان سوایی خاچپەرستی تێکبشکێنن و بلدوین و جوسلین بەدیلبگرن.

میری دیمەشق (تغتکین)هێرشی بردە سەر ولاتـی جەلیل و میری موسڵیش (مەودوود) هێرشی بردە سەر خاچپەرستان و بۆ ساڵی دواتریش چوو بۆ بەرەکانی تەبەریەو شاری تەبەریە.

مەسیحیەکانی کـەرج ففجافـەکان هێرشـیان بـردە سـەر ولاتـی موسـڵمانان و سەرکەوتنیان بەسـەر موسـڵماناندا بەدەستهێنا، خاچپەرسـتانیش هێرشـیان بـردە سـەر (صـور)کـە هـی فاتیمیـەکان بـوون بلـدوینی دووەمـی مـیری خاچپەرسـتانی بەیتولمەقدیس بۆ ئازاد کردنی (بلدوین) و (جوسلین)بەرەو باکوور چوو.

بلکـی ئـەرتفی بـەرەو رووی چـوو سـوپاکەی تێکـشکاندو ئـەویش بـەدیلگیراو برایـە لای سـەرکردە دیلکراوەکـانی دی، هـەروەك خاچپەرسـتان گـەمارۆی دیمەشقیان دا، بەڵام نەیانتوانی بیگرن، ژمارەیـەکی زۆری تورکمانـەکانی جەزیرە هاتن و بەرەو تەرابلوس چوون و لەوێ لەگەڵ خاچپەرستاندا جەنگان.

عیمـادەدینی زەنگیش هەڵمەتـەکانی خـۆی دەسـتپێکرد بـۆ سـەر پێگـەکانی خاچپەرسـتان لـە ڕۆژهـەڵاتی ڕووبـاری (العاصـی)تـا بەرەبـەرە ناوچـەکان ئـازاد بکاتەوە، بەوە دەستیگرت بەسەر (ئەساریب، زردنا، تەل ئەغدان مەعەرە تونوعمان، کفرتاب) دا و هێرشیشی بردە سەر قنسرین و شیزر و حیمس.

جێگرەکـەی زەنگیش هێرشـی بـردە سـەر خاچپەرسـتان و گەیـشتە (لاژقیـە)، موسڵمانانیش هێرشیان بردە سەر میرنشینی تـەڕابلوس و میری ئەویان کوشت و ژمارەیـەکی زۆری شوێنکەوتەکانیـشیان بـەدیلگرت عیمـادەدینی زەنگـی تـوانی نەخشەکەی(دەناکوین)ی ئیمپراتـۆری بێزەنتیـەکان بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر حەلەبدا

شکست پێبهێنێت، جیاوازی زەنگی لەسەرکردە موسڵمانەکانی دیکە ئەوە بوو کە جیهادی ڕێی خوای لە پێش هەموو شتێکدا دانا و یەکدەنگی و یەکڕیزی موسڵمانانی بە پێویست دەزانی پێش ئەوەی بچنە نێو هەر جەنگیکی دژ بە خاچپەرستان.

شاڵاوی دووەمی خاچپەرستی لەبەر ئەوە بوو کە عیمادەدینی زەنگی بەرەو فەتحکردنی میرنشینی ڕوها دەچوو، کاتێك ئەم هەڵمەتە کەوتە ڕێ عیمادەدین مرد و هەڵمەتەکەیش لە ڕێگەی دەریاوە بەرەو وڵاتی شام دەچوو، ئەمەش لەبەر ئەو ناکۆکیەی لە نێوان ئیمپراتۆری قوستەنتینیەو خاچپەرستاندا هەبوو.

سەرکردەی شاڵاوەکەش (کونرادی سێیەم)ی پاشای ئەلمانیاو (لویسی حەوتەم)ی پاشای فەرەنسا بوو، هەڵمەتەکە بەرەو دیمەشق چوو، ئەمیری دیمەشقیش (موجیرەدین)لەوە دەترسا بنەماڵەی زەنگی دەستگرن بەسەر شارەکەیداو پشت ببەستی بە پالپشتنی خاچپەرستی، لەکاتێکدا زەنگیەکان بەرەو دیمەشق و شاڵاوی خاچپەرستیش بەرەو دیمەشق دەچوو.

میری ئەوێ پەنای بردە بەر نورەدینی زەنگی دژبە خاچپەرستا، ئەمە ڕێی بۆ نورەدین خۆشکرد تا دیمەشق بگرێت و دوای ئەوە پاشای ئەڵمانیا ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، هەر وەك پاش ماوەیەکی کەم پاشای فەرەنسایش وایکرد کاتێك عیمادەدینی زەنگی کوژرا، نورەدین مەحمودی کوری ئاڵای جیهادی هەڵگرت و گەمارۆی خاچپەرستانی ڕوهای دا چونکە دوای مەرگی عیمادەدین توانیویان ئەوێ بگرن، لەوێدا شکستێکی خراپی تووشی خاچپەرستان کرد و بلدوین کوژراو جوسلین بریندار بوو و ڕوهایشی لێسەندنەوە، نورەدین درێژەی بەجیهادی خۆی داو توانی ژمارەیەك قەڵا بگرێت وەك (بسرقون ئەرتاح، ئەساریب، کفرلاتا)و چەندێکی دیی.

بەوجۆرە هێرشبردنە سەر خاچپەرستان لە باکوورو باشورەوە بەردەوامبوو، پاشان بەرەو میرنشینی تەرابلوس لە ڕۆژئاوا چوو، ئەو هەڵمەتانە جێپێی خاچیەکانی لەق دەکرد و بەردەوام ڕاڕای دەکردن.

پاشان دەوڵەتەکەی عیمادەدین و دواتریش نوردەینی کوڕی نەخشەیان دانا بوو تا هەنگاو بەهەنگاو بەوردەکاریەوە پێشڕەوی بکەن نورەدین مەحموود توانی بچێتە ناو قەڵای ئەفامیاو لەوێوە بەرەو ئەنتاکیە چوو و لە ڕێگەیدا گەمارۆی شاری (حارم)ی داو لەگەل خەڵکەکە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی نیوەی بەرهەمیان بدەن بە نورەدین.

بەڵام کاتێك چوو لەگەڵ جوسلین میری روهادا بجەنگێت شکستی خوارد، دواتر توانی جوسلین بەدیلبگرێت و نۆ ساڵ لای خۆی بیهێڵێتەوەو (عەزاز)و (عینتاب) و (مەرعەش)یش بگرێت، بە کورتی میرنشینی خاچپەرستی روهات و ئەنتاکیەش بەشێکی زۆریان کەوتە دەست موسڵمانان بلدوینی دووەمی پاشای خاچپەرستی بەیتولمەقدیس لەناو چوو.

دوای خۆی عەموری یەکەمی برای دەسەڵاتی گرتە دەست و چاوی بریە میسر، بەڵام نورەدین ناچاری کرد تا واز بهێنێت بەوە هێرشی بردە سەر حارم و میرنشینی تەرابلوس و ئەسەدەدین شیرۆك و صەلاحەدینی ئەیوبی برازای ئەسەدەدینی نارد و شێرکۆ توانی خواستی خاچپەرستان بۆ میر لەناو ببات و بارەکە بۆ (شاور)ی وەزیر چەسپاو بێت شێرکۆ لە ژێر سەرکردایەتی خۆی و لەسایەی لاوازی دەسەڵاتی خەلیفەی عەبباسیدا میسری بەجێهشت.

دواتر شاور دایە خراپەکاری و خەلیفە عازدی فاتیمیش هانای بردە لای نورەدین، ئەویش بۆ جاری دووەم شێرکۆ و سەڵاحەدینی بۆ نارد و لە نزیك (مونیا)لەگەڵ خاچپەرستاندا پێکیانداداو شێرکۆ بەسەریاندا سەرکەوت، پاشان سەڵاحەدین لە ئەسکەندەریە گەمارۆی خاچپەرستانی داو بۆ جاری دووەم ڕێککەوتن هەر دوولا میسر بۆ شاور بەجێبهێڵن.

بۆ جاری سێیەم عموری ڕویکردە میسر و هێرشی بردە سەر (بلبیس) وداگیری کرد، پاشان بەرەو قاهیرە چوو، نورەدین بەسەر کردایەتی شێرۆکو سەلاحەدینی ئەیوبی سوپایەکی بەرەو میسر نارد عموری ڕایکردو شێرکۆ چوویە ناو میسر و بوو بە وەزیری میسر.

دواتر پاش ماوەیەك شێرکۆ مرد و صەلاحەدین شوێنی گرتەوەو لە چەندین جەنگدا چەند سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر خاچپەرستاندا بەدەستهێنا، لە (مەرج عیون)سەرکەوت، کەشتیگەلی موسڵمانان هێرشی بردە سەر شاری عەکنکاو بالدوینی چوارەم ناچار بوو لەگەڵ موسلماناندا ڕێککەوتن ببەستێت.

هەروەك سەلاحەدین هێرشی بردە سەر ئەنتر نوس، ئەمە ڕیمۆندی سێیەمی ترساند و ناچار بوو لەگەڵ صەلاحەدیندا ڕێکەوتنێك ببەستێت، پاش ئەو ڕێککەوتنە سەلاحەدین کەوتە بەهێز کردنی باری ناوخۆیی خۆی و بەهێز کردنی سوپاکانی، بەلام ئەرنانی میری خاچپەرستی قەلای کرك دەرفەتی سەرقالبونی سەلاحەدینی قۆستەوەو بەرەو تیما چوو، تا بگاتە (مەدینەی مونەوەرە)لە ڕێگەیدا دەستیگرت بەسەر کاروانی حاجیانی موسڵماناندا و ماڵوسامانی بردن و پیاوانی گرتن و گەیشتنە کەناراوی دەریای سوور.

ئەمە سەلاحەدینی تورە کرد و ئاگربەستەکەی بیری خاچپەرستان خستەوەو داوای لە پاشای خاچپەرستی قودس کرد فرمان بە ئەرنات بکات واز لە دەستدرێژی بهێنێت، بەلام ئەرنات گوێی نەگرت و بالدوینی چوارەمیش شتەکەی یەکلا نەکردەوە، ئەمەو وای لە سەلاحەدین کرد لە میسرەوە هێرشێك بباتە سەر قەلای (کەرك)لە ئوردون و (فەرەخشاهی برازای)کە بەرپرسی دیمەشق بوو هێرش بباتە سەر تەبەریەو عەککا و دەستبگرێت بەسەر (شەفیق) دا وهەردوو سوپای موسڵمانان لەجەنگێکی قورسدا لەگەڵ خاچپەرستاندا پێکیانداو، و تیایدا سەرکەوتن پشکی موسلمانان بوو.

سەلاحەدین گەیشتە دیمەشق و دواتر لەوێ دەرچوو، برازاکەی خۆیشی نارد تا هێرش بباتە سەر (بیسان) و دواتر خۆیشی چو و پێکەوە شکستیکی توندیان دوچاری خاچپەرستان کرد.

سەلاحەدین پێی وابوو گرنگترین کارێك پێویستە بیکات ئەوەیە میرنشینە خاچپەرستیەکان لە یەکدی جیا بکاتەوە، سەربازی خۆی لە دیمەشق و میسر و

حەلەب و جەزیرە داکۆکردەوە و بەرەو (بیسان)چوو دەستیبەسەر دا گرت و گەمارۆی (کەرك) و(شەوبەك) ی داو لە نزیك صفوریە بەسەر خاچیەکاندا سەرکەوت، خاچپەرستان لەوێ کۆبونەوە و ئەویش چوو بۆ تەبەریەو گرتی، پاشان لە نزیك (حگین) سەنگەری گرت، مەسیحیەکان بە ماندوێتی و تینوێتی گەیشتە لایان، موسڵمانانیش بە کوشتن و گرتنیان لێیاندان، یەکێك لەوانە گیرا پاشاو براکەی و ئەرنات میری (جبیل)بوون.

سەلاحەدین میری کەرکی بە دەستی خۆی کوشت بەهۆی ئەو تاوانانەی پێشتر ئەنجامی دا بوو، پاشان سوپا ئیسلامیەکان بەرەو (ناسرە)و (قیساریە) و(حەیفا) و (صفوریە)و (یافا) و (رەملە) و (غەززە) و (بەیت جبرین پێشڕەوییانکرد و پێشنیاریان بۆ خاچپەرستان کرد تا قودس بدەن بە دەستەوەو چوونە ناو قودس.

دواتر دەستیانگرت بەسەر عەسقەلان و عەککا داو (سەرقەند)و (صیدا) و (بەیروت) و (جیل) یش خۆیان دابەدەستەوە دوای ئەو سەرکەوتنانەی سەلاحەدین بەدەستیهێنان، خاچپەرستان لە میرنشینی بەیتولمقەدیسدا تەنها (صور)یان بۆ مایەوە تا تیایدا کۆ ببنەوە، لە میرنشینی تەرابلوسیشدا تەنها خودی تەرابلوس و قەڵای کوردان و نەنتەرتوسیان بۆ مایەوە، لە ئەنتاکیەیش تەنها شاری ئەنتاکیەو سویدیەو قەڵای مەرقەبیان بۆ مایەوە.

فەتحکردنی قودس لەلایەن سەلاحەدینەوەو ئەو سەرکەوتنە گەورانەی بەدەستهێنان کاریگەریەکی گەورەیان لە ئەوروپادا هەبوون لەوێ هاواری خاچپەرستان بەرز دەبوویەوەو مەسیحیەکان بانگەوازیان دەکرد تا بۆ پاڵپشتی براکانیان و هێرشبردنە سەر موسڵمانان بەرەو بەیتولمەقدیس بچن، پاپا گریگۆری هەشتەم چەند نوسراوێکی نارد بۆ پاشایانی فەرەنساو ئەڵمانیاو ئینگلتەراو هانی دەدان تا لەگەڵ موسڵماناندا بجەنگن، ئەوانیش چوون بەدەم داواکەوەو سوپای خۆیان کۆکردەوەو بەرەو وڵاتی موسڵمانان بەڕێکەوتن، ئەوەش شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی بوو.

# شالاۆوی سێیەمی خاچپەرستی

شالاۆوی سێیەمی خاچپەرستی بەسەرکردایەتی پاشای ئینگلتەرا (ریشارد دڵی شێر) و پاشای فەرەنسا (فلیپ ئۆگست) و ئیمپراتۆری ئەڵمانیا (فریدریك بربروسە) بوو، پاشایانی ئینگلتەرا و فەرەنسا لە رێگەی دەریاوە بەرەو دورگەی صقلیەو چوون وەرزی زستانیان بردە سەر.

ئیمپراتۆری ئەڵمانیایش لە رێگەی وشکانیەوە بە قوستەنتینیە دا تێپەڕی، هەرچەندە لەگەل ئیسعافی دووەمی ئیمپراتۆری بێزەنتیدا ناکۆکی هەبوو، لەوێوە بەخاکی سەلجوقیەکانی رۆم لەقونیەدا تێپەری و لەلایەن ئەرمەنەکانەوە لە (کیلیکیا)پێشوازی لێکرا، بەلاّم کاتێك لە رووباری سەیحان لە کیلیکا دەپەڕیەوە خنکا، بەوە سەربازەکانی بلاّوەیان لێکردو هەندێکیان تووشی نەخۆشی بوون.

پاشان لەدوای چاکبوونەوەی لە نەخۆشی کوڕەکەی درێژەی بەرێگەکەداو بەرەو عەککا چوو گەمارۆی لەسەر دانا، پاشان پاشایانی ئینگلتەراو فەرەنسا بەسەربازەکانیانەوە گەیشتنە عەککان شاری عەککا بەرگری کردو سەلاّحەدینی ئەیوبی لە چەند جەنگێکدا لەگەڵ خاچپەرستاندا پێکیدادا.

بەلاّم بە هۆی ئەو نەخۆشیانەی لەناوچەکەدا بلاّو ببونەوە ناچار بوو ناوچەکە بەجێبهیلێت، خاچپەرستان فشاریان لەسەر عەککا توند کردەوە، بۆیە ناچار پاش گەمارۆیەکی دووساڵە خۆی بەدەستەوە دا، ریتشارد لە نێو خاچپەرستاندا دەڵڕەقی خراپەکاری خۆی نواند وهەموو دیلەکانی عەککای کوشت و پاشای فەرەنسایش گەرایەوە بۆ ولاّتی خۆی، ریشارد چاوی بریە قودس و دەستیگرت بەسەر حەیفا و ئەرسوف دا دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم لە جەنگێکی قورسدا بەسەر سەلاّحەدیندا سەرکەوت، پاشان بەرەو (لد)و (رەملە)چوو، سەلاّحەدین لە روویدا وەستاو بەرگری لە قودس کرد تا ئەوەی ریشارد بێهیوا بوو لە گەیشتن بە ئامانجەکەی، نەخۆشی لە نێو خاچپەرستاندا بلاّو بوویەوە و کاروباری ناو ئینگلتەرایش شێوا، بۆیە ریشارد ناچار بوو لەگەل سەلاّحەدین ئاگر بەستێك بکات بەناوی رێککەوتنی رەملە، بەمە شالاّوی سێیەمی خاچپەرستی تێکشکاو بە ئامانجی خۆی نەگەیشت.

*********************

# شاڵاوی چوارەمی خاچپەرستی

ئەم شاڵاوە بە دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆ مردنی سەلاحەدینی ئەییوبی لەمانگی سەفەری ساڵی ٥٨٩کۆچی دادەنرێت، جا هەر لە کاتی مردنیەوە پاپا ئەنوسی سێیەم بانگەوازی بۆ جەنگێکی خاچپەرستی کرد، لە چوارچێوەی نەخشەیەکدا کە بۆ کڵێسای دانابوو و لەسەرو هەموویەوە پرۆژەی سڕینەوەی شوێنەوارەکانی جەنگەکانی سەلاحەدین بوو لە ڕۆژهەلات، لەگەڵ داماڵینی بەیتولمەقدیس لە دەست موسڵمانان.

بۆیە بانگەوازی بۆ شاڵاوی چوارەم کرد و تیایدا ژمارەیەك لەسەرکردەکان چوون بەدەم داواکەیەوەو چەند بارۆنیکی فەرەنسی و کەسانێکی دیکەش سەرکردایەتییان گرتە دەست، پاش ئەوەی سەرکردەکان ڕاگۆڕینەوەیان لەسەر هەڵمەتەکە کرد، پێیان باشبوو هەڵمەتەکە سەرەتا بەرەو میسر بڕوات، دواتر بەرەو بەیتولمەقدیس بچن.

ئامادە سازی بەهاریکاری لەگەل بوندوقیەکان دەستپێکرد، بوندوقیەکان کەشتیان بۆ ناردن، خاچپەرستان لە بوندوقیە کۆ بوونەوە، بەلاّم بوندوقیەکان بەرامبەر بەو هاریکاریە مەرجێکیان لەسەر خاچپەرستان دانا بەوەی هێرش بکەنە سەر شاری (زارا) و لە دەست پاشای هەنگاریا بسێننەوە، ئەوانیش بەبێ ڕەزامەندی پاپا ڕازی بوون، هەرچەندە پاپا توڕە بوو و بڕیاری بێبەریکردنی بەرامبەر بە هەمو شاڵاوە کە دەربڕی، بەلاّم دواتر ئەو بڕیارەی تەنها لەسەر بوندوقیەکان هێشتەوە.

کاتێك خاچپەرستان خۆیان ئامادە دەکرد تا بەرەو میسر بچن، لەقوستەنتینیە شۆڕشێك تەنگی بە ئیمپراتۆر ئیسحاقی دووەم هەڵچنی و ئەلکسیۆسی کوڕی و سەرکردەی شۆڕشەکە پاش سەرنەکەوتنی شۆڕشەکەی ڕایکرد بۆ ڕۆژئاوا و داوای لە پاپا و خاچپەرستان کرد یارمەتی بدەن تا لەبەرامبەر ئەوەدا دان بە ملکەچی کڵێسا ڕۆژهەلاّتی بۆ پاپا بنێت و یارمەتی خاچپەرستانیش بدات لەو هەڵمەتەیاندا

کە دەیبەنە سەر میسر، خواستی پاپا و بەرژەوەندی بوندووقیەکان و ڕەزامەندی خاچپەرستان دژ بە دەوڵەتی بیزەنتی یەکیگرت و کۆمەڵی خاچپەرستان بەرەو قوستەنتینیە چوون و دەستیانگرت بەسەریدا و کەوتنە وێرانکردنی و دژایەتی خەڵکەکەی تائەوەی بیزەنتیەکان ئاواتەخواز بوون قوستەنیتنیە بکەوتایەتە دەست موسڵمانان.

خاچپەرستان چەند دکڵێسایەك و ئەو مزگەوتە کۆنەیشیان سوتاند کە لەسەردەمی ئومەویەکاندا بنیاد نرابوو، جگە لەوەش کەوتنە تالآنکردنی شارەکەو کڵێسای کاسۆلیکی سەرکەوت بەسەر کڵێسای ئەرثەدۆکسیدا.

لە ئەنجامی ئەو هەڵمەتانەدا ورەی جەنگاوەران لە جەنگە خاچپەرستیەکانی دیکەدا نەما چونکە خەڵکی دڵنیابوون ئەو هەڵمەتانە تالآنی و دړندانەن و جەنگی ئایینی نین، هەروەك ئەو شالآوە سەربازیانە ناکۆکی نێوان مەسیحیەکانی ڕۆژهەلآت و ڕۆژ ئاوایان قوولّ کردەوە و ڕێگەی وشکانی بەرەو شام هێندەی تر توند ترو ترسناکتر بوویەوە، هەروەك زۆرێك لە سوارە خاچیەکانی شام بریاریاندا شام و سەختیەکانی بەجێبهێڵن و بەرەو قوبرس یان بەلقان بچن تا لەویّ ژیانێکی سەقامگیر وەر بگرن، بەگشتی شالآوی چوارەمی خاچپەرستی پێگەی خاچپەرستانی لە ڕۆژهەلآتی ئیسلامیدا لاواز و شلۆق کرد.

بۆیە مێژوونوسێکی جەنگە خاچپەرستیەکان دەڵێت (شالآوی چوارەمی خاچپەرستی ئامارژەیەك بوو بۆ شکستی هەموو بزوتنەوەی خاچپەرستی).

*******************

# شالاوی پێنجەمی خاچپەرستی

خاچپەرستانی قەلای کوردان هەوڵیاندا حیمس بگرن، بۆیە ئەسەدەدین شێرکۆی دووەمی بەرپرسی ئەوی پەنای بردە لای مەلیك زاهیری بەرپرسی حەلەب و پێکەوە بەرەو ڕووی خاچپەرستان و متمانەوە.

جەردە دەریاییەکانی خاچپەرستان لە قوبرس هێرشیان بردە سەر چەند کەشتیەکی میسری و جی دیلی تێدا بوو گرتیان، مەلیك عادلی ئەیوبییش بەرەو عەککا چوو و خاچپەرستانی ناچار کرد دیلە موسڵمانەکان بگێڕنەوە.

پاشان چوو بۆ جیمس تا پاڵپشتی ئەویٚ بکات، هەڵمەتی بردە سەر قەلای کوردان و تەرابلوس، بەرپرسی خاچپەرستی تەرابلوس بوهمەندی چوارەم ناچار بوو لەگەڵ مەلیك عادلدا ڕێککەوتنێك ببەستێت، هەروەك مەلیك حەننا برین لەگەڵ مەلیکعەدلدا ڕێککەوتنێکی شەش ساڵەی بەست، بەلام لەهەمان کاتدا پەیوەندی بەپاپاوە کرد و داوای لێکرد پاڵپشتی بکات و هەوڵ بدات شالاوێکی نوێی خاچپەرستی بنێریت تا لەگەل کۆتایی هاتن بەرێککەوتنەکە بگەنە شام.

پاپا ئەنوسنتی سێیەم بانگەوازی کرد بۆ ئامادە کردنی سوپایەکی خاچپەرستی نویٚ کە ڕاستەوخۆ بەرەو ولاتی شام بچن، شالاوەکە بەسەرکردایەتی دۆخی نەمسا(لیوبۆلد) و پاشای هەنگاریا ئەندریای دووەم بەڕێکەوت و دواتر (بهمایۆ)ی پاشای قوبرس پەیوەستیان بوو.

ئەم شالاوی پێنجەمی خاچپەرستیە گەیشتە ولاتی شام و لە عەککا کۆبوونەوەو ڕۆیشتن تا دەستیانگرت بەسەر (بیسان) لەغورداو گەیشتنە شاری (نوی)پاشای هەنگاریا لەگەڵ دۆخی نەمسا نەگونجا، بۆیە بڕیاریدا بەرەو ولاتی خۆی بگەڕێتەوە، حەننا برینیش هێرشی بردە سەر دەمیان و خاچیەکانیش بەسەرکردایەتی نوێنەری پاپا کاردینال بلاگیۆس و خەڵکێکی قوبرس چوون بۆ یارمەتیدانی.

مەلیك عادل مردو کامیلی کوڕی شوێنی گرتەوە کە لەلایەن موعەزەمی برایەوە کە بەرپرسی دیمەشق بو یارمەتی و پاڵپشتی کرا، بەلاّم لە هەمان کاتدا هێرشی مەغۆلی دەستپێکرد،بۆیە کامیل داوای ڕێککەوتنی کرد.

بەڵام خاچپەرستان کە دەستیانگرتبوو بەسەر دمیاطدا ڕازی نەبوون ودەرفەتیان بەدیکرد و بڕیاریاندا هێرش ببەنە سەر قاهیرە، بەلاّم بەهۆی ئەو لێشاوانەی لەلایەن چەند دەستەیەکی موسڵمانانەوە بەرەو ڕوویان دەبوونەوەو شکستیان خوارد، بۆیە داوای ڕێکەوتنیان کرد و چەند یارمەتیەکیاندا بەدەستەوەو سەرشۆڕبوون تا لە میاگیش بکشێنەوە، بەو جۆرە شالاّوی پێنجەمی خاچپەرستی بەبێ بەدیهێنانی هیچ شتێك شکستی خوارد.

*********************

# شالاوی شەشەمی خاچپەرستی

پاش شکستی شالاوی پێنجەمی خاچپەرستی بارودۆخی خاچپەرستان لە شام شێواو ناکۆکییەك کەوتنە نێوانیانەوە کە جێی لەق کردن و وایکرد هەندێکیان بەرەو ئەوروپاو پاپا بچنەوە داوای شالاوێکی خاچپەرستی بکەن کە بونیان لەشامدا بەهێز بکات، ململانێیەکی توند لە نێوان پاپاو ئیمپراتۆریەتدا لە ڕۆژئاوای ئەوروپا سەریهەڵدا، ئەو ململانێیەش نزیکەی دووسەدەی خایاند، هۆکارەکەیشی ڕکەبەری نێوان دوو دەسەڵاتی ئایینی و عەلمانی ناو ئەوروپا بوو، لە پێناو ململانێی نێوان کڵێساو دەسەڵاتی عەلمانیدا پاش شکستی شالاوی پێنجەمی خاچپەرستی بۆ سەر شام نەچوون بەدەم داواکانی خاچپەرستانەوە.

ئەگەر چەند ڕووداوێکی دیکە بۆ ئەو ڕووداوانە زیاد بکەین کە بۆ موسڵمانان ڕوویدا بە تایبەت کوڕانی عادل (کامیل و موعەززەم و ئەشرەف) ی برازایانی سەلاحەدین و چی ناکۆکیەکی توند لە نێوانیاندا ڕوویدا کە خەریکبوو بگاتە جەنگ و کوشتار، بەڵکوو چوونە چەند جەنگێکی تاکەکەسی و لەوەش زیاترەوە سەرەرای مەترسیەکی ناوخۆیی کە هەڕەشەی لە دەوڵەتی ئەیوبی دەکرد، ئەویش ئەو خوارزمیانە بوون کە جەنگیزخان بلاوەی پێکردبوون.

ئەوانیش لە ئەسفەهان کۆبوونەوەو کەوتنە هەڕەشەکردن لە شام و عیراق، هەموو ئەمانە وایان لە مەلیك کامیل کرد تا پەنا بباتە بەر ئیمپراتۆر فردریکی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا تا بەسەر سەختیە ناوخۆییەکانی لەگەل براکانی و سەختیە دەرەکیەکانی لەگەڵ خوارزمیەکاندا سەرکەوێت بەرامبەر بەوەی بەیتولمەقدیسی بداتە دەست، لەگەڵ هەموو ئەو ناوچانەی کە سەلاحەدین لەسەرکەوتنی حگین دا بەدەستیهێنا بوون.

فردریك بەوە ڕازیبوو و کەوتە ئامادە سازی و سوپایەکی ئامادە کرد بۆ یارمەتیدانی مەلیك کامیل دژ بە مەترسی دەرەکی و ناوخۆیش، لە هەمان کاتدا پاپا هنری‌یۆسی سێیەم داوای لە ئیمپراتۆر فردریکی دووەم دەکرد تا هەلمەتێکی

خاچپەرستی بۆسەر ڕۆژهەلأت ئامادە بکات و شانوشکۆی خاچپەرستان و کلێسا لەوێ بگێرێتەوە، کاتێك پاپا هنریۆسی سێیەم مرد گریگۆری نۆیەم هاتە شوێنی و ئەویش لە پیناو ئەوەی ئیمپراتۆر ئەو هەڵمەتە ئەنجام بدات داوای زۆری لێکرد.

بۆیە ئمپراتۆر ئەو هەڵمەتە ئەنجام بدات داوای زۆری لێکرد، بۆیە ئیمپراتۆر لە برندیزی باشووری ئیتالیاوە تاوی دایە ناو دەریاو بەرەو شام چوو، بەلأم بەبانگەشەی نەخۆشی گەڕایەوە، پاپاش نارەزایی دەربڕی و بەڕاکردنی زانی و لە دژی بڕیاری بێبەریکردنی دەرکرد، بۆیە ئمپراتۆر لە تووڕەیی پاپا ترساو بەرەو عەککا چوو، بەشێکی گەورەی سوپاکەی پێشتر چوو بوون بۆ شام.

فردریك لەبەر چەندین هۆکار حەزی نەدەکرد لەگەڵ موسلمانانداا ڕێکەیتە شەڕەوە، لەوانە ململانێی لەگەڵ پاپاو ڕقی لە کلێسا، یان پێدەچیت خۆشەویستی بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەبووبێت لەبەر ئەوەی لە سقلیەی موسڵمانانیشدا گەورە ببوو.

هەڵمەتەکەی فردریك ئەو هەڵمەتە خاچپەرستیە بوو کە کلێسا نەفرینی لێکردبوو، دوا جار چیاوانی ئیمپڕاتۆر گەیشتنە عەککا، ئیمپڕاتۆریش لە قوبرس دواکەوت، بەوە هیواکانی کلێساو خاچپەرستان و مەلیك عادل لە هەڵمەتەکەی فردریکدا لەناو چون، کاتێك فردریك گەیشتە عەککا بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر قودسدا لەبەرامبەر پاراستنی مەلیك کامیل لەدەست مەلیك موعزەمی برای، دەبینێت موعزەم مردووەو کامیلیش دڵنیا بووە.

بەوە باری فردریك نائارام بوو، مەلیك کامیلیش هەروا بوو، چونکە کامیل نەیدەویست لەو بارە پشێویەی ناوخۆییەیدا لەگەڵ خاچپەرستاندا بجەنگێت، فردریکیش خۆی بۆ جەنگی موسڵمانان ئامادە نەکردبوو بەڵکو هاتبوو تا لەبەرامبەر پاراستنی، مەلیك کاملدا بەبێ جەنگ بەیتولمەقدیس وەربگرێت، ئەگەریش بیری لە جەنگ بکردایەتەوە خاچپەرستان بە هیچ شێوەیەك نەدەچوون بە هانایەوە لەکاتێکدا کلێسا بێبەری کردبوو.

بۆیە ناچار بوو دانوستان بکات و سۆز بنوێنێت تا قودس وەربگرێت تا لە هەموو ئەورووپادا پێگەی بەرز بێتەوە، لەنامەکەیدا بۆ سوڵتانی نووسیبوو (من مەملوك و کۆیلەی تۆم، چی بڵێیت لە فرمانت دەرناچم، تۆ دەزانیت من گەورەی پاشایانی دەریام، پاپا و پاشایان ئاگادارن بە گرنگی و دیاری من، ئەگەر تۆ پاشگەز بیتەوە ئەوا لە نێویاندا شەرمەزارم دەکەیت، وا قودس لەباری بیروباوەڕی خۆیاندان و موسڵمانانیش وێرانیان کردووەو خێری تیا نەماوە، ئەگەر سوڵتان پێی باش بێت بەبەخشینی ئەو شەرمەزار گەیە بەخششم بەسەردا ببەخشێت ئەوە لە چاکەی خۆیەتی و سەری منیش لە نێو پاشایانی دەریادا بەرز دەکاتەوە).

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە کامیل ڕازیبوو بە داواکەی فردریك و ڕێککەوتنی یافای لەگەڵ بەست، تیایدا ئاگربەستی نێوان هەر دوو لای لەخۆ دەگرت بۆ ماوەی دەساڵ، فردریك قودس ببات، بەڵام شورەکانی قودس نوێ نەکاتەوە، گوندەکانی قودس بۆ موسڵمانان بن و فەرەنجەکان تیایدا هیچ دەسەڵاتێکیان نەبیت، هەموو حەرەم بەدەستی موسڵمانان بێت و فەرەنجیەکان تەنها سەردانیان بۆ هەبێت.

فردریك بە فرمێسکی چاوەکانی و کروزانەوەی ئەو شتەی بەدیهێنا کە پاشایانی فەرەنجی و سەرکردە خاچپەرستیەکان هەر لە ڕزگارکردنی قودس لەلایەن سەلاحەدینەوە پێیان نەدەکرا، ئەوە خراپترین کاریگەری لەسەر دەروونی موسڵمانان هەبوو تا ئەوەی لە قودسدا ماتەمینیان گێڕا، فردریك چوو بۆ بەیتولمەقدیس و تاجی لەسەری خۆی نا، چونکە کڵێسا ئامادە نەبوو تاجی بنێتە سەر.

کاتێك فردریك سەردانی (مسجد الاقصی)ی کرد زانی سوڵتان فرمانی کردووە لەماوەی مانەوەی ئیمپڕاتۆر لەشاردا بانگ نەدرێت، فردریك بەوە بێزار بوو بە قازی شەمسەدینی وت: (لەو کارەتدا هەڵە بویت، سوێند بە خوا گەورە ترین مەبەستم ئەوە بووە دەنگی بانگی موسڵمانان و پەرستشی شەویان ببیستم).

پاشا فردریك قەشەیەکی دیت کە بە ئینجیلێکەوە دەیویست بچێتە (مسجد الاقصی)وە ئەویش لۆمەی کردو دەریکرد و هەڕەشەی لەهەر کەسێ کرد کە بەبێ

مۆڵەت بچێتە ناو مزگەوتی ئەقساوە و وتی (ئێمە تەنها مەملوکی سوڵتان مەلیک کامیلین، ئەو چاکەی لە ڕووی ئێمەو ئێوەشدا کردووە کە کڵێسا وای پێبەخشیوین، بۆیە کەستان سنور نەبەزێنن).

پاشان فردریک پشوو بۆ یافا و لەوێوە بۆ عەککاو بەیتولمەقدیسی بەجێهێشت، عەککا لە نێو ململانێی خاچپەرستانی ئەوێدا دژەیا، فردریک هەوڵیدا لەبەردەم پیاوانی ئاینیدا بیانوو بۆ کارەکانی خۆی بهێنێتەوە، بەڵام ڕێی پێ نەدران پاپا فرمانی بە سوپاکانی کرد تا هێرش ببەنە سەر زەوی و ماڵو موڵکی فردریک لە ئیتالیا.

لەوەشدا حەننا برین یاریدەدەری بوون فردریکیش پێی باشبوو عەککا بەجێبهێڵێت و بەرەو ناوچەی خۆی بگەڕێتەوە، بۆیە گەرایەوە بۆ ئیتالیا، بەو جۆرە شالاوی شەشەمی خاچپەرستی کۆتایی پێهات و بەیتولمەقدیسی بەدیاری لە مەلیک کامیل وەرگرت، بەمە کامیل هەوڵەکانی سەلاحەدینی مامی بەفیرۆدا.

*********************

# شالاوی حەوتەمی خاچپەرستی

لەوکاتەوەی مەلیك کامیل ڕێککەوتنی یافای لەگەڵ فردریکی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیادا بەست کاروباری بنەماڵەی ئەیوبی لە بارگرژیدا بوو، خاچپەرستانیش هەستیان بەوە کردبوو، بەتایبەت ئیسپارتە، بۆیە شالاویان بردە سەر ناوچەی (بەعرین)و وڵاتیان تالان کردو کەوتنە گرتن و کوشتن و بەکۆیلەگرتن، مەلیك موزەفەری بەرپرسی حەما ئامادە نەبوو لەگەڵیاندا بجەنگێن.

بۆیە ڕازیبوو بڕێك پارەیان پێبدات، کاتێك نەیتوانی بەڵێنەکەی بباتە سەر ئیسبتاری وداویەکان لە هێزێکی گەورەدا کۆبوونەوەو هێرشیان بردە سەر مەلیك موزەفەر و لەجەنگێك لە (ئەفیون)لە نێوان (بەعرین) و (حەمان) دا پێکیاندادا و مەلیك موزەفەر شکستێکی توندی تووشی خاچپەرستان کردو دیلەکانی لەگەڵ خۆیدا برد.

ئیسبتاریەکان دەیانویست ئەوماڵوسامانە بەدەستبهێنن کە بەسەر موزەفەر دا سەپاندبویان بۆیە پەنایان بردە بەر هەموو هێزە فرەنجەکانی وەك داویەو میرنشینی ئەنتاکیەو تەرابلوس و شانشینی بەیتولمەقدیس و خاچپەرستانی قوبرس، پاشان بەشەو دایان بەسەر قەڵای (بەعرین) داو شارەکە یان داگیر کرد.

بەڵام نەیانتوانی قەڵاکەی بگرن، دووبارە بەبێ ئەوەی لەگەڵ موسڵماناندا بکەونە جەنگەوە کەوتنە تاڵان و بڕیەکی زۆر، لەو کاتەدا ئەییوبییەکان سەرقاڵی خۆیەکلا کردنەوە بوون لەگەل عەلائەدین کیقبادی سوڵتانی سەلجوقیەکانی ڕۆمدا کە دەستیگرتبوو بەسەر(خلاط)دان لەو ماوەیەدا داویەکان کەوتنە گرتنی قەلای (بغراس)، ئەیوبییەکانیش دەستیانگرتبوو بەسەر قەلای (ردبساك)دا، نێوانی ئەو دووقەلایەش ماوەیەکی کەم بوو.

ئەمە وایکرد پێکدادانەکانی نیوان هەردوو لا توندببنەوە و هەر یەکیان حەز بکات دەستبگرێت بەسەر قەلاکەی ئەوی دیکەدان داویەکان هێرشیان بردە سەر دربساکن بەڵام موسڵمانان لە ڕوویاندا وەستان و هێزێکی حەلەبیش هاتە

یارمەتیدانی موسڵمانان بەمەدا توانیان بەسەر داویەکاندا سەرکەون و زۆرێکیان بکوژن و ژمارەیکیشیان لێ بەدیلبگرن، لە نێو خودی ئەیوبیەکانیشدا چەندین جەنگ هەبوو کە دوای ئەوە تا ئاستێك بەسەر دابەشبونە نێوخۆیەکانیاندا زاڵبوون و لەگەل عەلائەدیندا جەنگان و دواتر هاوپەیمانیان لەگەڵ بەست.

لەگەڵ خوارزمیەکاندا جەنگان و عەلائەدینی هاوپەیمانیشیان لەگەڵیاندا بوو تا بەسەریاندا سەرکەوتن و لەخلاط دەریانکردن، پاشان بۆ جاری دووەم لەگەڵ عەلائەدیندا جەنگان، مەلیك کامیل پاش لەناوبردنی ململانێ و پیلانی براکانی کەدەیانویست لەناوی ببەن مرد و ساڵح ئەیوبی کوری شوێنی ئەوی گرتەو لە وەرگرتنی دەسەڵاتی میسردا، خاچپەرستان چاویان بریە ناکۆکیەکانی ئەیوبیەکان، بۆیە پاپا داوایکرد تا جەنگێکی خاچپەرستی ئەنجام بدەن.

ژمارەیەك لەسەرکردەکانی فەرەنسا چوون بەدەم داواکەیەوەو شالاویك بە سەرکردایەتی (سیبوبی چوارەم)ئامادە کراو گەیشتە عەککا، ناسر داودی بەرپرسی ئوردون توانی بەیتولمەقدیس لە خاچپەرستان بسێنێتەوە، چونکە ئەوان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندنەوەو شورەکانی قودسیان نوێ دەکردەوە، ئەوکات رێبەرانی شالاوی خاچپەرستی فەرەنسی بیریان لەوە کردەوە هێرش ببەنە سەر بەیتولمەقدیس یان دیمەشق یان میسر یان عەسقەلان دواجار بریاریاندا هێرش ببەنە سەر عەسقەلان لە رێگەیاندا دەستیانگرت بەسەر کاروانێکی موسڵماناندا و بەرەو غەززە چوون تا بەرەو رووی ئەو سوپایە ببنەوە کە مەلیك عادلی دووەم دژ بە ئەوان بەرێی خستبوون لەوێ شکستێکی گەورەیان خوارد و بە بێهیوایی گەرانەوە بۆ عەککا.

بەڵام صالح ئیسماعیلی بەرپرسی دیمەشق لەگەڵ خاچپەرستاندا دژ بە ئەیوبیەکانی دیکە هاوپەیمانی بەست بەرامبەر بەوە قودس و عەسقەلان و تەبەریەنی دانە دەست، ئەمەش بەهۆی ئەوەی عادلی دووەم لابراو کاروباری میسر درایە دەست ساڵح ئەیوب، خەڵکی بەرێبەری عیززی کوری عەبدوسەلام دژ بە ساڵح ئیسماعیل راپەرین و لەگەڵ میسریەکاندا دژ بە خاچپەرستان هەستان و شکستێکی سەختیان تووشکردن.

شالاوی فەرەنسی پاش ئەوەی لەگەل سالح ئەیوبیدا ئاگربەستیکی بەست گەرایەوە بۆ ولاتی خۆی، لەگەلْ گەرانەوەی ئەودا شالاوێکی ئینگلیزی بەرێبەری (ریتشارد کۆرنۆل)ی برای پاشای ئینگلتەرا بەرەو عەککا هات کەوتە سەنگەر گیری لەعەسقەلاندان ئەم شالاوە دەیویست کارەکەی (سیبوب)بچەسپێنێت و تەواوی بکات، دواتر بەشوێن پێی خۆیدا بەرەو ولاتی خۆی گەرایەوە.

صالح ئەیووب دژ بەو نزیکانەی کە بۆ هێرش بردنە سەر میسر لەگەل خاچپەرستاندا هاوپەیمانییان بەستبوو پەنای بردە بەر خوارزمیەکان، ئەوانیش بەرەو شام هاتن و چەندین گوندیان گرت و بەرەو (جەلیل) چوون و دەستیانگرت بەسەر تەبەریەو نابلوس داو دواتر بەیتولمەقدیسیشیان گرت و هەموو دیمەنێکی مەسیحیەتیان تێدا لەناوبرد و بەشێوەیەکی یەکجارەکی خاچپەرستانیان لە قودسدا دەرکردن.

خوارزمیەکان بەهاوبەشی لەگەلْ میسریەکان و بەسەرکردایەتی روکنەدین بیبرس توانیان هێرش ببەنە سەر خاچپەرستان و هاوپەیمانانیان لە دووڕووەکانی ناو موسڵمانانی غەززە و شکستێکی وایان تووش بکەن کە لەدوای جەنگی حگین گەورەترین کارەسات بوو بۆ خاچپەرستان تا ئەوەی هەندێ لە مێژوو نووسان ناویان ناوە (حطینی دووەم).

سوپاسی صالح ئەیوب توانی قەلای تەبەریە لە دەست خاچپەرستان بسێنێتەوە، لەهەمان سالْدا عەسقەلانیشیان گرت، صالح ئەیوب لەوی بەدواوە میسرو شام و بەیتولمەقدیس لە ژێر دەستدا بوو، لەوی پاشایانی بنەمالەی ئومەوی هاتن تا ملکەچی گوێرایەلی خۆیان بخەنە ڕوو، بەتریکی قودس هەولیدا بە داواکاری بەردەوامی خۆی شالاویکی خاچپەرستی بەڕێ بخات بەلام بەهۆی ناکۆکیەکانی نێوان خودی ئەوروپیەکانەوە سەرکەوتوو نەبوو.

لویسی نۆیەمی پاشای فەرەنسا ئەوکات نەخۆش بوو، نەزری کرد ئەگەر چاك ببێتەوە شالاویك بباتە سەر موسلمانان، کاتێك چاك بوویەوە بەدرێژایی سێ سال خۆی ئامادە کرد.

دواتر بەرەو ڕۆژهەلات بەهاودەمی ژنەکەی و براکانیشی ڕۆبەرت و شارل لە سالی ٦٤٦ کۆچیدا چوویە ناو دەریا، ئامانجی ئەو شالاوەیش فراوانکردنی قەلەمڕەوی فەرەنسی بوو، شالاوەکە بەرەو میسر چوو توانی لە قوبرس سوپا کۆ بکاتەوەو یارمەتی بۆ بێت و لەگەلْ مەغۆلەکان و مەسیحیەکانی ناوچەکەدا پەیوەندی ببەستێت.

پاشان سوپاکان بەرەو دمیاگ چوون ولویسیش نامەی بۆ سالح ئەیوب نووسی (وا موسلْمانانی ئەندەلوس دیاریمان بۆ دێنن و ئێمەش بەرەو بازاڕی گاوەمانگایان دەبەین واتە وەك ئاژەلْ سەیر یان دەکەین)پیاوەکانیان دەکوژین و ژنەکانیان بێوەژن دەخەین و کچ و مندالەکانیشیان بەدیل دەگرین، ئەگەر بەو پەری ئیمانتەوە سوێندم بۆ بخۆیت و بچیتە لای قەشەکان و وەك ملکەچی بۆ خاچ مۆم هەلکەیت ئەم شالاوە ناگێڕێتەوە کە خەریکە بەرەو ڕووت دێم) ئەویش وەلامی دایەوە (ئەی سەرکەش و بەخۆناز ئەگەر تیژی شمشێرکانمان و گەورەیی جەنگەکانمان ببینیت کە چۆن قەلاو کەناراوەکانتان دەگرین و شارەو شار دەرتان دەکەین ئەو کات ناچار دەبیت پەنجەی پەشیمانیت بگەزیتەوە).

لویس گەیشتە دمیاط و جەنگێکی قورس ڕوویدا و خاچپەرستان لەبەر زۆری ژماریان سەرکەوتن و سوپای ئەییوبی بەرەو ئەشموم تەناح چوو دمیاتی بۆ خاچپەرستان بەجێهێشت و خەلکی ئەوێش شارەکە یان بەجێهێشت و دوای ئەوەی ئاگریان بەردایە بازاڕەکەی، ئەوکات خاچپەرستان دمیاگیان گرت، لەوێ پێنج مانگ مانەوەو چاوەڕوانی گەیشتنی یارمەتی لە ئەورووپایان دەکرد، سالح ئەیوبیش لەجێگەی مەرگیدا سەرقالی ڕێکخستنی بەرگریکاری بوو.

ئەلفۆنسی برای لویس بەیارمەتیەوە هات و خاچپەرستان بڕیاریاندا بەرەو قاهیرە بکشێن، بۆ ڕۆژی دواتر کشانەکەیان صالح ئەیووب مرد، بەلام شەجەرە تودوری ژنی هەوالی مەرگی لە پێناو جەنگەکەدا شاردەوەو سەرکردەکانی کۆکردەوەو بەیعەتی لێوەرگرتن بۆ تورانشاهی کوڕی صالح ئەیوب و هەوالی نارد تا تورانسان لە قەلای (کیفا)وە بێت.

لـەو ماوەیـشدا بۆنـەکان بـەناوی سـوڵتانی مـردووەوە بـەڕێوە دەچـوون خاچپەرستان هەواڵی مەرگەکەیان زانی بۆیە لویس هەوڵیدا خێرا لە ڕێگەی دەلتاوە هێرش بکاتە سەر قاهیرە، بەڵام ئاو گەمارۆی دان و میر فەخرەدین هێرشی بردە سەریان و بەربەستی لە ڕێیاندا دروستکرد و ژمارەیەکیانی بەدیلگرت.

لویس زنی ناتوانیت بپەڕێتەوە بۆمەنسورە تا ئەوکاتەی موسڵمانان لەبەرەی ئەوبـەری ڕووبـاردا بـن بۆیـە توانییـان لـە ڕێگـەی (سـەلمون)و بـە هاوکـاری مەسیحیەکانی میسر بپەڕنەوە بەڵام دووبارە میر فەخرەدین ڕێی پێ گرتن، رۆبرت لەگـەڵ پێـشڕەوی سـوپای خاچپەرسـتاندا پـەڕیوەو بـەرەو گرتنـی مەنـسورە چوو،لویسی لەگەڵدا بوو.

بـەڵام سـوپای موسـڵمانان بەسـەرکردایەتی بیـبرس بوندقداری دایـان بەسـەر خاچپەرستانداو کوشتارێکی زۆریـان لێکـردن و خـودی رۆبـەرتیش کوژراو زۆربـەی داویەکانیش کوژران، ئەمە گورزێك بوو بۆ لویس بۆیە سەرنیل پردێکی دروستکرد تـا بپەڕێتـەوە بـەڵام سـوپای موسـڵمانان هێرشـیان بـردە سـەر سـەربازگەکەی و لویسیش بەدرێـژایی ئـەو ڕۆژە بـەرگری کـرد و سـوپای موسـڵمانانیش گەڕانـەوە بۆ مەنسوورە.

پاشان تورانشاه هاتە میسرو موسڵمانان پێی دڵخۆش بوون، لـویس ویستی لـە قـاهیرەوە بـەرەو دمیـاگ پاشـە کـشە بکـات، بـەڵام موسـڵمانان بـە کەشـتیەکانی تورانــشاهەوە دایــان بەســەر خاچپەرســتانداو دەســتیانگرت بەســەر کەشــتیە فریاگوزاریــەکانی خاچپەرســتاندا و لەســێ جەنگــدا کەشــتیگەلی موســڵمانان سەرکەوتن.

لویس بڕیاری گەڕانـەوە بۆ دمیـاگ دا، هـەر کـە گەیـشتە فارسکۆر موسڵمانان هێرشـیان بـردە سـەر لـویس و سـوپاکەی و جـەنگێکی ترسـناك ڕوویـدا و تیایـدا سـوپای خاچپەرسـتی کەوتـە بـەر کوشـتارو بـەدیلگیران تـا ئـەوە خـودی لـویس بەدەست بەستراوی برا بۆ مەنسوورەو لە ماڵی ئیبن لوقمان بەند کرا.

تورانشاه چی مەرجی ویست لەسەر لویس و بەندکراوەکانی داناو ڕێککەوتن دمیاگ بدرێتەوە بە موسڵمانان و ئاگربەستێکی دەساڵە بکرێت و لویسی نۆیەمیش ئیمزای کرد.

پێش ئەوەی ئاگربەستەکە تەواو بێت، مەمالیکی دەریایی و شەجەرەتودور پیلانی کوشتنی تورانشاهیان دا چونکە ژیانی خراپ بوو ستەمی دەکرد بۆیە کوشتیان و شەجەرەتودور دەستیگرت بەسەر دەسەڵاتدا، دواتر لەگەڵ عیزەدین ئیبەکدا هاوسەرگیری کرد و ئەیبەك بوو بە سوڵتانی میسر و دەسەڵاتی میسر و شام لەوکاتەوە کەوتە دەست مەمالیکەکان کە سیستمێکی نوێ بوون.

مەمالیکەکان لەگەڵ لویسدا پەیمانەکەیان جێبەجێکرد دوای ئەوەی بەویستی خۆیان چەند شتێکیان بۆ زیاد کرد لە شەشی مایۆی ساڵی ١٢٥٠ز دا دمیاگیان وەرگرتەوەو لویسیسش بەجێیهیشت و گەیشتە عەککا، هەوڵیدا لەشامدا شتێك بۆ خاچپەرستان بکات، بەڵام نەیتوانی، ئەو ویستی لەگەل ئەییوبیەکانی شام دژ بە مەمالیکەکان ڕێکبکەوێت بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

*******************

# شالاوی هەشتەمی خاچپەرستی

دەوڵەتی مەملوکی ئەو دەوڵەتە بوو کە بوونی خاچپەرستی لە جیهانی ئیسلامیدا بەیەکجارەکی لەناو برد دوای ئەوەی بوونی ئەیوبی لە میسردا نەهێشت، پاشان کاتێك مەغۆلە وێرانکەرەکان هاتن ودەوڵەتی ئیسلامیان لە رۆژهەلات رووخاند و دەستیانگرت بەسەر ولاتی شامدا تەنها میسر و یەمەنیان لەبەردەم مایەوە.

قوتزی سوڵتانی میسر سوپایەکی مەملوکی نارد بۆ غەززە کە مەغۆلەکان داگیریان کرد بوو، پاشان هەردوو سوپا لە عەین جالوت پێکیاندادا و مەمالیکەکان سەرکەوتن، بەو سەرکەوتنە مەمالیکەکان توانییان بە ئاسانی ئەییوبیەکانی شام لە ناو ببەن پاش ئەوەش کە قوتز کوژراو زاهیربیبەرس هاتە شوێنی.

دیارترین کاری لەناو بردنی خاچپەرستان بوو لەشام بۆ ئەمە هەڵمەتیکی گەورەی بۆ ئامادە کردن کە لە غەززەوە کەوتە رێ و یەکلە دوای یەك قەلاکانی خاچپەرستیان گرت تا ئەوەی گەیشتە ئەرسوف، پاشان رۆلی عەککا هات، بەلام نەیانتوانی بیگرن، بەلام صەفەد و هونین و تەبنیف و رەملە یان گرت.

بیبرس بەرەو ئەرمینیای بچووك و میرنشینی ئەنتاکیەو تەرابلوس چوو تا سزایان بدات لە سەر هاوپەیمانی بەستنیان لەگەڵ مەغۆلەکان دژ بە موسڵمانانن سوپاکانی لەژێر سەرکردایەتی قلاووندا بوون، سوپاکانی بیرس توانیان قەلاکانی (قولەیعات و حەلبا و عەرقە)بگرن کە گرنگترین پێگەو مەڵبەندی پاراستنی تەرابلوس بوون.

هەروەها ئەو سوپایانە دەستیانگرت بەسەر مسیسەو ئەزنەوتەرسوس و بەندەری ئیاسدا کە گرنگترین مەڵبەندەکانی پاراستنی ئەرمینیان، کوڕێکی هەیسومی پاشای ئەرمینیا کوژراو کوڕێکی دیکەشی بەدیلگیرا، مەلیك مەنسوری ئەیوبیش چوو بۆ سیسی پایتەختی ئەرمینیاو دەستیگرت بەسەریداو ئاگری تێبەردا، سوپاکانیش بە چل هەزار دیل و دەستکەوتێکی بێشومارەوە گەرانەوە بۆ شام.

هەیسوم هەوڵیدا کوڕەکەی بە پارە ئازاد بکات، بەڵام بیبرس سوور بوو لە سەر ئەوەی لە جیاتی ئەوەدا (دربساك) وەربگرێت کە لەسەر ڕێی پەیوەندیەکانی نێوان ئەرمینیاو ئەنتاکیەو مەرزەبان ورەعبان و (شيح الحديد)بوو هەموو ئەمانەش لە هەرێمی مەرعەشدا بوون، هەروەها زاڵ بوو بەسەر ڕێگەی نێوان جەزیرەدا (رووەوەو ئەو مەغۆلانەی کە هاوپەیمانی هیسۆم بوون) و نیوان ئەرمینیای بچووکدا.

پاشان سوپاکانی بیبرس بەرەو یافا چوون دەستیانگرت بەسەریدا هەروەك لەهەمانساڵدا یافایان گرت و توانیان پاش جەنگێك کە بیبرس نەخشەی بۆ دانا بوو بە لێهاتوویەکی بێوێنە بەڕیوەی دەبرد دەستیگرت بەسەر ئەنتاکیەدا، بەمەش دووەم میرنشینی خاچپەرستی لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامی کەوتە دەست موسڵمانان.

ئەوەش سەرکەوتنێکی گەورە بوو کە تیایدا لەدەستکەوتەکانی موسڵماناندا شتێك زۆر دیار بوو کە ئەویش بچڕاندنی پەیوەندی نێوان خاچپەرستانی تەرابلوس وعەککا بوو لەگەل ئەرمینیا لەلایەك لەلایەکی دیکەشەوە بیرۆکەی هاوپەیمانی نێوان ئەرمینیاو ئەنتاکیەو مەغۆلی لەناو برد، بەوجۆرە مەمالیکەکان سەر لە نوێ میسرو شامیان گرتەوە دەست و توانیان سەرە مەرگی بوونی خاچپەرستی لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا بهێنن.

بەلام بەڕێبەری شالویسی نۆیەمی شای فەرەنسا شاڵاوێکی خاچپەرستی هات و تەرابلوسی لەوە ڕزگار کرد بکەوێتەدەست بیبرس بیبرسیش لە ترسی ئەوەی شالاچوە خاچپەرستیەکە بەرەو میسر نەچێت خێرا تەڕابلوسی بەجێهیشت وگەڕایەوەو بۆ میسر، بەلام شالاوی هەشتەمی خاچپەرستی لەسەر داوای براکەی لویسی نۆیەم کە پاشای سقلیە بوو چوو بۆ تونس، چونکە ئەو دەیویست هێرش بباتە سەر تونس و لەگەڵ فەرمانڕەوا حەفیەکانیدا بجەنگێت، لویسی نۆیەم حەزی بەوە دەکرد، بەلام هەڵمەتەکە هەر کە گەیشتە تونس، لویس تووشی تایەکی سەخت بوو و مرد و شالاوەکەش کۆتایی پێهات.

# شاڵاوی نۆیەمی خاچپەرستی

بە کۆتاییهاتنی شاڵاوی هەشتەمی خاچپەرستی بە مردنی لویسی نۆیەم، بیبرس پێنجەم بوو و دوای ئەو خۆی بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی هەڵمەتەکەی ئامادە نەکرد و بۆ جاری دووەم بەرەو تەرابلوس چوو، بەڵام بومبندی میری ئەوی داوای ئاشتی کرد و سوڵتانیش بەوە ڕازیبوو، چونکە شاڵاوێکی نوێی خاچپەرستی بەسەرکردایەتی میر ئیدوارد هات وگەیشتە عەککا، ڕێککەوتنی نێوان بیبرس بوهمندیش بۆ ماوەی دەسال بوو.

سوڵتان بیبرس هێرشی بردە سەر عەککا کە هیوای سێیەمی گەورە ودژۆمی سەرسەختی ئیسلام و خاوەن چاوچنۆکی خاچپەرستی بەرپرسی بوو، خاچپەرستان ئەوێیان کردبوویە بنکەیەك تا لەوێوە هەنگاو بنێن و بگەن بە وڵاتی شام (لەوکاتەی دەچوونە ناو دەریاوە)، بەڵام کەشتیگەلی ئیسلامی بەهۆی گەردەلولێکی دەریاییەوە تێکشکا.

ئەرمینیەکان دوای جەنگی ملازگرد کیلیکیایان بەجێهێشتبوو، کاتێك سەلجوقیەکان لە ئاسیای بچووك ئەوێیان بەجێهێشت، ئەرمینیەکان لەوێ دەوڵەتی ئەرمینیای بچووکیان دامەزراند کە بەردەوام پاڵپشتیکی خاچپەرستان بوو، بۆیە بیبرس هێرشی بردە سەر، ئەو دەوڵەتە لە دژی بیبرس دەوەستاو پاڵپشتی خاچپەرستانی دەکرد و نەیدەهێشت تەختەو ئاسن بچێت بۆ میسر، بیبرس بەسەریدا سەرکەوت و ژمارەیەك لەسەرکردەکانی بەدیلگرت، لەوانە کوڕی هیسومی یەکەم، بەوە ئەودەوڵەتە لەوەو بەدوا لاواز کەوت.

تێبینی ئەوەدەکرێت ئەو دەوڵەتانەی بیبرس هاوپەیمانی لەگەڵ بەستبوون پاڵپشتی خاچپەرستان نەبوون ئەوەش واتای هاوپەیمانی بوو، چونکە ئەگەر بڕوانینە دەوڵەتی ڕۆمانی ڕۆژ ئاوا هەمیشە پاڵپشت و هاندەری خاچپەرستان بوو، کاتێك فەرەنسی و ئینگلیزەکان سەرکردایەتی شاڵاوی هەشتەم و نۆیەمی خاچپەرستانیان دەکرد نیمچە بێلایەنی نواند.

چونكە يەكەميان بەڕێبەری لويسی نۆيەمی پاشای فەرەنسا بوو و دووەميش بەسەركردايەتی ئيدواردی سەركردەی ئينگليزی بوو، كاتێك سوڵتان مەنسور قلاون بوو بە فەرمانرەوا مەرقەب و دەوروبەری قەتعكرد و ميری خاچپەرستی تەرابلوسيش لێی ترساو لەسەر خواستی سوڵتان بينا نزيكەكانی وێرانكرد، سوڵتان مەنسور قلاونيش چوو بۆ ديمەشق و لەوێوە بۆ تەرابلوس و گەمارۆی داو گرتی، لەكاتێكدا بەدرێژايی ئەو ماوەيە لەدەست خاچپەرستاندا مابوويەوە.

قلاوون بڕياريدا عەككا بگرێت، بەڵام پێش ئەوە مرد، كاتێك ئەشرەف سەلاحەدين خەليلی كوڕی هاتە سەر دەسەڵات لە ميسرەوە بەرەو عەككا چوو سەربازانی ديمەشق تەرابلوسی و حەممای كۆكردەوەو فەتحيانكرد و خاچپەرستان لە ڕێگەی دەرياوە ڕايانكرد، ئەشرەف توانی صيدا و صوريش بگرێت.

پاشان نوێنەری خۆی لەسەر ديمەشق و بەيروت دانا، دواتر ترجبيل و تەرسوسی كەوتە دەست خاچپەرستان لە كەناراوەكان و وڵاتی شامدا هيچ شوێنەوارێكيان نەما، دواتر هێرشی بردە سەر ڕۆم و هێزێكی نارد بۆ كيسرەوان چونكە مەسيحيەكانی ئەو ناوچە بە پاڵپشتی مەسيحيەكانی ديكە بوون.

********************

# (کۆتایی جەنگە خاچپەرستیەکان)

چوارەم کەشتی جەردە مەسیحیەکان شاڵاویان بردە سەر شاری رەشید لەسەر کەناراوی میسری، بەڵام گومان بۆ سەرکردە ئیبستاریەکانی رۆدس برا، بۆیە زاهیر حقمــق شــاڵاوێکی ئامــادە کــرد و هێرشــی بــردە ســەر رۆدس، ســەرکردە ئیــستاریەکانیش خێــرا ڕوویــانکردە ئــەروپا داوای فریــاگوزرای خاچپەرســتیان لێکردن پاشان دوو جاری تریش هێرشی بردەسەر.

بــەڵام نــەیتوانی بیگریــت، ئەمــەش بــەهۆی پاڵپــشتی خاچپەرســتی بــۆ ئــەو دوورگەیە دوای ئەوەی سەرکردەکانیان پەنایان بردەلای پاپاو پاشایانی ئەورووپا جەنگە خاچپەرستیەکان بەوە کۆتاییان پێنەهات، بەڵکوو ئەوە قۆناغێکی کۆتایی پێهاتن بوو، دوای ئەوە جەنگی خاچپەرستی ڕووی کردە باکوری ئەفریقیاو دواتر سەر لەنوی لە شێوەی دەوڵەتانی هاوپەیمانی ئەوروپا دژ بە دەوڵەتی عوسمانی خۆی هێنایەوەو تا ئەمڕۆیش ئەو شاڵاوە خاچپەرستیانە بەردەوامن ئەگەر چی شێوەو ڕوخساری خۆیان گۆڕیبێت.

جەنگە خاچپەرستیەکان چەندین لایەنی خراپیان هەبوو کە کاریگەرییان هەبوو لەسەر ژیانی گشتی و ئاراستەکانی دەوڵەتان و سیاسەت و ستراتیژیەتی دواتریان، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر ڕێکردەی ڕوداوەکانی دواتر، دەکرێت لەم خاڵانەدا کۆیان بکەینەوە:

## یەکەم: لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە:

* گیانی دەستەو سانی و شکست بڵاوبوویەوە: ئەمەش بەهۆی ئەو شکستانەی کە لەسەرەتاکانی ئەو جەنگانە دا تووشی موسڵمانان بوو تا ئەوەی هەندێ موسڵمانان هیوای سەرکەوتنیان نەما، هەندێکی دیکەشیان پێیان وابوو بە پێنوس و زمان دژ بە خاچپەرستان بوەستن پێویستیان بە شمشێر نابێت.

* هاتنە مەیدانی چەند شارێك كە بوونێكی وایان نەبوو، وەك شاری (قوص)و سەر سنووری (عیزاب) لەسەر دەریای سوور، چونكە خاچپەرستان دەستیانگرت بەسەر فەلەستین و سەرسنورەكانیدا.

بەوە ڕێی حەجی خەڵكی ئەندەلوس و باكوری ئەفریقیا نائارام بوو، بۆیە حاجییان بەرەو میسر دەچوون و دواتر ڕێی نیلیان بەرەو باشوری قاهیرە دەگرتە بەر ڕووەو شاری قوص و لەوێوە بەرەو سەرسنوری عیزاب، پاشان دەچوونە ناو دەریا بەرەو وڵاتی پیرۆز، لەم ئەنجامەدا گرنگی و شانوشكۆی ئەم شارانە زیادی كرد و خوێندنگە و پەیمانگە و مزگەوت كرانەوەو زانایان بەرەو ئەوێ چوون و چەند زانایەك لە بواری فەرمودەو فیقهو نەحودا دەركەوتن و ئەدیب و شاعیری زۆر بوون، عیزابیش هەروا بوو.

## دووەم: لە بواری ئابووریدا:

لایەنە باشەكانی برتیبوون لە ڕەواجپێدانی بازرگانی و گواستنەوەی بەرهەمەكانی ڕۆژهەلات بۆ ڕۆژئاوا لە ڕێگەی جەنەواو بوندوقیەو بیزاو ئەو جەندەرە ئەورووپیانەی دیكەوە كە بۆ چوون ناو جەنگەوە مەرجیان دانابوو لە شانشینەكانی خاچپەرستانی شامدا چەندە دەستكەوتێكی بازرگانی بەدەستبهێنن.

ئیدی شوێنانی وەك عەككا و صیدا و لازقیە بوون بە مەڵبەندی گرنگی بازرگانی كە بەرهەمی ڕۆژهەلاتیان بۆ ڕوژئاوا گواستەوەو وەك حیزاوی لۆكەو ئاوریشم و قاپ و قاچاخی شووشەیی و بەردی گرانبەهاو عاج و دارو تەختەو ئالەت كە لە ڕۆژهەلاتی دوورەوە دەهێنرا بۆ ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، ڕۆژئاواییەكان هەموو ئەمانەیان لە ڕێگەی عێراق و جارجارەش ڕێگەی شامەوە دەهێنا تا سەقامگیری ئەو سنورانە هەبێت كە خاچپەرستانی شام داگیریان كردبوون، لەوێوە بەدەریادا بەرەو ئەورووپا بچێت، هەروەك سوودیان لە چەند سنورێكی میسری وەرگرتبوو كە داگیریان كردبوو وەك دمیاگ و ئەسكەندەریە.

بێگومان ئەو سوودە بازرگانیە جێی ڕەزامەندی دلسۆزان نەبوون لەبەر ئەوەی ئەوە بازرگانی نێوان خاوەن زەوی و داگیر کەری خۆسەپێن بوون هەروەك بەردەوامی جیهادی دژ بە موسڵمانان دەرفەتی تەواوی سەقامگیری بازرگانی نەدەبەخشی.

## لایەنی خراپ:

ژیانی گیانی و ماڵوسامان، جەنگە خاچپەرستیەکان بوونە هۆی وێرانکردنی تەواوی چەند شارو سەرسنورێك ئەوەش داکشانێکی ئابوری و گرفتێکی ئابووری نایەوە، لەگەڵ جەنگەکاندا چەندین پیشەسازی لەکارکەوتن و چەندین بەرهەمی کشتوکاڵی لەناو چوون و ئارامی نەماو تالاّن وپڕی کەوتەوە، ئەمەش بێگومان بوویە هۆی بەرز کردنەوەی نرخی شمەك تا ئاستێك خەڵکی نەیاندەتوانی پێداویستیەکانیان بەدەستبهێنن.

## سێیەم: لە بواری سیاسەت و کۆمەڵایەتیدا:

* لاوازکردنی سیستمی دەرەبەگایەتی ئەمەش پشتی دەبەست بەبنکەیەکی فراوانی ئەو کۆیلانەی جووتیارییان دەکرد و لە خزمەتی گەورە سەرکردەو سوارو خانەدانەکاندا خزمەتیان دەکردو وەك ئامێری کێلاّن و ئاودانی پەیوەست بەزەوی کاریان دەکرد و ژیانیان لەسەر ئەوە وەستا بوو تەنها مافی خواردنی پێویستی و جلوبەرگ و شوێنی خەویان لە نزمترین ئاستدا لەسەر گەورەکانیان هەبوو.

منداڵانیشیان بەهەمان شێوە کۆیلەی گەورەکانیان بوون و کەسیان مافی نەبوو لەویستی گەورەکەی لابدات، ئەو سیستمە کۆمەڵگەی ئەورووپی لەناوخۆدا وێران کردبوو ڕق و کینەی لە دەرونی کۆیلەکاندا بەرامبەر بە گەورەکان نابوویەوە، هەروەك ڕکەبەری ڕقاوی نێوان دەرەبەگەکان نابوویەوە کە ببوویە هۆی ململانێ و دژایەتی جەنگە خاچپەرستیەکان دەرفەتێك بوون بۆ کۆیلەکان تا لەسەختی دەرەبەگایەتی ڕابکەن، گەورەکانیشیان بۆیان نەبوو ڕێیان لێبگرن، چونکە کڵێسا بەپیرۆزی دانا بوو.

ئەمەیش ببوو بە هۆکاری ئەوەی دەرەبەگەکان بۆ ئیشکەری ئازاد بگەڕێن، واتە ئەوانەی بەموچە کاریان دەکرد تا چەند مەرجێکیان لەسەردا بنێن و هەرواو بێ پاداشت کار نەکەن، ئەمە بوویە هۆی هەڵوەشاندنی دواتر سیستمی دەرەبەگایەتی.

## * بەهێز بوونی دەسەڵاتی مەرکەزی پاشایانی ئەوروپا:

دەرەبەگایەتی لە ئەوروپادا گرنگترین هۆکاری لاوازی دەسەڵاتی مەرکەزی پاشایانی ئەوروپا بوو، چونکە گەورە دەرەبەگەکان ملکەچیان نەدەبوون و نەدەچوونە ژێر دەسەڵاتیان، چونکە ئەو دەرەبەگانە خاوەن هێزو سامان و کۆیلەی خۆیان بوون و بەچاوی سوڵتان و پاشەوە سەیری پاشایانیان نەدەکرد جا چەند شانشینێکی ناو ئەوروپا هەبوون کە لەناوخۆدا چەند شانشینێك بوون ئەمەش بە پێی ژمارەی دەرەبەگەکان بوون بەلام کاتێك شالاوە خاچپەرستیەکان هاتن و سیستمی دەرەبەگایەتی لاواز بوو کۆمەڵێك گەورە دەرەبەگ بەشداریان تیدا کرد و هەندێکیان لەو جەنگانەدا لەناو چوون لەچەند شانشینێکی ئەوروپادا دەسەڵاتی مەرکەزی گەرایەوە و جێگەی پاشایانێك بەهێز بوو.

## * ڕوودانی چەندگۆڕانیکی کۆمەلایەتی و سیاسی لە ئەوروپادا:

ئەمەش بەهۆی لاواز بوونی سیستمی دەرەبەگایەتیەوە، لەو گۆڕانانەی دیکەش نزیکبوونەوەو جیاوازی نێوان چینەکانی کۆمەڵگەو دەرکەوتنی چینی نێوەند لە کرێکارانی ئازدی ناکۆیلە، دەرکەوتنی چەندین نەتەوە لە ئەوروپادا دوای ئەوەی پێشتر لە ژێر سایەی گەورەیەکدا دەرەبەگایەتی خەڵکی کۆدەکردەوە، جا کاتێك دەرەبەگایەتی لاواز بوو خەڵکی چوونەوە ژێر ئالأی نەتەوایەتی خۆیان.

## دەرکەوتنی چەند کۆمەڵێکی ئایینی جەنگاوەر:

وەك سوارەکانی پەرستگا (داویە) ئەمە دەستەیەکی سەربازی ئایینی سەر بە کلێسا بوون یان ئیسبتاری کە دەستەیەکی ئاسنی سەر بە نەخۆشخانەی قدیس یوحەننای مەقدیسی بوو، سوارەکانی تیوتون کە دەستەیەکی سەربازی ئایینی ئەڵمانی

بوون هەموو ئەم کۆمەڵانە بەهۆی جەنگە خاچپەرستیەکانەوە دامەزران و هەموویشیان لەو جەنگانەدا دژ بە موسڵمانان و بە جیاوازی کات و شوێن بەشدارییانکرد.

### * پاڵپشتی پێگەی پاپاو بەهێز کردنی قەڵەمڕەوی:

پاشایانی ئەورووپا کە لە دەسەڵاتی پاپا هەڵدەگەڕانەوە لەوە بەدوا ملکەچی قەڵەمڕەوی پاپا بوون، چونکە پاپا ڕێبەری جەنگێکی پیرۆزی دکرد کە مافی لێخۆشبوون لە تاوانی بەبەشدار بوانی دەبەخشی، لەکاتێکدا بڕیاری بێبەریکردنی دەردەکرد بۆهەر کەسێك کە لەبەشداریکردنیدا کەمتەرخەمی بکات، هەروەك بەو پێە پێگەی چەند پاشایەکی ئەورووپا بەهێز بوو، ئەو پاشایانەی بۆ بەشداریکردن لەو جەنگەدا خێرا چوون بەدەم بانگەوازەکەی پاپاوە.

## چوارەم: لە بواری ئابووریدا:

### * دابەزینی نرخی زەوی عەقار:

چونکە کاتێك پێشوازیکرد لە دراو بۆ ئامادە سازی جەنگاوەران و جل و شمەك بەدەر لە ئامادە سازی سەربازی زیادیکرد، ئەو کات زۆربەی خەڵك دەیویست ماڵو زەوی و کێڵگەی خۆی بفرۆشیت تا پارەی بەدەست بخات، ئەمە بوو بەهۆی دابەزینی نرخی زەوی، لێرەدا جولەکە دەرکەوتن و قەرزێکی زۆریان بە شێوەی (ربا)سوو پێشکەشکرد، بەوە ئەورووپیەکان لە ڕاڕایی و شلۆقی و تەنگەبەریدا دەژیان و لە ڕیڕەوی جوولەکە بێزار بوون و ڕقیان لێهەلگرتن، کاتێکیش دەرفەتیان بۆ لوا، زۆربەیان چەوساندنەوە.

### * سەپاندنی چەند باجێکی نوێ لە پێناو جەنگە خاچپەرستیەکاندا لەلایەن چەند پاشایەکەوە:

وەك ئەوەی لویسی نۆیەم بۆ ئامادە سازی شاڵاوی خاچپەرستی ئەنجامیدا، هەروەها فیلیپ ئۆگەستس وریتشارد دڵی شیر هەمان شتیان کرد.

## بوژانەوەی ئابووری چەند شارێکی ئەورووپی:

بەوەی چالاکی بازرگانی جێی چالاکی کشتوکاڵی گرتەوەو چەند شارێك بوونە پێگەی ئابووری وەك جەنەوا و بوندوقیەو بیزاو مررسیلیاو بەرشەلۆنە ئەمە بوویە هۆی فراوانبوونی بانك و چوارچێوەی کارکردنی، هەروەك بوویە هۆی چاککردنی ریگاکانی بازرگانی و دروستکردنی چەند رێگەیەکی دەریاوانی خاوەن نەخشەی رێکخراو.

## پینجەم: لە رووی هەستانەوەی زانستی و ژیاریەوە:

جەنگە خاچپەرستیەکان ژیاری ئیسلامییان بەشێوەیەکی قووڵتر و بڵاوتر بەدەوڵەتانی ئەورووپی ناساند وچەند بەڵگەو خەسڵەتێکیش لە ژیاری ئەورووپی سەردەمی رینسانسدا هەبوون کە ئاماژەی بوون بەکاریگەربوون بە ژیاری ئیسلامی و گواستنەوەو وەرگرتن لەو ژیارە بۆ ئەورووپا.

جا لە هەمان ئەو کاتەی کڵێسا رێی بەبواری پزیشکی نەدەدا لەبەر ئەوەی بڕوای وابوو نەخۆش سزایەکی خوداییەو نابێت مرۆڤ هیچ دەستی تێوەر بدات، لەو کاتەدا موسڵمانان هەر لە پێشترەوە سەرقاڵی بواری پزیشکی بوون بەڕاستی موسڵمانان فراوانخوازییان لە بواری پزیشکیدا کرد و چەندین نوسراوی فارسی و یۆنانی و هیندییان لە بواری پزیشکیدا وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و چەند نوسراوێکیشیان نووسی کە لە رووی گەورەیی و پوختی و جیاکردنەوە هیچ نمونەیەکی پێتشری وانەبوون هەندێ لەگەورە کتیبانی ئەو موسڵمانانە تا ماوەیەکی دوورودرێژ لە زانکۆکانی ئەورووپادا دەخوێنران.

سەبارەت بە زانستەکانی دیکەی وەك بیرکاری و گەردوون ناسی و زانستە سروشتیەکانی وەك کیماو گژوگیاو زیندەوەرو کانزاو دەرمانسازی، موسڵمانان ماوەیەك زۆر پێشتر لە سەردەمی رینسانس تیایدا رۆچوو بوون و خەزێنە زانستیەکانیان وەردەگێڕایە سەر زمانی خۆیان و زانستەکانی ئیغریق و رۆمان و فارس و هیندەکانیان دەکردبە عەرەبی، کتێبخانەو کتێبەکان بڵاو بوونەوەو خەلیفەو سەرکردەکان کۆشکەکانی خۆیانیان کردەوە بۆ زانست و زانایان و لە پێناو پاراستنی زانست و زانایاندا کێبڕکێیان دەکرد، زانایان چەندین بیردۆزەیان دۆزیەوە کەچی دواتر درانە پاڵ کەسانی دیکە.

چەندین ناوی گەورە دەرکەوتن، وەك ئیبن مەسکەویەو خازن و ئیبن خەلدون و ئیبن نەفیس و ئیبنولهەیسەم و بەتتانی و فەرغانی و کەندی و خوارزمی و بیرونی و غافقی و قەزروینی و جابری کوڕی حەییان و ئیبن بەیتارو داوودی ئەنتاکی و...هتد، نووسینەکانی ئەم زانایانە بوون بە سەرچاوەی پشت پێ بەستراوی زانکۆکانی ئەورووپا تا سەدەی نۆزدەیەمیش.

ژمارەیەکی زۆری مێژوو نووسانی جیهان دان دەنێن بە فەزڵ و گەورەیی زانایانی موسڵماناندا بەسەر جیهان و مرۆڤایەتیدا، تا ئەوەی یەکێکیان دەڵێت: ( ئەگەر کارەکانی موسڵمانەکان نەبوونایە ئەوا زانایانی رینسانسی ئەورووپی ناچار دەبوون لەسەرەتای دەستپێکردنی ئەو زانایانەوە دەستپێبکەن و ڕێکردەی شارستانیەت چەند سەدەیەك دوا دەکەوت)، یەکێکی دیکەیان دەڵێت: ( زۆربەی ڕاو بیردۆزە زانستیەکانمان بەهی خۆمان داناون، کەچی پێش ئێمە موسڵمانەکان دایاننناون).

هەوڵەکانی موسڵمانانی لە بواری جوگرافیادا کاریگەریەکی ڕوونیان هەبوو لە سەر رینسانسی ئەورووپی بە تایبەت جوگرافیای وەسفی و گەردوونی، نوسین و لێکۆلینەوە بیروڕاکانی موسڵمانان چرایەکی ڕووناکی بوون بۆ زانایانی ڕۆژئاوا، لە نێو موسڵماناندا زانایانێکی هەڵکەوتە دەرکەوتن کە لە ڕێگەی پێگە گەردونیەکان ودیمەنی گەشتەکان و پوختکردنەوەی زانستەکان و بەراوردی نێوانیان بۆ جیا کردنەوەی ڕاست لە هەڵەو درۆ جوانترین لێکۆلینەوەیان بۆ زانستەکان زیاد کرد.

گەشتیارە ئەورووپیەکان بەردەوام تا ئاستیکی زۆر پشتیان بەسەرچاوە ئیسلامیەکان دەبەست بۆ زانینی ئەو بەشانەی جیهان کە لێیان نادیار بوون، گۆستاف لۆبۆن دەڵێت: عەرەبە(موسڵمانەکان) ئەوانە بوون کە گەیشتنە ئەوپەڕی شارەزایی گەردوونی دروست لەڕوانگەی زانستیوە کە بەیەکەم بنەرەتی نەخشەکان دادەنریت، ئەوان هەڵە گەورەکانی یۆنانیان ڕاستکردەوە، لە ڕوانگەی گەشت و گەڕانیشەوە ئەوان گەڕان بەبەشەکانی جیهانیان دۆزیەوە کە ئەورووپا گومانیان لەو هەولانە هەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی پێی نەگەیشتن.

هەروەها لە دیارترین کاریگەری و شوێنەوارەکانی جەنگە خاچپەرستیەکان لە ئەورووپا ئەوە بوو کە چەند شارێکی ئەورووپی چەند خوێندنگەیەکیان دامەزراند بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی، ئەوان دەیانزانی بۆ گەیشتن بە ئامانجە ئایینی و ئابووریەکانیان فێربوونی زمانی عەرەبی شتێکی پێویستە، ئەمەش هۆکارێك بوو پشتگوێ خستنی زمانی لاتینی و ئیغریقی تا ئاستیکی زۆرو زیندوو کردنەوەی زمانە نەتەوەیی و جەماوەریەکان، هەروەها چەندین فەرهەنگی ئەورووپی عەرەبی بۆ یارمەتیدانی وەرگێڕو فێربوان دانران.

## شەشەم: چاوچنۆکییان لە جیهانی ئیسلامیدا:

مەبەست لە جەنگە یەکەمینەکان بە زۆری ئایینی بوو، بەلام هەولی دووبارە گەڕانەوە بۆ جیهانی ئیسلامی زیاتر زالبوونی خواستی ماددی و بوو لەولاتانی جیهانی ئیسلامیدا، ئەورووپییەکان بەچەند هۆکارێك هاندران تا پاش کۆتایی هاتن بە جەنگە خاچپەرستیەکان بگەڕێنەوە بۆ داگیر کردنی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی، ئەو هۆکارانەیش بریتیبوون لە:

یەکەم: کلێسا خەونی ئەوەی هەبوو لە پێناو گرتنی ڕۆژهەلاتدا سوپایەکی گەورەی ئەورووپی هەبێت کە شانوشکۆ بۆ کلێسا بگێڕێتەوەو ئەو دەسەلاتەی پێبدات کە پاشایانی ئەورووپا لەکاتی شالاوە خاچپەرستیەکاندا ملکەچی بوون، پاشا ئامانجێکی دیکەشی هەبوو کە ئەویش بانگکردنی موسلمانان بوو بۆ چوونە ناو ئایینی مەسیحیەت.

دووەم: پیاوانی پارەو ئابووری کە بەبەرهەم و کەرەستەکانی ڕۆژئاوا سەربەست ببوون.

سێیەم: ئەو پاشایانەی ئەورووپا کە دەیانویست بازاڕ و بەندەرە گەورە ئیسلامیەکان بۆ بازرگانی ناوچەکانیان و بازرگانەکانیان پەیدا بکەن، ئەمەش لە ڕێگەی زالبوونی گەورە جەنگاوەرەکانەوە، نەوەك هاوپەیمانە بەلێندەرەکان.

ئەمانە (کڵێسا، پارەداران، پاشایان)نەخشەیان دانا بۆ گەڕانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لەو پێناوەشدا دیارترین کارەکانیان بریتیبوون لە:

١- گرنگیدان بە زمانی عەرەبی تا بە ئاسانی و بەوردەکاریەوە لە مێژو نەریت و فەرهەنگی جیهانی ئیسلامی تێبگەن و شارەزایی ورد وەربگرن، هەر سەبارەت بە هۆکاری فێربوونی زمانی عەرەبی کڵێسایش دەیویست پیاوەکانی لە نێو موسڵماناندا ئایینی مەسیحیەت بڵاو بکەنەوە، بازرگانانیش دەیانویست ئاسان مامەڵە بکەن و پاشایانیش بۆیە گرنگیان بەو زمانە دەدا تا لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا چەند باڵوێزێکیان هەبێت کە زمانی عەرەبی بزانن، بۆ ئەمەش چەند فەرهەنگێکی عەرەبی ئەوروپی دانران تا فێربوان سوودی لێوەر بگرن، بۆ نموونە لە ساڵی ١٥٠٥ز دا فەرهەنگی عەرەبی قشتالی دانرا، کتێبی (وەسفی ئەفریقیا)ی حەسەنی کوری وەزرانی ناسراو بە لیۆنی ئەفریقی، جیۆم بۆستیلی فەرەنسی خاوەن حەزی عەرەبی کتێبی (کۆماری تورک)ی بلاو کردەوە کە بە بنەرەتیکی باش دادەنریت بۆ پشتبەستنی زۆربەی لیکۆڵینەوە عەرەبییەکان پێی و ڕۆژهەڵاتناسانیش کردیان بەسەرچاوەیەکی بنەرەتی بۆ لیکۆلینەوەیان لە ئیسلام و عەرەب.

٢-وەرگێرانی قورئانی پیرۆز بۆ چەندین زمانی ئەورووپی تا ئاسانکاری بکەن بۆ ئەوانەی بەو هۆیەوە بانگەوازیان بانگەشە دەکەن.

٣- وەرگێرانی ئینجیل بۆ زمانی عەرەب تا بانگخوازانی مەسیحیەت لەلایەك وە پشتی پێبەستن لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر دەستی موسلماناندا بێت بۆ خوێندنەوە ئاگادار بوون لێی.

٤- رۆژهەلاتناسی: ئەمەش گرنگیدان بوو بە لێکۆڵینەوەی فەرهەنگ و مێژوو نەریتی ڕۆژهەلات سەرەتاکانی ڕۆژهەڵاتناسان لە سەدەی دەیەمی زاینییەوە تا ئەمرۆش گرنگیان بەو بوارە داوەو ئامانجیش لەوە ئامادە سازیە بۆ هێرش بردنە سەر خاکی موسڵمانان.

٥- دامەزرانـدنی چـەند کتێبخانەیـەکی ڕۆژهـەڵاتی لـە ئـەورووپا وەك کتێبخانـەی پاریسی نیشتیمانی لە سالی ١٦٥٤ز کە نزیکەی حەوت هـەزار دەستنوسـی عـەرەبی تیـدا بـوو، یـان کتێبخانـەی زانکـۆی ستراسـبۆرگ و کتێبخانـەی خوێندنگـەی نیشتیمانی بۆ زمانە زیندووەکانی ڕۆژهەلات.

٦- دامەزرانـدنی چـاپخانە ڕۆژهەلاتیـەکان وەك چـاپخانەی ئیتالیـاو چـاپخانەی فەرەنسا.

٧- دامەزرانـدنی گۆڤـارە ڕۆژهەڵاتیـەکان کـە ڕۆژهەڵاتناسـەکان هـەوڵی دیـارو بەرچاویان تییانـدا گێـڕاوە وەك ڕۆژنامـەی زانایـان، گۆڤـاری کۆمەڵـەی شانـشینی ئاسـیایی، گۆڤـاری ئـەفریقی، گۆڤـاری مێـژوویی، گۆڤـاری مێـژووی ئاینییەکان،......هتد، هەندێ لەو گۆڤارانە تا ئەمرۆیش بەردەوام دەردەچن.

لە ئەنجامی ئەو کارانەدا بۆ جاری دووەم زۆربەی وڵاتانی موسڵمانان بوون بە داگیرگـەی هاوپەیمانیەتیـەکانی وڵاتـانی ئـەورووپای ڕۆژهـەلاتی و ئـەورووپای ڕۆژئـاوایی دژ بـە دەوڵـەتی خیلافـەتی عوسمـانی تـا ئـەوەی لـەناویان بـرد و بەشێوەیەکی ناشەرعی و نادروست مالوموڵك و خاکیان بەمیرات برد.

*******************

# (ساڵ و ناو)

* ١٥٢٥ز: سەرەتای شۆرشی کۆیلایەتی.

* ١٥٣١ز: یەکەم جەنگی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانت لە سویسرا.

* ١٥٣١ز: پەرلەمانی ئینگلیزی مافی دانانی سەرکردە ئاینیەکانی ناو ئینگلتەرا بە پاشا دەبەخشێت.

* ١٥٥٥ز: بەستنی ڕێککەوتنامەی ئۆکسبرك.

* ١٥٨٩ز: دەرکەوتنی یەکێتی (ئەترخت)کە لە ئەنجامی یەکێتی حەوت هەرێمەوە بوو و دەکەوتە سەر ئاوەرێژگە راین و ئاوەرێژگەی شلت.

* ١٥٩١ز: سەربەخۆیی هۆڵەندا لە ئیسپانیا بە شیوەیەکی ڕەسمی.

* ١٥٩٨ز: مەرسومی(ناتن) کە ماف و پشکی بە پرۆتستانتەکان دەبەخشی.

# (بەشی سییەم)
# ئەوروپا لەسەدەی حەڤدەهەمی زاینیدا
# (١٦٠٠ز-١٧٠٠ز)

## باسی یەکەم:

## جەنگی سی ساڵە

## باسی دووەم:

## شۆڕش لە ئینگلتەرا

## باسی سێیەم:

## پێشکەوتنی فەرەنسا

## باسی چوارەم:

## جەنگی میراتگری ئیسپانی

# (باسی یەکەم)
# (جەنگی سی ساڵە)

ئەوروپا لەسەرەتای ساڵی ١٦١٨ز. ەوە لە تەنگژەیەکی مەترسیداردا دەژیا کە بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو چوویە ناو جەنگێکی قورسەوە کە تیایدا زۆربەی دەوڵـەتانی ئـەوروپای ناوەڕاسـت و ڕۆژئـاوایی تەنانـەت دەوڵـەتانی بـاکووری ئەوروپایش بەشدار بوون، ئەو جەنگە لەبەر چەند هۆکارێکی ئایینی و لە شێوەی شۆڕشـێکدا کـە پرۆتـستانتەکان لـە بوهیمیـا دژ بـە ئیمپراتـۆری کاسـۆلیکی ئەنجامیاندا لە ئەڵمانیا دەستپێکرد.

لە ڕاستیدا ئەمە دژ بە چاوچنۆکی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی نەمساوی بوو کە دەیویـست ئیمپراتۆریـەتی هەڵبـژێردراوی و یـەکێتی ئـەڵمانی بکاتـە دەوڵـەتێکی مەرکـەزی میراتگـری لـە شـێوەی شانـشینی فەرەنـساداو سـەرەتا وەك جـەنگێکی نـاوخۆیی نـاو بەشـەکانی بنەماڵـەی نەمـسا دەسـتیپێکرد، بـەڵام دواتـر بـوو بـە جـەنگێکی ئەڵمانی و پاشان بەربەرە بوو بە جـەنگێکی گشتی ئەوروپی و تیایـدا جگـە لـە دەوڵـەتانی ئـەڵمانیاو نەمـسا هەریـەك لـە دانیمـارك و سـوید و هەرێمـە یەکێتیەکان و ئیسپانیاو فەرەنسا بەشداریانکرد فەڕەنسا لە سـاڵی ١٦٣٥ز ەوە بو بە لایەنێکی کارای ئەو جەنگە.

لەوکاتـەوە سـەرەڕای کێـشەی ئـەڵمانی پەیوەسـت بـە ئـازادی ئـاییینی و ڕێکخـستنی سیاسـی ئیمپراتۆریـەت چـەند کێـشەیەکی دیکـە هاتنـە مەیـدان و پەیوەست بوون بەسەر بەخۆیی هەرێمە یەکێتیەکان و زاڵبوونی سوید لە دەریای بـەلتیق و زاڵبـوونی فەرەنـسا لـە ڕۆژئـاوای ئـەوروپا دا، جـەنگی سـێ سـاڵە بـە قۆناغێکی نوێی ڕکەبەری نێوان فەڕەنسا و بنەماڵەی هابسبۆرگ ململانێی لەگەڵ دوو لقی هەریەك لە نەمساو ئیسپانیادادەنریت، ئەگەر پەیمانامەکانی وستڤالیا لە ساڵی ١٦٤٨ز چارە سەرێکیان دۆزیبێتەوە بۆ زۆربەی ئەو کێشانە دوای جەنگێکی

سێ ساڵەو پرۆژەی گەشە پێدانی نێو ئەڵمانیای لەناو بردبێت و جەنگی دەکردەوە لەسەر بەخۆیی هەرێمە یەکێتیەکان و زاڵبوونی سوید لە باکوورو سەرکەوتنی فەڕەنسا بەسەر بنەماڵەی هابسبۆرگی نەمساویدا کە ناچار بوو واز لە ئەلزاس بهێنێت ئەوا ئەو جەنگە بۆ ماوەی یانزە ساڵی نوێ خۆی لە نێوان فەڕەنسا هۆبسبۆرگ و ئیسپانیادا بینیەوە و لە ساڵی ١٦٥٩ز بەسەرکەوتنێکی نوێی فەڕەنسا کۆتایی پێهات، ئەمە لەگەڵ ڕێککەوتن لەسەر ڕێککەوتنامەی برانس کە (رۆسیلیۆن و ئانوا)ی بەفەرەنسا دەبەخشی.

## هۆکارەکانی جەنگەکە:

ڕێککەوتنی ئۆکزبرگ لەساڵی ١٥٥٥ز دا لەگەل ئەوەی خاڵی لاوازی زۆری هەبوو، ئاشتی بۆ ماوەی زیاتر لە شەست ساڵ بە ئەڵمانیا بەخشی، لەو کاتەدا ژمارەی کالڤنیەکان لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا و ناوچەی ڕایندا زیادیکرد، کاتێك زانیان لەلایە لۆئیەکان و کاسۆلیکیەکانەوە هەڕەشەیان لێدەکریت، لە ساڵانی نێوان ١٦٠٣ز بۆ ١٦٠٨ز دا لەیەکێتی پرۆتستانتیدا خۆیان ڕێکخست، گرنگترین ئەندامانیشی هەڵبژێردراوانی بلاتینەکان و سەرکردەکانی بادن و ورتبۆرگ بوون.

ئەویەکێتیە لەگەڵ پاشای فەڕەنسا و حکومەتی هەرێمە یەکێتەکاندا هاوپەیمانیتیەکی بەست، لە ئەنجامی ئەوەدا کاسۆلیکەکان بەڕێبەری سەرکردەو قەشەکان لە ساڵی دواتر ١٦٠٩ز کۆمەڵەی پیرۆزیان دامەزراند کە ماکسیمیلیانی دۆقی باڤاریا بوو بەسەرکردەی، ئەمانە لەگەڵ ئیسپانیادا دانووستانیان کرد، لەگەڵ ئەمەشدا پرۆتستانتەکان ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخسبوو، هێزی چوارەمی پاشای فەڕەنسا هەوڵیدا لە ئەڵمانیا حیزبێك دابمەزرێت کە بتوانێت لە ڕووی ئیمپراتۆردا بوەستێت.

ئەمەش لە ڕێگەی گەیشتن بەنزیکبوونەوەی نێوان لۆسەری وکالڤنیەکانەوە، بەلاّم لۆسەریەکان بەرپەرچی ئەوەیان دایەوە، بوونی کۆمەڵەی (کاسۆلیکی)و کۆمەڵەی (کالڤنی)و پیکهێنانی سوپا لەلایەن هەرکامیانەوە، هەڕەشە بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگ، مردنی هنری چوارەم لە ساڵی ١٦١٠ز دا هەموو ئەمانە بۆ ماوەی هەشت ساڵ دواخست.

لەبەر چەند هۆکارێکی پەیوەست بە خێزانی فەرمانڕەوای نەمسا و لە ئەنجامی بارودۆخی ئەو خیزانەو سروشتی چاوچنۆکی گەورە ئەندامێکیەوە کە فردیناندی دووەم بوو، جەنگ هەڵگیرسا، ئەو خێزانە سەرەڕای ئەوەی تاجی ئیمپراتۆریەتی هەبوو چەند میرنشینێکی میراتگری هەبوو کە شارلی پێنجەم لە ساڵی ١٥٥٦ز دا بەخشیبووی بە فردیناندی یەکەمی برای، ئەمە سەرەڕای شانشینەکانی بوهیمیاو مەرج کە هی ئەو بوون گەلانی ئەو ناوچانەیش هاورەگەز نەبوون و بەزیاتر لەزمانێك قسەیان دەکرد، خەڵکی میرنشینە میراتگریەکان ئەڵمانی بوون.

لەکاتێکدا چیکەکان لە بوهیمیاو میجارەکان لە مەجەر و ئیتاڵیەکان لە تیرۆل بوون، هەموو هەرێمێك دەوڵەتێکی خاوەنپایتەختی خۆی و سیستمێکی لەخۆ دەگرت کە ئەنجومەنەکانی فەرمانڕەواییان دەکرد، ئیمپڕاتۆر بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و سەرباز بۆ جەنگ پێویستی بە هەموویان هەبوون لێرەشدا پەیوەندیەك نەبوو ئەو ناوچانە یەکبخات جگە لە خودی ئیمپراتۆرو یەکێتی ئایین نەبێت.

دابەشبوونی ماڵوو موڵکیش لە نێوان کوڕانی فردیناندی یەکەم لە لایەك و بڵاوبوونەوەی مەزهەبی پرۆتستانتی لە نەمساو زیاد بوونی ژمارەیان لە دایت و زاڵبوونیان بەسەر زانکۆی ڤیەنناو بڵاوبوونەوەی هەوادارانی گێرانەوەی (تەعمید)لە بوهیمیاو بڵاو بوونەوەی مەزهەبی کالڤنی لەمەجەر لەلایەکی دیکەوە، هەڕەشەبوون بۆ سەر بنەڕەتەکانی دەسەلاتی ئەو کۆمەلە ملکەچانەی دەسەلاتی هابسبۆرگ، و لە خۆگرتنی چەند مەزهەبێکی ئایینی جیاوازیش تا ئاستیکی زۆ خواستی جیا کاری و دەرکەوتنی نەتەوەی ناوچەی نویێ نیشان دەدات.

هەروەها هەوڵیدا دژ بە مەزهەبەکانی چاکسازی کار بکات، بەڵام لە هەر یەك لە بوهیمیاو مەجەردا بەرەو ڕوی بەرنگار بوونەوەیەکی توندبوویەوەو کاسۆلیکیەت بەتەواوەتی دەسەلاتی خۆی بەسەر ئەو دوو هەرێمەدا لە دەستداو هابسبۆرگیش تەنها مافی تاجی ئیمپراتۆرییان هەبوو،ئەمەش ئەو کات بوو کە فردیناندی دووەم لە ساڵی ١٦١٨ز دا چوویە سەر کورسی دەسەلات.

خواست و چاوچنۆکیەکانی ئیمپراتۆر فردیناندی دووەم هۆکاری سەرەکی هەڵگیرساندنی جەنگی سی ساڵەبوون، ئەو کاتێک لە ساڵی ١٦١٨ز دا گەیشتە کورسی ئیمپراتۆریەت تەمەنی چل ساڵان بوو، لەسەر دەستی یەسوعیەکانی باڤاریا پەروەردە ببو، سوور بوو لەسەر ئەوەی ئاراستەکانی ئەوان بە هەموو توانایەکیەوە جێبەجێ بکات،وا سەیری پرۆتستانتەکانی دەکرد کە بە تەواوەتی پەیوەستن بە ڕێبازی شۆڕشەوە،ئەوانەی وا داوای ئازادی بیروباوەڕ دەکەن دەیانەوێت بگەنە دەسەڵاتەکەی.

هەروەها دەیویست لەناوچەی ژێردەسەڵاتیدا هەم بیروباوەر یەکبخات و هەم خودی ناوچەکانیشی یەکبخات، پێی وابوو یەکبوونی بیروباوەر بە تەنها دەتوانیت ڕێبگرێت بەو جیاکاریەی زمان و ڕەگەزو نەریتەکان بنەمای سەرەکی یەکبوونی پێببەخشێت.

فردیناند لە ماوەی بیست ساڵدا کەوتە دژایەتی پرۆتستانتەکان لە هەرێمی ئیستیریا لە نەمساو کڵێساو خوێندنگەکانی داخستن، پاشان خەڵکی ناچار کرد تا لە ماوەیەکی دیاریکراودا بگەڕێتەوە بۆ سەر مەزهەبی کاسۆلیکی یان ناوچەکە بە جێبهێلن، پاش ئەوەی گەیشتە کورسی ئیمپراتۆریەتیش دەیویست ئەوە بەسەر چیکەکانی بوهیمیادا جێبەجێ بکات.

فردیناند فرمانیکرد تا پەرستگا پرۆتستانتیەکانی چیکەکان لە بوهیمیا بڕووخێنن، ئەمە پاڵی بە لۆسەریەکانەوە نا تا لە (براغ)کۆبوونەوە یەك ببەستن بۆ لێکۆلینەوە لەسەر ئەو باسە، کاتێك نوێنەرانی ئیمپڕاتۆر لە ٢٣ی مایۆی ١٦١٨ز دا هەوڵیاندا کۆبوونەوەکە هەڵبوەشێننەوە، ئامادە بووان بیست و چوار کەسیان لە بەرزایی بیست مەترەوە فڕێ دانە ناو خەندەقی دەوری کۆشکەکە یەکێك لەوانەش نزیکیکی ئیمپراتۆر بوو، ئەمە هۆکاری سەرەتای جەنگی سی ساڵە بوو.

********************

# هەڵگیرسانی جەنگەکە:

دوای ئەوە پرۆتستانت و چیکیەکان حکومەتێکی کاتیان ڕێکخست، پاشان لە ڕۆژی ٢٥ ئۆگستی ساڵی ١٦١٩ز دا لەو ڕۆژەی فردیناندی دووەم وەک ئیمپراتۆری ئەڵمانیا هەڵبژێردرا، لادانی فردیناندیان لە کورسی دەسەڵاتی بوهیمیا ڕاگەیاند فریدریکی پێنجەمی هەڵبژێردراوی بلاتینیەکان و سەرۆکی یەکێتی پرۆتستانتیان لە شوێنیدا دانا، فردریک مێردی کچی جیمی یەکەمی پاشای ئینگلتەرا بوون تا ئێرەش کێشەکە تەنها شۆڕشێك بوو کە چیکیەکان دژ بە پاشا ئەنجامیاندا و لە جەنگێکی ناوخۆیی نێو خێزانی هابسبۆرگ تا جەنگی ئەڵمانی زیاتر نەبوو.

هەڵبژاردنی فریدریك وەك پاشای بوهیمیا نائارامی هەموو سەرکردە ئەڵمانەکانی لێکەوتەوە بەتایبەت سەرکردە هەڵبژاردووەکان، فریدریك پێشتر دەنگێك بوو لە هەڵبژاردنی ئیمپراتۆردا دواتر کە وەك پاشای بوهیمیا هەڵبژێردرا دوو دەنگی هەبوو لەبەر ئەوەش کەسەر بە شوێنکەوتوانی کالڤن بوون ئەو زیاد بوونی دەنگ و دەسەڵاتە لۆسەری و کاسۆلیکەکانی بێزار کرد و کاسۆلیکەکان بە پلەیەکی زیاتر دەترسان، چونکە تەنها سێ دەنگیان بۆ ما بوویەوە دژ بە چوار دەنگی پشتیوانانی مەزهەبی پرۆتستانتی، ئەمە هەڕەشەیەك بوو بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکانی دواتردا پرۆتستانتەکان تاجی ئیمپراتۆریەت بەدەستبهێنن.

ئیمپراتۆر سوپایەکی نەبوو تا بتوانیت لەگەڵ فریدریکی پێنجەمدا بجەنگێت، بەڵام کاسۆلیك و لۆسەریەکان یارمەتیاندا و هەڵبژێردراوی ساکس چەند هێزێکی سەربازی بۆ ئامادە کرد، هەروەك دۆقی باڤاریا کە ئامۆزای بوو و سەرۆکی کۆمەڵەی پیرۆزیش بوو سوپایەکی بۆ ئامادە کرد کە لە دۆقیەکەی خۆیدا کۆی کردبوویەوەو تاکە هێزی سەربازی ناو ئەڵمانیای ئەو کات بوو.

فردیناندی دووەم بەو سوپایە توانی چیکە سەنگەرگرتووەکانی بەردەم براغ لە جەنگی شاخی سپی هەشتی نۆڤەمبەری ساڵی ١٦٢٠ز دا تێکبشکێنێت و فریدریکی پێنجەمیش ناچار بوو بەخێرایی مەیدانی جەنگەکە بەجێبهێڵێت و ڕابکات.

فردیناندی دووەم دەستیگرت بەسەر بوهیمیاداو چەند چالاکیەکی کوشت و بڕی ترسناکی تێدا ئەنجامدا و هەموو ئازادیەکانی لەکار خست و ڕایگەیاند ئەو تاجەی کە تا ئەوکات بە هەڵبژاردن بووە لەمەو دوا میراتی ناو خیزانی هابسبۆرگە، سەری بیست و هەشت سەرکردەی شۆڕشی لەیەك ڕۆژدا بڕی، دەستگیرا بەسەر ماڵو خاکی خانەدانەکاندا و هەندێکی بۆ خودی ئیمپراتۆر مایەوە و ئەوی دیکەی بەسەر نزیکان و یاریدەدەرانیدا دابەشکرد، ئەمەش بەنرخێکی زۆر بەرزو گران.

چەند گورزێکی توندیشی ئاڕاستەی خانەدانەکانی چیك کرد و لە شوێنیاندا چەند سەرکێشێکی ئەڵمانی شوێنیان گرتنەوە بەمە ژمارەی دانیشتوانی شارەکان کەمیکرد و زمانی چیکی شار درایەوە و زمانی ئەڵمانی شوێنی گرتەوە زۆربەی جووتیاران بوونەوە بە کۆیلەی زەوی و ژمارەی چیکەکان لە چوارملیۆنەوە دابەزی بۆ یەك ملیۆن و لە مێژوودا بۆ ماوەی نزیکەی دووسەدە دیارنەمان.

جەنگەکە بەمە کۆتایی پێنەهات، بەڵکوو هەریەك لە هەلبژێردراوی ساکس و میری باڤاریا دەیانویست بەرهەمی یارمەتیدانی ئیمپراتۆر بەدەستبهێنن، ئیمپڕاتۆر ناچار بوو قەرەبوو بۆ هەر کام لەو دوانە بکاتەوە، بەڵام لەسەر حسابی پلاتینەکان.

*******************

## * فراوانبوونی جەنگەکە:

پشکی کریسیانی چوارەم لە پشکی فریدریکی پێنجەم باشتر نەبوو، بەڵکوو دوو سوپا هێرشیان بردە سەر، یەکەمیان بەڕێبەری مەکسیمیلیانی میری باڤاریان دووەمیش ئەو سوپایە بوو کە والفشتاینی سەرکێش لە پیناو ئیمپراتۆردا دایمەزراند، ئەو سوپایە بەبێ ئەوەی هیچ خەرجیەکی ئیمپراتۆری لەسەر بێت پێکهات چونکە سوپایەك بوو لەسەر تالان و بڕی دژەیا.

هێزی ئەو سوپایە گەیشتە بیست و دوو هەزار کەس ولە ساڵی ١٦٣٥ز دا دژ بە سوپای پاشای دانیمارك چوویە جەنگەوەو توانی شکستێکی توند تووشی پاشای دانیمارك بکات، لەکاتێکدا سوپای پاشا ڕۆچووبوونە ناو ئەڵمانیا، لەوساڵەدا لەبەردەم سوپای یەکەم و بۆ ساڵی دواتریش سوپای دووەم، ئەو پێی وابوو ناوچەکە هەرەشەی شالاوی لێدەکریت، بۆیە ناچار بوو ڕێککەوتنیك ببەستێت بەناوی ڕێککەوتنی (لۆبیك)کە تیایدا بەڵێنی دا دوای ئەوە بەهیچ شێوەیەك دەستور نەداتە کاروباری ئەڵمانیا.

لەوکاتەدا چاوچنۆکیەکانی فردیناندی دووەم کەوتنە بەرچاو، بە تایبەت ئەوبارەی لەو کاتەدا بەسەر خەڵکەکەیدا زاڵبوو بۆ ڕاگەیاندنی ڕوونی ئامانج چاوچنۆکیەکانی، بەتایبەت کە زاڵبوو بەسەر سوپای والنشتایندان ئەو دەیتوانی دەستبگرێت بەسەر هەموو ئەڵمانیادا، دەیویست پرۆتستانتەکان لەناو ببات، چونکە ئە کاسۆلیکی بوو، هەروەك هەوڵی دەدا دەستوری ئەڵمانیا بگۆڕێت.

فردیناند تا پێش ڕێککەوتنی (لۆبیك)یش فرمانی دەکرد تا هەموو ماڵو موڵکی کلێسا بگێڕنەوە، واتە ئەوەی کە پرۆتستانتەکان لە کلێسای کاسۆلیکیان سەندبوو، کە لە ماڵوموڵکی دوو سەرکردایەتی ئوسقوفەکان ودوانزە ئوسقوفی و سەدو بیست مەترانی پێکدەهات. سوپای والنشتاین دەبوو ئەمە لە هەموو ئەڵمانیادا جێبەجێ بکات و ئەو ڕووبەرە فراوانە بداتە پاڵ ماڵو موڵکی ئیمپراتۆر.

لەهەمان کاتدا دەیویست دەستوری ئەڵمانیا بەجۆریك بگۆڕێت بێتە گەورەی ئەڵمانیا، هەروەك هەر یەك لە پاشای فەڕەنسا و پاشای ئیسپانیا لە ناوچەی دەسەلاتیدا بن. پێویستی بە هیچ لە هەڵبژاردوان و سەرکردەکان نەبێت و ئیمپراتۆریەت بە میراتی لە نەوەکانیدا بهێڵێتەوە، بەو جۆرە خانەدانەکان دەبنە پیاوی کۆشك دوای ئەوەی هەموو مافە هەڵبژاردنیەکانی خۆیان لەدەستدان ئیدی کەوتنە ژێر دەسەلاتی ڕاستەوخۆی ئیمپراتۆرەوەو ئەویش دواتر ئەو میرنشینانەی ئەوانی هەڵدەوەشێنێتەوە کە نزیکەی چوارسەد دانە دەبوون.

ئەو کات لە ناو ئیمپراتۆریەتدا جگە لە خواست و دەسەلاتی ئەو هیچ دەسەلاتێکی دیکە نابێت، پرۆژەکە بەو شێوەیەی هەڕەشەیەکی مەترسیدار بوو بۆ هەر یەك لە فەڕەنساو سوید، بۆ فەڕەنسا چونکە ئەو پرۆژەیە ڕاستەوخۆ هەڕەشەی لێدەکرد، چونکە بەرەبەرە هەستی بەڕاپایەکی توند دەکرد لەوەی ئەڵمانیا و ئیسپانیا بتوانن بگەنە بارێکی یەکێتی سەربازی و لەو ڕوانگەوە بتوانن بەهێزو ماڵو موڵکیان لە ئیتالیاو میلانۆ هەڕەشە لە فەرەنسا بکەن، وەك ئەو بارەی کە لە ماوەی ئیمپراتۆریەتی شارلی پێنجەم و فرانسوای یەکەمدا هەبوو، بۆیە پێوست بوو فەرەنسا لەبەر خزمەتکردن بەبەرژەوەندیخۆی و دەسەلاتداری هەڕەشە لێکراوی بەشداری بکات.

سویدیش ڕاستەوخۆ بەر هەرەشەی ئیمپراۆتر فردیناند دەکەوت، بەتایبەت کە ئەو دەیویست هێزێکی دەریایی دابمەزرێنێت و دەستیشی گرتبوو بەسەر دوو دۆقیەدا کە لەسەر دەریای بەلتیق بوون، سویدیش سەبارەت بە دەریای بەلتیق چەند هیوایەکی هەبوو کە بەتەواوەتی لەگەڵ هیواکانی فردیناندی دووەمدا ناڕاست و دژ بوون.

گۆستاف ئەدۆلفی سەرۆکی سوید سەرمەستی جەنگ بوو، ئەو هەوڵی پێشخستنی تەکنیکی دەدا و سویدی کرد بە قەلایەکی سەربازی کە بەدرێژایی دەریایی بەلتیق ڕوو بە ولاتەکەی درێژ دەبوویەوە، هەروەها دەیویست دەریای بەلتیق بکاتە دەریاچەیەکی سویدی، بەتایبەت کە ولاتەکەی هەژار بوو، ئەو پێی وا بوو داهاتوویشی پەیوەست بە دەریا دەبێت.

هەر کە ئیمپراتۆر فردیناند یارمەتی پاشای پۆڵەندای دا، گۆستاف ئەدۆلف ئەوەی کردە بیانوو تا دەستور بداتە نێو ئەڵمانیا، بەتایبەت کە ریشیلیۆ بەهێزەکانیەوە لە چواری یۆلیۆی ساڵی ١٦٣٠ز دا لەسەر کەناراوەکانی ئەڵمانیا پاڵپشتی دەکردن لەهەمان کاتدا دایت لە (راتیسبۆن)کۆ بوویەوە.

سەرکردە کاسۆلیکەکان لە چاوچنۆکی ئیمپراتۆر دەترسان، ریشیلیۆ کاریگەری لەسەر یان هەبوو، بۆیە داوایان لە ئیمپراتۆر کرد تا لەدەست والنتشاین رزگاریان بێت و ژمارەی سوپای ئیمپراتۆری کەم بکاتەوەو هەڕەشیان لێکرد کە لەجەنگی دژ بە گۆستاف ئەدۆلفدا پشتیگری ناکەن، ئیمپراتۆریش لەساڵی ١٦٣٠ ز دا بە داواکەیان ڕازی بوو و بێ هێز کەوت.

دەستێوەردانی گۆستاف ئەدۆلف خاڵێکی ڕوونی گۆرانی نێو جەنگی سی ساڵە و نیو مێژووی جەنگەکانی ئەورویا نوێ بوون سەرەڕای ئەوەی هێمایەکی جیاکەرەوەی نێو مێژووی نوێی ئەورویا بوو و گۆرانی لە سیستمی سوپاو پرچەککردنی و ڕێکخستنی هێزەکان بەسەر زەوی جەنگ و بەکارهێنانی سیستمی بالاّ لە جیاتی سیستمی قووڵدا ئەنجامدا، سوپاکەی والنشتاین لەگەڵ ئەوەی تاکە سوپای ئەو کاتی ئەڵمانیا بوو، بەلاّم لە بەکرێگیریاوەکان پێکدەهات.

گۆستاف ئەدۆلف گەیشتە ئەڵمانیا تا ببینێت پرۆتستانتەکان توانای براوتیان نیە بەلاّم خێرا بارەکە گۆڕا دوای ئەوەی شادی (مەجد بۆرگ)سووتا و تیایدا سوپای کاسۆلیك تۆمەتبار بەو کارە کرا بەوە جەنگێکی قورس لە (برینیفیلد)بەڕێوە چوو و گۆستاف و سوپای پرۆتستانت توانییان بەسەر کۆمەڵەی کاسۆلیکیدا سەرکەون و نۆ هەزاریان لێ بکوژن، ئەو سەرکەوتنە پاڵی بەگۆستافەوە نا تا بەرەو ڕۆژئاوای ئەڵمانیا پێشڕەوی بکات و هێزەکانی دەستیانگرت بەسەر هەرێمی ڕایناو لەوێ وەرزی زستانیان بردە سەر، دواتر لە بەهاری ساڵی ١٦٣٢ز دا بەرەو باڤاریا کشاو درێژەی بە چالاکیەکانی خۆی دا تا لە حەڤدەی مایۆی هەمان ساڵدا میونخی داگیر کرد.

لەو کاتەدا سەرکردەی هێزەکانی ئیمپراتۆر فردیناند توانی سوپایەکی نوێ پێکبهێنێت و هێرشی بردە سەر هەرێمی ساکسی هاوپەیمانی گۆستاف ئەدۆلف، ئەمە پاڵی بە پاشای سویدەوە نا تا خێرا بچێت بە هانای هاوپەیمانەکەیەوەو لەو ئەنجامەدا لە شانزەی نۆڤەمبەری ساڵی ١٦٣٢ز دا شکستیان خوارد، بەوە سەرکردە پرۆتستانتەکان خێرا لە سی (٣٠)مایۆ ساڵی ١٦٣٥ز دا ڕێککەوتنی (براغ)یان لەگەڵ ئیمپراتۆر دا بەست و جارێکی دی ئیمپراتۆر وەك گەورەی ئەڵمانیا دەرکەوتەوە.

لەو کاتەدا چوویە نێو ئەو جەنگەوە، پاشای فەرەنسا توانی بە کوشتنی دۆق میمۆرنسی کێشە ناوخۆیەکانی خۆی نەهێڵێت و لەگەڵ وەسی کورسی دەسەڵاتی سوید و هەرێمە یەکێتییەکان و چەند سەرکردەیەکی پرۆتستانتی نێو ئەڵمانیاو لەگەڵ سویسریەکان و چەند سەرکردەیەکی ئیتاڵیاو لەو نێوەندەشدا دۆق ساڤوا هاوپەیمانیەتیەکی بەهێز ببەستێت، هەروەك فەرەنسا لەو ماوەیەدا چەند یارمەتیەکی ساڵانەی دارایی دەبەخشی بەهەر هاوپەیمانێك لەو هاوپەیمانانە، بەو جۆرە فەرەنسا بەو یارمەتیە داراییانە دژ بە نەمسا جەنگاو دواتریش لەساڵی ١٦٣٥ز دا جەنگی دژ بە فیلیپی چوارەمی پاشای ئیسپانیا ڕاگەیاند.

لەوکاتەوە کێشەکە تەنها ئازادی ئەڵمانیا نەبوو، بەڵکوو گۆڕا بۆ ململانێی نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەوای فەرەنساو بنەماڵەی فەرمانڕەوای نەمسا، فەرەنسیەکان لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو هەرێمانە یان کە لە ژێر دەستی ئیسپانیادا بوون و بریتیبوون لە(ئارتوا) و (ڕۆسیلیۆن) و (فرانش کونتیە)کەوتنە جەنگەوە، هەروەها جەنگیشیان بۆ ئەلزاس دەکرد کە لە ژێر دەستی نەمسا دا بوو، جگە لەوەی جەنگیشیان دەکرد تا بگەنە (سنوری سروشتی)دەوڵەتەکەیان.

ئەو جەنگە سیانزە ساڵ بەردەوامبوو (١٦٣٥ز-١٦٤٨ز)، جەنگەکە لە چەند مەیدانێکی فراوانی زەوی ئەورووپیدا ڕوویدا، بە تایبەت لە شاخەکانی برانس و فرانش کوتیە و سنوری فەرەنسا لەگەڵ زەویە نزمەکان و ئەلزاس و ئەڵمانیادا،

سەرەتای جەنگەکە بە ململانێی دژ بە ئیسپانیا دەستیپێکرد، کاتێک هێزە نەمساویەکان چوونە ناو بەرگەندیا، هەروەک هێزە ئیسپانیەکان ڕۆچوونە ناو فەڕەنسا، بەڵام فەڕەنسا بۆ ڕێگری لە هێزە شالآو بەرەکان ودەرکردنیان لە سنوری خۆیدا هەوڵێکی گەورەی خستە گەڕ، لەو کاتەوە هێزە فەڕەنسیەکان لەنێو خاکیاندا دەجەنگان، بەڵکوو لە نێو ئەوو زەویانەدا دەجەنگان کە دوای ئەوە داگیریان دەکردن، فەڕەنسیەکان هێرشیان بردە سەر چەندین ناوچەو دەوڵەتی ئەورووپی تا توانییان دەستبگرن بەسەر ئارتوا و ڕۆسیلیۆن دا کە لویسی سیانزەیەم سەرپەرشتی چالاکی گەمارۆدانەکەی دەکرد.

بەڵام لەدەستدانی ئەو دووهەرێمەگوڕوتنی فیلیپی چوارەمیان تێکنەشکاند و لەساڵی ١٦٤٣ و لەوکاتەی لویسی سیانزەهەم مرد، سوپایەکی بەهێزی بیست و هەشت هەزار جەنگاوەری ئامادە کرد و لەزەویە نزمەکانەوە کەوتە هێرش بردنە سەر هەرێمی شەمبانیا وگەمارۆی شاری (ڕۆکروا)ی دا، فەڕەنسایش خێرا بەسەرکردایەتی دۆقی (دانجان) سوپایەکی نارد و لەنۆزدەی مایۆدا هەردوو سوپا بەرەو ڕووی یەك بوونەوەو جەنگێك لە نێوانیاندا ڕوویدا کە بەسەرکەوتنی فەڕەنسیەکان و کوژرانی حەوت هەزار ئیسپانی و گیرانی شەشە هەزار یان کۆتایی پێهات، ئەو جەنگە جەنگێکی زۆر گرنگ بوو کە بەوە زاڵبوونی سەربازی ئیسپانی کۆتایی پێهات و زاڵبوونی سەربازی فەڕەنسی شوێنی گرتەوە.

لەوە بەدوا جەنگەکان چوونە چەند چوارچێوەیەکی نوێی جەنگی دژ بە ئیمپارتۆریەتەوە، جا دوای ئەوەی ئیمپراتۆر دەستیگرتبوو بەسەر سوپای میری ساکسی سەنگەرنشینی بەرەی ڕاستی ڕووباری ڕایندا و دەسەلآتی خۆی بەسەر ئەلزسدا سەپاندبوو، سەرکردە فەڕەنسیەکان بەهاو پەیمانی لەگەڵ سەرکردەکانی سویدا هاوپەیمانیتیەکیان بەست بۆ دژایەتی ئمپیراتۆرو ناچارکردنی ئیمپراتۆر فردیناندی سێیەم بەداخوازی ڕێککەوتن،هێزە فەڕەنسیەکان دەبوو لە ڕۆژئاواوە بکشێن، هێزەکانی سویدیش دەبوو لە باکوورەوە بە بوهیمیادا بکشێن.

بەڵام نەیانتوانی ئەو نەخشانەیان جێبەجێ بکەن و دوا جار لە ساڵی ١٦٤٨ز دا دۆق تورینی فەرەنسی توانی چەند بەشێکی ئەو نەخشەیە بە هێرش بردنە سەر باڤاریاو مارۆ دانی میونخ جێبەجێ بکات، هەروەك سوپای سویدی دەستیگرت بەسەر (براغ)دا، ئەمە ئیمپراتۆر فردیناندی گەمارۆ دراوی پالپێوەنا تا بەبەستنی ڕێککەوتن ڕازی بێت.

ئەڵمانیا لەوکاتەدا نیمچە تێکشکاو و پەراوێز خراو بوو لە چەند تەنگژەیەکی خنکێنەر دا دەژیا، تەنانەت لە ناوچانەشدا کە بێلایەنی خۆیان پاراستبوو جوتیاران ناچار بوون لەئەنجامی کەمی ئاژەڵ و کەمی ژمارەی دانیشتوانی شارە بچووکەکاندا زەوی نەکێڵن یان بەشێوەیەکی کەم خۆیان زەویەکە بکێڵن.

*********************

# سەردەمی پەیمانەکان

بانگەشەکانی ڕێککەوتن و ئاشتی لە هەموو بۆنەیکدا دەخرانە ڕوو، بەردەوام بانگەوازێك بۆ لایەنە ململانێکارەکاك هەبوو تا ئاشتی و سەقامگیری بگرنەبەر، لەوانە ئەو بانگەوازانەی پاپا و شاری بوندوقیە دەیانکردن، یەکەم بانگەوازی ئاشتی و ڕێککەوتنیش لەساڵی ١٦٣٦ز دا بوو،بەڵام هەموو ئەو بانگەوازانە نەبوونە هۆی ئەوەی ئەنجامێکی باشی بەرچاویان هەبێت.

لەساڵی ١٦٤٤ز دا کۆنگرەیەکی گەورە بەسترا کە نوێنەرانی سوید و فەرەنسا و ئیمپراتۆری نەمسا و پاشایانی دانیمارك و ئیسپانیا و هەرێمە یەکێتیەکان و سەرکردەکانی ئەڵمانیاو نوینەرانی پاپا و بوندوقیەشی لەخۆ دەگرت ئەو کۆنگرەیە دواتر بەڕێککەوتنی وستڤالیا ناسران لەو کۆنگرەدا فەرەنسا توانی زمانی فەرەنسی وەك زمانێکی ڕەسمی هەڵسوکەوتی دیبلۆماسی ناو هەموو ئەورووپا لە جیاتی زمانی لاتینی زاڵی ئەو کات بۆ وتویژی نێوان باڵوێزان و نوێنەرە دیبلۆماسیەکان بسەپێنێت.

هەروەك پەیماننامەی وستڤالیا کێشە ئاینیەکانی نێو ئەڵمانیاو باسو خواسی سیاسی ئەڵمانی و ئاشتی ئەورووپیشی یەکلا کردەوە سەبارەت بە کاروباری ئایینی ئەڵمانی پەیماننامەکە دانی نا بە بوونی کالڤنی لە پاڵ لۆفەریەت لە ئەڵمانیاداو بەو پێیە سەرکردەکان مافیان هەبوو مەزهەبی خۆیان بەسەر هاولاتیاندا بسەپێنن، ئەم مافەش لەلایەن ئەو پەیماننامەیەوە بۆیان پارێزرا بوو.

سەبارەت بەکاروباری سیاسی ئەڵمانیا پەیماننامەکە دانی نا بەو دەستورە کۆنەدا کە لەسەردەمی پێشوودا زاڵبوون دواجار تاجی ئیمپراتۆری مایەوە کەبە هەڵبژاردی نێوان پاشاکان دەگوازرایەوە،هەروەك پەیماننامەکە ژمارەی سەرکردەهەڵبژێردراوەکانی بۆ هەشت سەرکردە زیاد کرد و هەرهەڵبژێردراوێك سەربەخۆیی تەواوی لەهەرێمی خۆیدا هەبوو و ئیمپراتۆر بۆی نەبوو بە هیچ شێوەیەك دەست وەر بداتە کاروباری، هەروەها بەستنی هاوپەیمانی دایە دەستی بەو جۆرەی کە بیەوێت بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای ئیمپراتۆر هاوپەیمانی ببەستیت، بەڵام بەو مەرجەی هاوپەیمانێتیەکانی دژ بە ئیمپراتۆر نەبن.

دایتـیش دەسـەڵاتی سـەبارەت بـە ڕاگەیانـدنی جـەنگ و بەسـتنی ڕێککـەوتن بواری سوپاو دانی باجی هەبوو، ئیدی ئیمپراتۆر تەنها نازناوی هـەبوو و بـەس، بۆ لـەناو بردنـی تـەواوی دەسـەڵاتەکانی ئیمپراتـۆریش دەستوری ئـەڵمانی خرایـە ژێـر زامنـی هـەموو ئـەو دەوڵەتانـەی پەیمانەکـەیان ئیمزا کردبوو، ئەمە مافی دەستوەر دانە کاروباری ناوخۆیی و دەرەکی بەهەریەك لە فەرەنسا و سوید بەخشی.

سەبارەت بە کاروباری ئەورووپیش ئەوا پاشای سوید بەپێی ئەو پەیماننامەیە هەرێمـەکانی بـریمن و بـۆ میرانیـان ڕۆژئـاوای کەوتـە دەسـت و مـافی هـەبوو لـە کۆبوونـەوەکانی دایتـی ئـەڵمانی شارو هەرێمـەکانی سـەر بـە دەسـەڵاتیدا بەشداری بکات، فەرەنسایش بە پێی پەیمانەکە دانان بەدەسەڵاتی بەسەر سێ ئوسقوفەکەدا بەدەستهێنا، هەروەك ئەلزاسیشی بەدەستهێنا.

بەهـەر حـاڵ پەیماننامـەی وسـتڤالیا یەکـەم پەیماننامـەی ئـەورووپی بـوو کـە هەوڵیـدا هاوسـەنگیەکی نێودەوڵـەتی لـە نێـو هـەموو ئـەورووپادا بەدەسـتبهێنێت، بەشێوەیەکیش بێت کە نەبێتە هۆی ئەوەی هیچ دەوڵەتێك هەڕەشە لەسەر بەخۆیی دراوسـێکەی بکـات، هـەموو سیاسـەتمەدارانی ئـەورووپا و بەتایبـەت فەڕەنسیەکان هەوڵیانـدا، ئـەو پەیماننامەیـە وەك بنـەڕەتێك بـۆ پەیوەندیـە نێودەوڵەتیـەکانیان بپارێزن، ئەمەش تا شۆڕشی فەڕەنسی مایەوە، پێویستە ئەوەش لـە بیر نەکـەین کە ئەو پەیماننامەیە ڕێی نەدەدا بە هیچ هەوڵێکی یەکخستنی ئیمپڕاتۆریـەت و زامنـی بەردەوامبوونی لاوازی ئیمپڕاتۆریـەت و ئـەڵمانیایش بـوو کـە بـۆ مـاوەی دووسـەدە بەردەوام بوو.

ڕاوێژکارە ئیسپانیەکان پاش ئەوەی بڕیاریاندا هۆڵەندیەکان لە جیاتی ئـەوان ئیمـزای پەیماننامەکـە بکـەن لـە کۆنگرەکـە کـشانەوە، ئـەو پەیمانـە دانـی نـا بەسـەربەخۆیی تـەواوی هەرێمـە یەکێتیەکانـدا، لەهۆڵەنـدایش ڕێککـەوتن کـرا تـا ئازادی هەڵسوکەوتکرن بـەهێزەکانی فیلیپ بدرێت بـە فیلیپـی چـوارەم، ئەمـە لـە ڕاستیدا هیوای پێبەخشی بۆ گێڕانەوەی ئەرتوا لەدەست فەڕەنسا.

پەیوەندیەکانی نێوان فەرەنساو ئیسپانیایش بە بێ یەکلاکردنەوە مانەوە، بە تایبەت کە فەرەنسا جەنگی (فردوند)ی بەخۆوە بینی، ئەمە ئیسپانیای هاندا تا لە جەنگی دژ بە فەرەنسادا بەردەوام بێت.

جەنگی نێوان ئەو دوانە دوانزە ساڵی دیکەی خایاند و تیایدا ئیسپانیا لە ساڵی (١٦٥١ز) ەوە لەگەڵ ڕاپەڕیوی کوندیە دا هاوپەیمانی بەست،لە ساڵی ١٦٥٨ز.یشدا پەیمانی مەزرانی دژبەئینگلیزکە دەستبەرداری بەندەری دەنکرن دەبوو بۆیان، چونکە ئەو کات لە دەست ئیسپانیەکاندا بوون ئەمە وای لە کرومیۆیل کرد تا سوپایەکی شەش هەزار سەربازی بنێرێت بۆ یارمەتیدانی سوپای فەرەنسی لە جەنگی دژ بە ئیسپانیەکاندا و توانیان لە نزیك (دنكرن)بەسەر ئیسپانەکاندا سەرکەون و سوپای فەرەنسی دەستی بەسەردا گرت و دواتر دایە دەست ئینگلیز.

پاشای ئیسپانیا هەستیکرد خاك و سوپاکەی شکستی خواردووە، بۆیە پەنای بردە بەر ڕازیبوون بەچوونە نێو دانووستانەوە و ئەو پەیمانەی بەست کە لە حەوتی نۆڤەمبەری ساڵی ١٦٥١ز لە نێوان ئیسپانیاو فەرەنسادا بەستراو دواتر بە ڕێککەوتنی (برانس)ناسراو تیایدا فەرەنسا رۆسیلۆنی لە باشور و ئاتوای لە باکور و چەند پێگەیەکی ڤلاند و هەرێمی لۆکسمبۆرگی دەستکەوت.

هەروەك بەو پێیە لویسی چواردەیەم لەگەڵ ماریا تریزای کچە گەورەی ئیلیپی چوارەمدا هاوسەرگیری کرد و پەیمانەکەش بۆ ماوەی پەنجا ساڵ ئیشی پێ کرا، بەو جۆرە بنەماڵەی فەرمانڕەوای فەرەنسا بە شێوەیەکی تەواو سەرکەوت بەسەر بنەماڵەی هابسبۆرگی نەمساویدا و ڕووبەری فەرەنسایش سێ هەرێمی نوێی بۆ زیاد بوو کە بریتیبوون لە (ئەلزاس، ئارتوا، رۆسیلۆن) دواتر فەرەنسا بەهۆی ئەوەوە لە ساڵی ١٦٥٩ز دا بوو بە تاکە هێزی زاڵی نێو ڕۆژئاوای ئەورویا.

*********************

# باسی دووەم

## (شۆڕش لە ئینگلتەرا)

مێژووی ئینگلتەرا لە سەدەی حەڤدەهەمدا دوو شۆڕشی تیدا هەڵگیرساوە، یەکەمیان لە ساڵی ١٦٤٨ز دا دووەمیش لە ساڵی ١٦٨٨ز دا، ئەو دوو شۆرشەش دەرەنجامی ئەو تەنگژە دوورو درێژە بوو کە پاشایانی بنەماڵەی ستیوارت نایانەوە، ئەو بنەماڵەیە دوای بنەماڵەی تیۆدۆر فەرمانڕەواییان کرد و هەوڵیاندا ئازادیە تەقلیدیەکانی ناو ئینگلتەرا لەناو ببەن و سیستمی پاشایەتی دەسەڵات سنوردار بگۆڕن بۆ پاشایەتیەکی ڕەها.

تەنگژەی یەکەم لە سەردەمی جیمسی یەکەمدا (١٦٠٣ز-١٦٢٥ز)دەستیپێکرد، بەڵام کۆتا قۆناغی لە ساڵی ١٦٤٢ز بۆ ساڵی ١٦٤٨ز لە سەردەمی شارلی یەکەمدا (١٦٢٥ز-١٦٤٩ز)دا ڕوویدا، ئەو قۆناغە قۆناغی جەنگی ناوخۆیی بوو و بەشکستی شا لە ساڵی ١٦٤٨ز و جێبەجێکردنی یاسای لە سێدارەدانی کۆتایی پێهات و لە بەرژەوەندی کرۆمۆیلی دیکتاتۆری سەربازیدا کۆمار ڕاگەیەنرا و تامردنی (١٦٥٢ز-١٦٥٨ز) ئەو دەسەڵاتەی پاراست، دوای گەڕانەوەی بنەماڵەی ستیوارت بۆ دەسەڵات بۆ جاری دووەم لەساڵی ١٦٨٨ز دا تەنگژەیەکی بچووک هەڵگیرسا.

ئینگلتەرا شانشینێکی میراتگری بوو و پاشایەتیەکی ڕەهای وەك فەڕەنسا نەبوو تا خواستەکانی پاشاکانی بە یاسادابنرێن، چونکە (سەردەمی گەورە)کەسێ سەدەو نیوی بوو وایکرد نوێنەرانی وڵات لەگەڵ پاشادا بەشداری دەسەڵاتی وڵات بن، ئەمەش بە ئەنجومەنی لۆردات و ئەنجومەنی گشتی، ئەو پەرلەمانە دەبوو هەموو ساڵێك جارێك کۆببێتەوەو پاشا بواری یاسادانان و سەپاندنی باج یان وەك ناونانی خۆیان(هاریکاری)پێویستی بەهاریکاری هەبوون حکومەت بۆی نەبوو بەبێ بڕیاردانی پەرلەمان باج کۆ بکاتەوە.

دواجار پەرلەمان مافی هەبوو پاشا بە هەستی خەڵك بەرامبەر سیستمی دەسەڵات و کارگێڕی و تەنانەت کاروباری دەرەکیش بناسێنێت، بەو جۆرە پاشایەتی چەند مافێك و گەلیش چەندمافێکی هەبوون، هەڵسوکەوتەکانی پاشایانیش بەتایبەت هنری هەشتەم لەکاتی سەدەی شانزەهەمدا مافی گەلی وەلا دەنا، بەلآم زیاد بوونی سامان لەسەردەمی ئیلیزابێتدا بۆرجوازیەتی والێکرد کە زیاتر حەزی بەکارگێڕی کاروباری وڵات هەبێت، بەشێوەیەك چەند زامنێکی دژ بە خۆسەپێنی پاشایەتییان پێبەخشێت.

باری ئاینیش زیاتر پێچ و پەنای وەرگرت و ئەمەش لە ئەنجامی بوونی دوو بزووتنەوەی چاکسازی ئاینیدا بوون یەکەم ئەنگلیکانی کەبە ئاڕاستەی هنری هەشتەم و ئیلیزابێت بوون دووەمیش برسیناری یان بیۆریتانی کە کاریگەر بوو بە ئەزموونی سکۆتدنداو ئاراستەی کالڤنی، کاسۆلیکیەت هێشتا بەدەر لە بوونی ئاراستەی چوارەم کە ئاڕاستەی سەربەخۆخوازان بوو، سەربەخۆ خوازان دەیانویست بگەنە چاکسازی یەکی قووڵتر.

سەرەڕای ئەو بارە سیاسیەو ئاینیە، پاشایانی بنەماڵەی ستیوارت بەدرێژایی سەدەی حەڤدەهەم کاریان دەکرد بۆ لەناو بردنی مافەکانی گەل و دەسەلآتداری وڵات بەبێ پەرلەمان و سەپاندن و کۆکردنەوەی باج بە خواستی خۆیان و ئاراستە کردنی سیاسەتی دەرەکی بەپێی خواستی خۆیان، هەروەك بڕیاریاندا مەزهەبی ئەنگلیکانی بلاو بکەنەوەو دەسەلآتی پیاوانی ئایینی بەجۆریك بپارێزن کە دەسەلآتی ئاینیان بەسەر هاولآتیاندا هەبێت و لەهەمان کاتدا کە پاشان پاپاش بن.

کاتێك ئیلیزابێتی کۆتا پاشای بنەماڵەی تیۆدۆر مرد، تاجی پاشایەتی لە ساڵی ١٦٠٣ز دا گوازرایەوە بۆ جیمسی شەشەمی کوڕی ماری ستیوارتی ئامۆزای لەسێدارە دراوی، جیمس پاشای سکۆتلندا بوو بەناوی جیمسی یەکەمەوە بوو بە پاشای ئینگلتەراو بوو بە یەکەم پاشای بنەماڵەی ستیوارت لە ئینگلتەرا.

بەوجۆرە تاجی ئینگلتەراو تاجی سکۆتلەندایش خرانە سەری یەك پاشا،ئەگەر چی هەر دەوڵەتیك لەوانە قەوارەو کەسایەتی خۆی هێشتەوە، جیمس ئەوکات تەمەنی سی و حەوت ساڵ بوو، بڕوای وابوو پاشایان دەسەلاتیان لە خواوە وەرگرتوەو بۆکەسانی دی نیە، بەمە دەسەلاتیان ڕەها دەبێت، سەرەڕای ئەوەی کاسۆلیکی بوون بەلام پەروەردەیەکی برسیتاری یان بیۆریتانی هەبوو و لە ساڵەکانی سەرەتا دەسەلاتی دا شەش هەزار کاسۆلیکی لەناوبرد.

ئەمەش هۆکاریك بوو بۆ (پیلانی باروود) کە تیایدا پیلانگێڕان برامیلی بارودیان بە تەواوەتی لەناو پەرلەماندا دانا تا بەتەواوەتی پاشا لەگەل کەسانی ئەوێدا بڕوخێنن، ئەمەش لەساڵی ١٦٠٥ز دا بوو، لەلایەکی دیکەشەوە کاسۆلیکەکان بۆ ماوەی دوو سەدە تا ساڵی ١٨٢٩ز لە دەرەوەی یاسا بوون و مافیان نەبوو پایەکانی دەسەلات وەربگرن لەگەل ئەوەی جیمس بیۆریتانەکانی دەچەوساندنەوە، بەلام لەچەوساندنەوەی کاسۆلیکەکان کەمتر بوو.

بەلام لەگەڵ ئەوەی لە سەر دەستی ئەوان پەروەردە ببوو کەچی دەیچەوساندنەوەو هەڕەشەی دەکرد کە لەولاتدا دەریان دەکات، لەسەردەمی ئەودا ژمارەیەکی زۆریان بەزەریای ئەتلەسیدا کۆچیانکردو لەسەر کەناراوی رۆژهەلاتی ئەمریکای باکوور چەندین داگیرگەیان دامەزراند، بەو جۆرە لە ئەنجامی ئەو چەوساندنەوە ئاینیەدا هێزی دەرەکی ئینگلتەرا زیادی کرد دواتریش داگیرگە یەکەمینەکانی رێی زەریای ئەتڵەسی بەشدار بوون لە دامەزراندنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

سەرەڕای ئەم ئاڕاستە ئاینییە، هەڵوێستی جیمیسی یەکەم بەرامبەر بە پەرلەمان دێت تا بەو هۆیەوە زیاتر لیی تووڕە بن، ئەو پێی وابوو مافی نوێنەران لەلایەن پاشاوە دەدرێت و هەوڵیدا پەرلەمان هەلبووەشێنێتەوەو بەستنی پەرلەمان پشتگوێ بخات تا ئەوەی بۆ ماوەی حەوت ساڵی بەردەوام (١٦١٤ز-١٦٢١ز)پەرلەمان دانەنیشێت، بەلام هەوڵینەدا بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان باج

بسەپێنێت، ئەمە وایکرد نەتوانێت لەدەرەوە کار بکات، بەشێوەیەك حکومەتەکەی خەسڵەتی لاوازی وەرگرت، بەتایبەت لە دوای سەردەمی ئیلیزابێت، پرۆژەی هاوسەرگیری جێگیر لەگەڵ ژنە سەرکردەیەکی کاسۆلیکی و ئیسپانیدا کە خوشکی ماری نەمساوی شاژنی فەرەنسا بوو، پاشان دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ شاژنێکی دیکەی کاسۆلیکیدا کە هنریتی فەرەنسی خوشکی لویسی سیانزەیەم بوو تا ماوەکەی تری ژیانی لەخۆشەویستی گەلدا بۆی بباتە سەر و بێتە هۆی سوور بوونی نوێنەرانی گەل لەسەر پاراستنی مافەکانی گەل بەرامبەر بەو.

دوای ئەو شارلی یەکەم لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا چوویە سەر دەسەڵات و لەمەسەلەی دەسەلاتی رەهادا هەمان بیروڕاکانی باوکی هەبوو و خۆی بە پەیوەستی هیچ پەیمانێك نەدەزانی کە گەل و پەرلەمان دایدەنێن، بۆیە خێرا خەڵك لێی بێزرابوو.

جا دوای ئەوەی هنریتی فەرەنسی بە هاوسەرگرتن لە پال خۆیدا دۆقی بەکنگهامی بەرپرسی شۆرشی گەورە چالاکی چەوساندنەوەی بیۆریتانیەکان و پشتگوێ خستنی پەرلەمانی درێژە پێدا سەرەڕای ئەوەی چەند قەرزێکی بەزۆری سەپاند، هەوڵیدا لە رێگەی راگەیاندنی جەنگی دژ بە فەرەنساو یارمەتیدانی پرۆتستانتە فەرەنسیەکانی لاڕۆشیلەوە رەزامەندی گەل بەدەستبهێنێت.

بەلام کەشتیگەلەکەی شکستیخوارد، بۆیە پەرلەمانی کۆکردەوەو داوای چەند باجێکی نوێی لێکردن، نوێنەران رازی نەبوون (یارمەتی)قبوول بکەن مەگەر مافەکانی ئەوان پێش بخات، بەلام پاشا لەساڵی دواتردا ١٦٢٥ز پەرلەمانی هەڵوەشاندنەوە و هەوڵیدا پەیرەوی دەسەلاتی رەها بکات.

ئەزموونی دەسەلاتی رەها بۆ ماوەی یانزە ساڵ بەردەوامبوو تیایدا پەرلەمان کۆ نەبوویەوەو پاشاو یاریدەدەرەکانی هەوڵیاندا هەموو ئینگلیز ببنە نێو مەزهەبی ئەنگلیکانیەوە، هەروەك کەوتنە سەپاندنی چەند باجێکی توند و قورس و چەند قۆرخکاریەکیان بەسەر زۆربەی کالا پێویستیەکاندا داناو چەند دادگایەکی نائاساییان بەکارهێنا بۆ چالاکی بەرگریکاری سیاسی و ئایینی یاساکانیشی توند و سووکایەتی پێکردبوون.

هەموو ئەمانە بوونە هۆی زیاد بوونی کۆچکردن بۆ ئەمریکا، لێرەدا باجێك هەبوو کە لە بەندەرەکاندا و لەکاتی جەنگدا بۆ کەشتیەکان بەکار دەهات، شارلی یەکەم هەوڵیدا بە شێوەیەکی بەردەوام کۆی بکاتەوە تا بۆ دامەزراندنی سوپایەك بۆ خۆی یارمەتی بدات، بۆیە مەرجەکانی بەڵێنی گەورەی هەڵوەشاندەوە.

لەسکۆتلەندا لە ئەنجامی هەوڵێکی خۆسەپێنیدا شۆرش لە سکۆتلەندا هەڵگیرسا، ئەو شۆڕشە برستاری یان بۆریتانی بوو لەسەر وەرگرتنی مەزهەبی ئەنگلیکانی بوو لەساڵی ١٦٣٧ز دا بەڵێنێکیان داناو دواتر بۆ ساڵی دواتر سوپایەکیان پێکهێنا و بۆ ساڵی دواتر کەوتنە هێرشبردنە سەر باکووری ئینگلتەرا.

سەرەڕای یەککگرتنی سکۆتلەنداو ئینگلتەرا لە ژێر دەسەلاتی شادا، بەلام شارلی یەکەم بەهەمان یاریدەدەرانی خۆیەوە فەرمانڕەوایی دەکرد، کاتێك شا بەرەو ڕووی ئەو شۆڕش و هێرشە بوویەوە سوپای لەبەردەستدا نەبوو و خەرجیشی نەبوو بۆ سوپاکەی.

بۆیە ناچار بوو دوای دووساڵ ڕاڕایی لەساڵی ١٦٤٠ز دا پەرلەمان کۆ بکاتەوە و پێش مشتومڕی (معونە) نوێنەران سوور بوون لەسەر داخوازی جێبەجێکردنی سکالأکانی گەل و جێبەجێکردنی ئەو بەڵینانەی کە شا لەسەر خۆی دانا بوون بۆیە شا پاش سێ هەفتە پەرلەمانی تەمەن کورتی هەڵوەشاندنەوە، ئەگەر یاریدەدەرانی شا توانیان خێرا سوپاکەیان کۆ بکەنەوە، بەلأم لەبەردەم سکۆتلەندیەکاندا شکستیان خوراد، ئەمە شای ناچار کرد تا سەر لە نوێ پەرلەمان کۆ بکاتەوە، ئەمەیان پەرلەمانی درێژ خایەن بوو.

کۆ بوونەوەی ئەو پەرلەمانە سیانزە ساڵ بوو(١٦٤٠ز-١٦٥٣ز)سووریش بوو لەسەر کۆتایهێنان بەپەیڕەوی دەسەلأتی خۆسەپێنی شا، ئەو پەرلەمانە لەژێر کاریگەری بیم دا بوو بۆیە بەرەو شۆڕش پالی پێوە ناو بەوە پەرلەمان توانی ستافۆردی بالی ڕاستی شا دادگایی بکات و لە ساڵی ١٦٤١ز دا لە سێدارەی بدات بەبێ ئەوەی شا بتوانێت ڕزگاری بکات هەروەك (لۆد)ی وەزیریشیان گرت و دوای چواردە ساڵ لەسێدارە درا.

دوای ئاراستە کردنی ئەو گورزە بۆ وەزیرەکان، ئەندامانی ئەنجومەنی گشتی کەوتنە هەوڵی ڕاوکردنی خودی شاو ڕایانگەیاند شا ناتوانێت بەبێ خواستی پەرلەمان ئەنجومەنەکەیان هەلبوەشێنێتەوە بەدوای ئەوەشدا شۆڕش لە ئیرلەندا هەڵیگرساو هەزاران پرۆتستانت کوژران.

پەرلەمان هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشەی بۆ ئاراستەو بڕیاری شا گێڕایەوەو بلاوکراوەیەکی پێ ڕاگەیاند سەبارەت بە هەموو خراپە کاریەکانی و بڕیاریدا نابێت بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان هیچ سوپایەك کۆ بکاتەوەو پێویستە پێش دیاریکردنی ئەفسەران راوێژیان پێبکرێت شا شارل هەوڵیدا کودەتایەك ئەنجام بدات.

بۆیە چوو بۆ پەرلەمان تا بیم و سەرکردە نەیارەکانی دیکەی دەسەڵاتی ڕەها لەناو ببات بەڵام درەنگ گەیشت و ڕای گشتی لە لەندن دژ بە شا ڕاپەری و شایش ناچار بوو پایتەخت بەجێبهێڵێت.

*******************

# جەنگی ناوخۆیی

هەموو شتێك بەرەو جەنگی ناوخۆیی دەچوو، پاشا پشتی بە ئەنگلیکانەکان و کاسۆلیکەکان و چەند سەرکردەیەك دەبەست، پشتی بەستبوو بەناوچەکانی باکوور و ڕۆژئاوا، بۆ پەرلەمانیش پشتی بەستبوو بە ڕۆژهەلات و باشووری ئینگلتەرا، پالپشتی بۆرجوازیەکان و پیاوانی پیشەسازی و هاوپەیمانی ببەستێت، پەرلەمانیش چوویە چەند دانوستانێك لەگەڵ سکۆتلەنداو لەسالی ١٦٤٣ز دا ئینگلتەرا چوویە ناو بەلێنەکەو ئینگلیز و سکۆتلەندیەکان بەلێنیان دا وەك براو پەیوەست بەیەك دژ بە ئاراستەی پاپەوی و لە پێناو بەرگریکردن لەمافەکانی پەرلەمان و ئازادیە نیشتیمانیەکاندا بە یەکێتی هەردوو شانشین لە هاوپەیمانێتیەکی بەهێزدا بژین.

جەنگی ناوخۆ سالێك پێش ئیمزا کردنی ئەو پەیماننامە سیاسی و ئاینیە هەلگیرساو ماوە سێ ساڵ بەردەوامبوون هێزەکانی پاشا کە بە سوارەکان ناسرابوون توانیان چەند سەرکەوتنێکی سەرەتایی بەدەستبهێنن، بە تایبەت کە سوپای پەرلەمان ڕێکخراو نەبوون بەلاّم کرۆمۆیل هەولیدا ئەو بارودۆخە بگۆڕێت و لەسەرتای سالی ١٦٤٤ز وە سوپایەکی نوێی پێکهێنا،

ئۆلیڤەر کرۆمۆیل ئەندامێکی ئەنجومەنی گشتی بوو، بۆیە کەوتە کۆکردنەوەی دەستەیەکی پیاوانی لە خوا ترسی مەزهەبی سەر بەخۆ خوازان، جەنگەکە سەبارەت بەوان جەنگێکی پیرۆز بوون بەرز بونەوەش بۆ پلەی ئەفسەر لە سەر بنەمای لێهاتوویی و دلێری بوو، ئەو دەستەیە بوو بە بنەڕەتی سوپای نوێ.

بە تایبەت دوای ئەوەی پەرلەمان بڕیاریدا هەموو سوپا لەسەر ئەو بنەڕەتە ڕێکبخاتەوەو کرومویل توانی شکستێکی توند دوچاری سوپای شا بکات، ئەمەش لە چواردەی یۆنیۆی سالی ١٦٤٥ز و لە نازبی داڕوویدا، شا بۆ ماوەی سالێك و بەبێ ئەملا و لا هەولیدا سوپایەکی نوێ پیکبهێنێت، پاشان چوو بۆ سەربازگەی سکۆتلەندیەکان.

ئەو بڕوای وابوو ئەو سوپایە لە ڕیزەکانیدا ڕادەوەستن، بەلاّم ئەوان داوایان لێکرد بچێتە ناو بەڵێنەکەوە، کاتێك شا بەوە ڕازی نەبوو، شایان دایە دەست ئینگلیز بەرامبەر بە بڕێك پارە کە دەگەیشتە چوارملیۆن جونەیە، بەمە جەنگی ناوخۆ کۆتایی پێ هات.

شا لەبەندیخانە دا مایەوەو ناکۆکی لە نێوان پەرلەمان و سوپادا هەڵگیرسا، زۆربەی ئەندامانی پەرلەمان لە بیۆریتانەکان بوون، لەکاتێکدا سوپا لەسەربەخۆکان بوو. بیۆریتانەکان دەیانویست سەربەخۆکان ببەنە ناو مەزهەبی برسبیتاریەوە، لەکاتێکدا سەربەخۆکان دەیانویست دەسەلاّتی لێکبوردن تەنانەت بۆ کاسۆلیکەکانیش هەبێت، ئەندامانی پەرلەمان پێیان وابوو بەرژەوەندییان لەوەدایە سوپا هەڵبوەشێتەوەو دەسەلاّتە نوێکەی لەناو ببرێت.

شا سوودی لەو ناکۆکە وەرگرت چەند دانوستانێك لە نێوان پەرلەمان و شادا لەسەر بنەمای وەرگرتنی مەزهەبی بیۆریتانی و گەڕاندنەوەی بۆ دەسەلاّت ئەنجامدرا، لەلایەکی دیکەوە دانوستانی نێوان شاو ئەنجومەنی پێکهاتوو لە ئەنجامی هەڵبژاردنی دووکەس لە هەموو کەتیبەیەکی سوپا لەسەر بنەمای زامنی لێکبوردن و بەجێهێشتنی بواری دیاریکردنی ئەفسەرانی سوپا بۆ ماوەی دەسال لەدەست پەرلەمان ئەنجامدرا.

شا لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدا پەرلەمان و سوپا پێکدا بدات، ئەمە لە کاتێکدا هەوڵیدا جەنگی ناوخۆیی هەڵبگیرسێنێت و پشتی بەست بەسکۆتلەندیەکان و چەند بزوتنەوەیەکی شارەکان، بەلاّم کرۆمۆیل توانی لەو بزووتنەوانە بدات و (ئەدنبرە) داگیر بکات.

شا هەوڵیدا ڕابکات بۆ دوورگەی (وایت) و لەوێ دەستی بەسەر داگیراو دەستگیرا بەسەر چەند وتارێکی ئاینخوازیدا، بۆیە سوپا بڕیاریاندا سزای بدەن و داوای لە پەرلەمان کرد تا دادگایی بکرێت، بەلاّم پەرلەمان لەگەل شادا ڕێککەوت، بۆیە ئەفسەران کودەتایەکیان ئەنجامداو بەدەرکردنی سەد و چل نوێنەری

یاریدەدەرانی شارلی یەکەم لە ساڵی ١٦٤٨ز داپەرلەمان پاکتاو بکەن و ئەوانی دیکەش کە کەمینە بوون ناچار بوون بەدادگایی کردنی شارازی بن و دادگایی کردنەکەش نۆ رۆژی خایاند و ئەویش ئامادەی وەڵام دانەوە نەبوون بۆیە لە ڕۆژی نۆی فبرایەری ساڵی ١٧٤٩ز دا لەسێدارە درا.

*******************

# کۆمار

پاش لە سێدارەدانی پاشا، پەرلەمانی خاوەن ئەندامی کەم ڕایگەیاند کە گەل خاوەن دەسەڵاتەو سیستمی پاشایەتی لەکارخست و سیستمی کۆماری ڕاگەیاند، هەروەها ئەنجومەنی لۆرداتی لەکار خست، حکومەت لە ئەنجومەنی گشتی پێکدەهات لەگەل ئەنجومەنی دەوڵەتدا کە چل ئەندامی لە خۆ دەگرت و لەلایەن ئەنجومەنی گشتیەوە هەڵدەبژێردران و دەسەڵاتی جێبەجیکردنیان هەبوو.

کرۆمۆیل بوو بە ئەندامی نێو ئەنجومەنی دەوڵەت، ئەو سیستمە ماوەی چوار ساڵ بەردەوام بوو، لەسەردەمی ئەودا هەڵمەتێك بەرەو ئیرلەندا نێردراو دژ بە سکۆتلەندیەکان جەنگ ئەنجام درا، هەروەها یاسای دەریاوانی دەرچوو و جەنگی دژ بە هۆلەندایش پەیرەو کرا.

شالاوی دژ بە ئیرلەندایش سەر بە هەڵگیرسانی شۆڕشی ساڵی ١٦٤١ز ئەوێ بوو، کرۆمۆیل سەرکردایەتی ئەو شالاوەی کرد و بە توندی لەگەڵ کاسۆلیکەکانی ئەوێدا جووڵایەوە، بەشێوەیەك قەسابخانەی گشی وا هەرگیز نەبینرا بوو، ئافرەتان و کچانی بەدیل دەگرت و دواتر وەك کۆیلە دەیفرۆشتن بە ئەمریکا، موڵکداریتی زەوی لە ئیرلەندیەکان لەبەرژەوەندی داگیرکەرە ئینگلیزەکاندا دادەرنی، ئەو ئینگلیزانەی هاتبوون تا داگیری بکەن، ئیدی تەنها یەك شەشی ڕووبەری زەوییان بەجێهێشت و بەرەو ناوچەرگەی رۆژئاوایان بردن و زۆرێکیان بوون بە جووتیاری گەورەکانی ئینگلیز لەناو هەمان خاك و زەویدا.

جەنگی سکۆتلەندیەکانیش مەبەستی دەرکردنی شارلی دووەمی کوڕی شارلی یەکەم بوو لەوێ و ناچار کردنی سکۆتلەندیەکان بوو بەدامەزراندنی کۆمارێك کە لە کۆمارێکی ئینگلیزی پێکبێنێت هێزەکانی کرۆمۆیل توانییان ئەدنبرە داگیر بکەن، ئیدی تەنها یەك شەشی ڕووبەری زەوییان بەجێهێشت و بەرەو ناوجەرگەی ڕۆژئاوایان بردن و زۆرێکیان بوون بە جووتیاری گەورەکانی ئینگلیز لە ناو هەمان خاك و زەویدا.

جەنگی سکۆتلەندیەکانیش ناچار بوو لەساڵی ١٦٥١ز دا لەگەڵ ئینگلیزدا یەکبگرن، پاش ئەو سەرکەوتنانە پەرلەمان بەیاسای دەریاوانی ڕازیبوو، تیایدا هاتووە کە نابێت ئەو کەشتیە ئەوروپیانەی دێن بۆ ئینگلتەرا هیچ بار بکەن جگە لەبەرهەمەکانی وڵاتی خۆیان نەبێت، کاڵاکانی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمریکایش دەبوو تەنها بە کەشتی ئینگلیزی بگەن، لە ئەنجامی ئەم یاسایەدا کە تانیوەی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی کاری پێدەکرا.

ئینگلیز ناچار بوو خۆی بۆ ئامادە کردنی بەرهەمی پێویستی وڵات بچێت، ئەمە بوویە هۆی دامەزراندنی کە ئینگلیز ناچار بوو خۆی بۆ ئامادە کردنی بەرهەمی پێویستی وڵات بچێت، ئەمە بوویە هۆی دامەزراندنی کەشتیگەل و بەردەوام گەشە سەندنی ئەمە بوویە هۆی دەرکەوتنی هێزی دەریایی ئینگلیزی.

ئەو یاسایە بوویە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگ لەگەل هۆڵەندا، بەتایبەت کە هۆلەندیەکان لە گواستنەوەی دەریاییدا کاریان دەکرد، جەنگە کە بۆ ماوەی ساڵانی (١٦٥٢ز١٦٥٤ز)بەردەوامبوو و هۆڵەندیەکان نەیانتوانی سەرکەون، بەوە لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا ڕێککەوتن بەسترا،لەو کاتەدا ناکۆکیەکی نوێی نێوان ئەنجومەنی گشتی و سوپا سەریهەڵداو ئەنجومەن هەوڵیدا سوپا هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام کرۆمۆیل بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی دەرکرد، لەو ڕۆژەی یاسای هەڵوەشاندنەوەی سوپا خرایە ڕوو، کرۆمۆیل بە هاریکاری ژمارەیەك لە پیاوانی سوپا هەستا بە دەرکردنی بە زۆری ئەندامانی ئەنجومەنی و دەرگای ئەنجومەنی داخست و سەربازان لەسەر دەرگاکەیان نووسی (بۆ کری، بەبێ ڕاخەر).

ئینگلتەرا کەوتە دەست سوپاو نازناوی کرۆمۆیل بوو بە (پارێزەری کۆمار)ئەمەش لە ساڵی ١٦٥٣ز دا بوو، کرۆمۆیل بۆ ماوەی پێنج ساڵ و تا مردنی لە ساڵی ١٦٥٨ز چەند دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری کرداری پەیڕەو دەکرد و لە ئەنجامی پشت بەستن بە سوپا بوو بە دەسەڵاتێکی ڕەها و زیاتر لەوە شارلی یەکەم ئەنجامی دەدا توندتر بوون.

لێرەدا هیچ بەرهەڵستکاریەك لەبەردەمیدا نەبوو، چوار پەرلەمان تەنها بەهۆی هەستکردنی بەچەند ئاراستەیەکی سەربەخۆ خوازی تیایاندا هەڵوەشاندنەوە، ئینگلتەرا جووڵەی نەماو بووبە ملکەچی حکومەتێکی سەربازی، لەساڵی ١٦٥٧ز یدا پەرلەمان پێشنیاری نازناوی پاشای بۆ کرد، بەڵام ئەو پێی ڕازی نەبوو،پاشان گەڕایەوەو کوڕەکەی خۆی وەك جێگرەوەی دەستنیشان کرد، بەوە بوو بە پاشایەتی میراتی، ئەگەر چی شەرعی نەبوو.

کرۆمۆیل سیاسەتێکی چالاکی دەرەکی وای جێبەجێ دەکرد کە ئینگلتەرای ڕازیکرد و وای لێکردن قبووڵی سیستمی دیکتاتۆری بکەن، گرنگترین بەشی ئەو سیاسەتەش بەستنی هاوپەیمانی بوو لەگەڵ فەرەنسا دژ بە ئیسپانیا، ئەمەش ئەو هاوپەیمانێتیە بوو کە دەرفەتی سەرکەوتن بەسەر ئیسپانیەکانی بە فەرەنسا بەخشی و سەرلەنوێ مافی بەئینگلتەرا دا وەك سەردەمی ئیلیزابێت پارێزەری مەزهەبی پرۆتستانتی بێت، خەڵکی هەرێمی فود لە سویسرا داوایان کرد بچنە لای ئەوە هێندە بەس بوو ئاماژەیەك بۆ دۆقی ساڤا بکات تا چالاکەیکانی لە دژیان بوەستێنێت. ئینگلتەرا شانو شکۆی خۆی لە دەریای ناوەڕاست و لەبەردەم تونس و جەزائیردا خستە ڕوو.

کاتێك کرۆمۆیل لەساڵی ١٦٥٨ز دا مردن ریتشارد کرۆمۆیلی کوری بوو بە پارێزەری کۆمارەکەی، بەڵام پاش هەشت مانگ دەسەڵاتداری لە مانگی مایۆی ساڵی ١٦٥٩ز دا دەستی لەکار کێشایەوە، ئەمە بوویە هۆی گەڕانەوەی دەسەڵاتی بنەماڵەی ستیوارت.

ئینگلیز دەترسا پشێویەکی سەربازی ڕووبدات، بۆیە شارلی دووەمی کوڕی شارلی یەکەمیان لە ساڵی ١٦٦٠ ز دا بانگکرد تا دەسەلاتی وڵات بگرێتە دەست، بەوە بنەماڵەی ستیوارت گەڕانەوە بۆ دەسەڵات.

شارلی دووەم لەساڵی ١٦٦٠ز تا ساڵی ١٦٨٥ز فەرمانرەوایی کرد، دواتر جیمسی دووەمی برای لە ساڵی ١٦٨٥ز تا ساڵی ١٦٨٨ز فەرمانڕەوایی کرد، ئەمەیان کاسۆلیکیەکی دەمارگیر بوو، هەردووکیشیان هەوڵیاندا مەزهەبی کاسۆلیکی بەسەر ئینگلیزدا بسەپێنن ئەمە بوویە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ز لێرەدا دا بەشبوونێکی نێوان سوپاو ئەنجومەنی گشتی لەدەست کارکێشانەوەی ریتشارد کرۆمۆیلەوە هەبوون خودی سوپایش بۆ دووبەش دابەش بوو:

بەشی ئینگلیز و بەشی سکۆتلندیەکان، بەشی ئینگلیزی هەوڵیدا ئەنجومەنی گشتی بەکار بخات، بەڵام سوپای سکۆتلەندی دەستیوەردایە ناو لەندەن و پەرلەمانی هەڵدەوەشاندەوە و داوای پەرلەمانێکی نوێی کرد، لەو باری پشێویەدا بانگەشە خوازی شارلی دووەم دەرکەوت کە دەیوت ئەو تەنگرەی هەڵوەشاندوەتەوە و هیچ مەرجێکیشی لەسەر دانەناوە، ئەمە یارمەتیدا تا پەیوەندی لەگەڵ پەرلەماندا بە ئازادی بهێڵێتەوە، پەرلەمانیش ڕازیبوو تا بڕی سەدو بیست هەزار ی جونەیهی ساڵانەی پێبدات تا خەرجیەکانی پێ بەڕێوە ببات بەبێ ئەوەی پەرلەمان بانگ بکات بۆ بەردەوامی بەرەو ڕووبوونەوەکان تەنگژە داراییەکەی.

لەسەرەتاوە وا دەرکەوت کە ئینگلتەرا سەردەمێکی نوێ تێدەپەڕێنێت، بۆیە وای نیشان دەدا پشتیوانی دەسەڵاتی ڕەهایە دان نانێت بە چاودێری پەرلەمان لەسەر سیاسەتەکەی، یان چاودێری وەزیران، ئەگەر چی جارجار ناچار دەبوو بۆ ئەوەی نەگاتە تەنگژە نەرمی بنوێنێت، تایبەتمەندی سەردەمی شارلی دووەم دەرکەوتنی لەسەر نوێی باسوخواسی ئایینی بوو، بەو ململانێ ئاینیەی لە نێوان کڵێسای ئەنگلیکانی دژ بە بیۆریتانیەکان ئەنجامدرا، بەتایبەت شارلی یەکەم کە پشتیوانی کاسۆلیکی بوو و ئینگلیزەکان لەناوخۆو دەرەوەدا دژایەتیان دەکرد.

پەرلەمانیش پشتیوانی کلێسای ئینگلیزی بوو، بۆیە چەند بڕیارێکی دژ بە بیوریتانی گرتە بەرو کارمەندانی دەوڵەتی ناچار کرد تا سوێندی دڵسۆزی بۆ کلێسای ئەنگلیکانی بخۆن و بیۆریتانی لە گرتنە دەستی پیشەکانی حکومەت بێبەشکرد، دوای ئەوەش یاسای یەکبوونی بیروباوەڕی دەرکرد تا ئەو سیاسەتەی پەیرەو بکات.

سەرەڕای ئەمەش شارلی دووەم پێویستی بە دارایی هەبوو(دنکرن)ی فرۆشت بە پاشای فەڕەنسا لویسی چواردەیەم، ئەمەش لە ساڵی ١٦٦٢ز دا بوو دوای ئەوەی کرۆمۆیل گرتبووی، ئەمەش بەبڕی پێنج ملیۆن جونەیە بوو. لە ئەنجامی بەردەوامی پێویستی بە دارایی، شارلی دووەم لە ساڵی ١٦٦٤ز دا جەنگی دژ بە هۆڵەندیەکانی ڕاگەیاند و دوای سێ ساڵ ناچار بوو ڕاشکاوی یاسای دەریاوانی بەرامبەریان سووک بکات بەرامبەر بە دەستگرتنی بەسەر داگیرگەکانی ناو جیهانی نوێیان.

هەمان پێویستی بە دارایی دواتر شارلی دووەمی هاندا تا لەگەڵ لویسی چواردەیەمد دژ بە هۆڵەندیەکان لە ساڵی ١٩٧٠ز پەیماننامەی (دۆڤر)هاوپەیمانی بەستێت و تیایدا شارل بەڵێنی دا بێتە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی ئەو هەڵوێستە ڕای گشتی ئینگلیزی وروژاند، بەتایبەت دوای ئەوەی شارلی دووەم بڕیاری لێکبونی دژ بە مەزهەبە دوو بەرە وەك جیابووەکانی بیۆریتان و کاسۆلیك ڕاگەیاند. ئەنگلیکانیش لە ترسی مەزهەبی کاسۆلیکی لە بیۆریتانەکان نزیك بوونەوە، بۆیە پاشا ناچار بوو لەو بڕیاری لێکبوردنەی کە ڕایگەیاندبوو پاشگەز بێتەوە، بۆ ئەوەی شا پەیوەندی خۆی بە کلێسای ئینگلتەرا بسەلمێنێت، برازا گەورەکەی خۆی لە ولیەم ئورانجی هۆڵەندی و دوژمنی لویسی چواردەیەم مارە بڕی، ئەمەش لە ساڵی ١٩٧٤ز دا بوو.

دواتر لە ساڵی ١٩٧٧ز دا جەنگی دژ بە فەرەنسا ڕاگەیاند، ئەنگلیکانەکان ئەو پیلانەیان قۆستەوە کە بۆ ئاڕاستە کردنی گورزی توند بۆ کاسۆلیکی ناو ئینگلتەرا ئەنجامدەدران.

شارلی دووەم هەوڵیدا پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوەو سەر لە نوێ هەڵبژاردنی بۆ بکات، بەڵام ئەنجومەنی نوێ توندیەکی زیاتری نیشاندا دەستیگرت بەسەر ماڵومولکی دۆق یۆرکی برای شادا کە ببووبە کاسۆلیکی پەرلەمانیش بۆ بەرگری یکردن لە خۆی یاسایەکی دەرکرد کە بەو پێیە ڕێی نەدەدا بە گرتنی هەر تاکێك بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر بەبێ ئەوەی ببرێتە دادگا، ئەمەش لەبەر پاراستنی خۆیان لە پیاوانی حکومەت ودەسەڵاتداری پاشا بەسەر حکومەتدا بوون، (ویجز)ئەمانە پشتیوانی دەستگرتنی پەرلەمان بەسەر بڕیارەکانی پاشادا بوون، ئەمەیان بنەڕەتی دەرکەوتنی دوو حیزبی ناوداری ئینگلتەرا بوو.

شارلی دووەم تا مردنی لە ساڵی ١٦٥٨ز دەسەڵاتێکی ڕەهای جێبەجێدەکرد،بەبێ ئەوەی کەسیش بزانێت بوو بەکاسۆلیکی، دواتر جیمسی دووەمی برای کە کاسۆلیکی بوو چوویە شوێنی، هەوڵیدا ئینگلتەرا بگێرێتەوە بۆ مەزهەبی کاسۆلیکی، مەزهەبی خۆیشی نەدەشاردەوەو لە نوێژکردنەکاندا بەشداری دەرکرد، ئەمە ڕاڕایی ئینگلتەرای وروژاند.

جیمسی دووەم سوپایەکی بەهێزی پێکهێناو هەوڵیدا وڵات بەوسو پایە بترسێنێت، هەروەها لەکاسۆلیکەکانی لەچەند پایەیەکی سەرەکی ناو کڵێسای ئەنگلیکانیدا داناو دەرفەتی بەیەسوعیەکان دا تا بێنەناو ئینگلتەرا و چەند پەیوەندیەکی دۆستایەتیشی لەگەڵ پاپادا گرتە بەرو ملکەچی خۆی بۆ پاپا نیشاندا.

ئەنگلیکانەکان لە ڕوی شارلی دووەمدا و دواتریش لە ڕوی جیمسی دووەمدا خۆیان گرت، لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەر یەك لە دوو کچەکەی شویان کردبو بە دوو میری پرۆتستانتی، کچە گەورەکەی شووی کردبوو بە ولیان ئورانجی هۆڵەندی، دووەمیش شووی کردبوو بەجۆرجی برای پاشای دانیمارك، بەڵام جیمسی دووەم سەر لە نوێ لە ساڵی ١٦٨٨ز دا ژنە میرێکی ئیتاڵی کاسۆلیکی بەهاوسەر گرت و کوڕێکی لێ بوو.

ئەمە وایکرد میرانی لەسەر هیلّی میری کاسۆلیکی بڕوات و پێش دوو خوشکەکەی بکەوێت، چونکە گەورە توورداتەکان و ئەنگلیکان بۆریتان و ویجزو توریەکان پاش دەرۆژ لەدایکبوونی جێگیری میسر ولیام ئورانجیان بانگکرد تا لە پێناو گێڕانەوەی ئازادی و پاراستنی مەزهەبی پرۆتستانتیدا دەستوردانی هەبێت. ولیام ئورانج دەترسا لویسی چواردەیەم لە باشوورەوە لە دژی دەستور بدات، بەلاّم خێرا هێزە فەرەنسیەکان بەرەو ناوچەی ڕاین لە ڕۆژهەلاّت چوون،ئەمە ئازادی دابە بزووتنەوەکەی ولیام ئورانج تا دەستور بداتە ناو ئینگلتەرا.

********************



Scanned with CamScanner

# (شۆرشی ساڵی ١٦٨٨)

ولیام ئورانج لە ڕۆژی پێنجی نۆڤەمبەری ساڵی ١٦٨٨ز دا بە چوارده هەزار سەربازو بەشەش سەد کەسیەوە گەیشتە ئینگلتەرا، لە ڕۆژی بیست وحەوتی مانگدا گەیشتە لەندەن، هەموو وڵات لە شۆڕشدا بوو، جیمسی دووەم هاوپەیمانانی خۆی لەدەست دابوون و لەندەنی بەجێهێشت ودواتر گیراو گەڕێنرایەوە بۆ پایتەخت، ولیام ئورانجکەوتە بارێکی سەختەوە بەرامبەر بە خەزووری و هەوڵیدا بیشارێتەوە تا شۆڕشەکە ئاشتی بێت، هەروەك ئاسانکاری بۆ کرد تا ڕابکات بۆ فەرەنسا، ئەمەش کاری پەرلەمانی ئاسانکرد تا ڕابگەیەنێت جیمسی دووەم وازی لە پاشایەتی هێناوە مادەم لە وڵات ڕایکردووە، بۆیە کوڕەکەشی مافی پاشایەتی نیە، بەم پێیە کورسی پاشایەتی بەچۆڵی مایەوە،بۆیە پەرلەمان ولیام ماریخێزانی وەك شاو شاژنی ئینگلتەرا هەڵبژارد.

ئەمجارەیان پەرلەمان بڕیاریدا خەڵکەکەی ساڵی ١٦٦٠ز خۆی دووبارە نەکاتەوە کاتێك شارلی دووەمی بە بێ مەرج بانگرد بۆ دەسەڵات بۆیە لە پێناو دیاریکردنی (مافی گەل)و بەدەستهێنانی بەڵێنێکی ڕەسمی پاشا بۆ ڕێزگرتنی ئەو مافە چەند لەبەرچاوگرتنێکی گرتە بەر، ئەمەش بنەڕەتێك بۆ ڕاگەیاندنی ئەو مافانەی تا سەردەمی گەورەش ئازادی دان پێدانراو بوون، لەپەرلەماندا و لە بەردەم هەموو ئەندامان و لەبەردەم ولیان و شاژندا لە ڕۆژی ٣١ فیبرایەری ساڵی ١٦٨٩ز دا بەشێوەیەکی ڕەسمی ئەوە چەسپاو ولیام بەناوی خۆی و ژنەکەیەوە ڕایگەیاند کە بەوە ڕازیەو کاردەکات بۆ پاراستنی، ئەمەش پێش ئەوەی ئەو دوانە وەك شاو شاژنی ئینگلتەرا ڕابگەیەنرێت.

شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ز شۆڕشێکی ئاشتی بوو، کۆتایی هێنا بەوململانێیەی سەدەیەك بوو بەردەوامبوو لە نێوان سیستمی پاشایەتی بانگەشەکەری دەسەڵاتی ڕەهاو حوکمی مافی خودایی و نێوان گەلدا کە دەستیگرتبوو بە زاڵبوونی بەسەر تواناکانی و فەرمانڕەواییکردنی خۆی لەڕێگەی نوێنەرانیەوە، بەوجۆرە ڕێبازی

دەسەڵاتی گەل سەرکەوت شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ز کۆتایی هێنا بەدابەشبوون و دووبەرەکیە سیاسیەکان و ململانی ئاینینەکانیشی نەهێشت و ڕێبازی ئازادی بیروباوەڕ بۆ ئەنگلیکان و بیۆریتانیەکان بلاو بوویەوە.

بەلام کاسۆلیکەکانی نەگرتەوە، ئەمەش بنەڕتێك بوو بۆ زاڵبوونی ئاشتی لەناو ئینگلتەرادا، ئەمە یارمەتی ئەو دەوڵەتەی دەدا تا سەر لە نوێ لەکۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا دەستور بداتە سیاسەتی ئەوروپیەوە، دواتر لە سیاسەتی ولیامی سێیەمدا (١٦٨٨-١٧١٣ز) میراتگری ماری وولیامدا باسی ئەوە دەکەین کە ئیدی ئینگلتەرا ڕۆڵی دەسەڵاتی ناو ئەوروپای هەبوو و کاروباری ڕێککەوتنامەی ئوترخت و میراتگری ئیسپانی ساڵی ١٧١٢ز یەکلا دەکردەوە.

لە رووی سیستمی پاشایەتیەوە دواتر لە ساڵی ١٧١٤زدا میرجۆرجی هەڵبژێردراوی هانۆڤەر هات کە ئەویش سەرەتای دەسەلاتی بنەماڵەی هانۆڤەر بوو لە ئینگلتەرادا. سەردەمی دەسەلاتی شا ژنە(ئان) دامەزراندنی شانشینی یەکێتی گەورەی بەریتانیای بەخۆیەوە دی، ئەمەش لە ڕێگەی یەکانگیرکردنی شانشینی ئینگلتەراو شانشینی سکۆتلەندا دوای ئەوەی ئەوپەیوەندیە لەسەدەی حەڤدەهەمدا تەنها پەیوەندیەکی شەخسی بوو و خۆی دەبینیەوە و لە بوونی یەك پاشا بۆ هەریەك لەودوو دەوڵەتە، ئەمەش لە ٢٥ مارسی ساڵی ١٧٠٧ز دا و لەسەر بنەمای ئەوە بوو کە سکۆتلەندا کلێسای بیۆریتانی و یاساو دادگاکانی خۆی لەلایەکەوە دەپارێزێت، لەلایەکی دیکەشەوە لەسەر بنەمای بوونی یەك پەرلەمان بۆ نوێنەرانەو لۆردانی هەریەك لە ئینگلتەراو سکۆتلەندا.

ئەو بارە نوێیە زۆربەی کێشەکانی لەناو برد و دانیشتوانی بەریتانیای گەورەی هاندا تا تاوبدەنە چالاکی بنیادی خۆیان، ئەمە یارمەتیدان تا دواتر لەو دیو دەریاکانەوە ئیمپراتۆریەتێکی ئیستیعماری دابمەزرێنن.

**********************

# باسی سێیەم
# (زاڵبوونی فەڕەنسا)

سیستمی دەسەڵاتی ڕەها لە سەرچەند بنەڕەتێکی چەسپاو لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەم لەسەردەمی لوی سیانزهەمدا (١٦١٠ز-١٦٤٢ز)بەهۆی کاردینال ڕیشیلیۆی وەزیریەوە دانرا، ئەمەش درێژە پێدەری هەوڵەکانی هنری چوارەم بوو لێرەدا چەندین نارەحەتی بەرەو ڕووی ئەو کردارە بوونەوە، بەتایبەت لە ساڵانی یەکەمدا، لەوانە لاوازی فەرمانڕەوایان و هەڵوێستی دوژمنکاری هەریەك لە خانەدان و پرۆتستانتەکان.

ڕیشیلیۆ توانی لەسەرەتای گەیشتنی بەوەزارەت لە ساڵی ١٦٢٤ز دا چالاکی و هینری خۆی بخاتە کار تا ڕیزی دەسەڵاتی ڕەهای پاشا بەسەر هەموانـدا بچەسپێنێت لەگەڵ ئەمەشدا لەدوایسەردەمی شالوی سیانزهەم و لەسەرەتاکانی سەردەمی لوی چواردەیەم لەکاتی وەزارەتی کاردینال مەزران (١٦٤٢ز-١٦٦١ز)و لە ئەنجامی بێهیوایی خەڵك و توندی سیاسەتی پەرلەمانی پاریس و چاوچنۆکی دۆقی کۆندیە بارگرژی بەردەوام بوو.

ئەمە وایکرد ئەو ململانێیانە تاساڵی ١٦٥٢ز بەردەوام بن و لە ئەنجامدا کۆتا بەر بەرستەکانی بەردەم دەسەڵاتی ڕەهای پاشایانی فەڕەنسا تێکشکا، بەوجۆرە شانشینی دەستی ئازاد بوو تا بە شێوەیەکی ڕەها هەموو وڵات لە ناو خۆوە ڕێکبخات هێزێکی سەربازی خاوەن بەهای خۆی دابمەزرێنێت و ڕێبدات بە سەپاندنی سیاسەتی خۆی و سەلماندنی زاڵبوونی بەسەر وڵاتانی دیکەدا.

لەکاتی مردنی هنری چوارەمدا لە ساڵی ١٦١٠ز لویسی سیانزەهەمی کوڕی لە تەمەنی نۆساڵیدا بوو، بۆیە خرایە ژێر وەسیەتی دایکی، ئە وەسیەتە لەسەر کورسی دەسەڵات بە توندی بەرەو ڕووی هەڵوێست بویەوە، بەتایبەت کە مێردەکەی لە پێش مردنی کاروباری وڵاتی لە ژنەکەی تێگەیاندبوو.

ئەو ژنەش پەنای بردە بەر وەزیری تا بەڕێوەچوونی کاروباری بۆ ئاسان بکات، ئەو وەزیرەیش ئیتاڵی بوو، ئەمە بوویە هۆی ئەوەی ئامۆزاکانی شای بچووک لە دژ بوەستن، بەتایبەت دۆق کۆندیە، وەزیر تۆمەتبار کرا بەوەی لە داهاتی وڵات دەبات.

ئەنجومەنی چینەکانی گەل لە پاریس لەساڵی ١٦١٤ز دا کۆبوویەوە دابەشبون لە نێوان نوێنەرانی خانەدانەکان و نوێنەرانی چینی سێیەمدا لەسەر مەسەلەی نازناوبەخشین بە ژمارەیەك لەکەسانی چینی سێیەم دروستبوو، کاتێك ئەندامانی ئەنجومەن خەریکبوو بەیەکتردا بدەن، بڕیاردرا کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی چینەکانی گەل بوەستێنرێت، بەشێوەیەك شادەسەڵاتی ڕەهای هەبێت، ئەنجومەنی چینەکانی گەلیش لەکارکەوتوو و بێ کۆبوونەوە بێت.

ئەمە تا هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ز بوویەوە، تەنانەت دوای ئەوەی ماری لە ساڵی دواتر دەسەڵاتی لەدەستدا، فەرەنسا چوویە نێو ململانێیەکی توندی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان و کاریگەری هەبوو لەسەر سروشتی بارودۆخ و هێزەکانی ئەوێ، ئەمەش بە هاتنی ڕیشیلیۆ بۆ وەزارەت لەساڵی ١٦٢٤ز و ساڵانی دواتریشدا.

ڕیشیلۆ بنەمایەکی بۆ خۆی دانابوو، ئەویش دژایەتی دانانی هیکۆنۆت بوو بۆ دەسەڵاتێك کە بەشداری بکات لە دەسەڵاتی ڕەهای پاشادا یان دەسەڵاتی لەگەڵدا دابەش بکات، چونکە ڕیشیلیۆ بڕیای دابوو کۆمەڵی هیکۆنۆت داڕمێنێت و باڵایی گەورە سەرکردەکان کەمبکاتەوەو هەموو هاوڵاتیان بەرامبەردەسەڵاتی ڕەهای پاشا دابنێت.

ڕیشیلیۆ لەمەدا سەرکەوتوو بوو و توانی هێزی دەرەکی فەرەنسا بگێڕێتەوە، دواتر ڕیشیلیۆ کەوتە ڕێکخستنی کارگێڕی ودانانی سوپایەکی بەهێزی خاوەن ئازادی زۆر، دوای ئەوەی پێشتر ژمارەی سوپا لە ساڵی ١٦١٠ز دا لە دەهەزار کەس تینەدەپەڕی، لەساڵی ١٦٢٩ز دا گەیشتە شەست هەزار کەس و لە ساڵی ١٦٤٠زیدا گەیشتە ١٤٢ هەزار پیادەو ٢٢هەزار سوارە دەریاوانیش بەش و ژمارەی ڕووی لەزیادبوون کرد.

کەشتیگەلی ڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی و کەشتیگەلێکی دەریای ناوەڕاستیش هەبوو ریشیلیۆ بارودۆخی کارگێڕی گێرایەوەو هەوڵی چاککردن و زیادکردنی دەسەڵاتی مەرکەزی بەسەر هەرێمەکانی خستە گەڕو قەڵەمڕەوی ناوچەیی فەرمانڕەوایانی لەناو برد.

دەستەی سەرەکی حکومەتیش ئەنجومەنی پاشایان ئەنجومەنی دەوڵەت بوو کە ریشیلیۆ لە ساڵی ١٦٣٠ز دوە هەوڵیدا ڕێکیبخاتەوەو بۆیەکەم جار بوو وەزیری جەنگ و وەزیری کاروباری دەرەوە لە خۆ بگرێت سەبارەت بە هەرێمەکانیش کە گیرۆدەی ململانێکانی قەڵەمڕەو و جەنگە ئاینیەکان بوون ریشیلیۆ هەوڵیدا دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانی و سەربەخۆییان کەمبکاتەوەو دووبارە ملکەچی دەسەلاتی پاشایەتییان بکاتەوە.

بۆ ئەمەش بانگی دەکردن و هەرێمەو هەرێمی پێ دەکردن تا لە ژێر سایەی دەسەلاتی پاشایەتیدا بن، هەروەك پیشەی چاودێرانی هەرێمی دانا، ئەمانە جارجار بەبێ ملکەچی فەرمانڕەوای هەرێمەکان چاودێری کاری ئەو فەرمانڕەوایانەیان دەکرد.

سەبارەت بە پەرلەمانیش ریشیلیۆ پارێزگاری لێدەکردو بەشێوەیەکی تایبەت گرنگیدا بە پەرلەمانی پاریس کە ڕۆلیکی گرنگی لە ژیانی پاتەختدا دەبینی لەکاتی جەنگە ئاینیەکاندا، ئەگەر پەرلەمان جار جار نارەزایی لەدەسەڵاتەکانی ریشیلیۆ هەبوو، ئەوا ڕێی کارکردوو چاوخشکاندنەوەی چەندین جارەی پێدا بوو، دوای دوورخستنەوەی لایەنە سەربەخۆکان تا ئەوەی کاری سەرەکی بوو بەجیاکردنەوەی کێشەکانی ململانێکاران، بەوجۆرە پەرلەمانەکانی فەرەنساو بەتایبەت پەرلەمانی پاریس زیاتر لەوەی دەستەیان ئەنجومەنی یاسادانان بن بیون بەدادگا.

هەموو ئەمانە دەسەلاتی مەرکەزی و ڕەهای شای ناو فەرەنسایان زیاد کرد، کاتێك لە ساڵی ١٦٤٢ز دا کاردینال ریشیلیۆ مرد لوی سیانزەهەم ڕایگەیاند کە درێژە دەدات بەهەموو ئە پرۆژانەی لەگەڵ ئەودا لەکاروباری ناوخۆیی ودەرەکیدا بریاری لەسەر دابوون.

ئەو کەسەش کە کاردینالْ ریشیلیۆ هەڵیبژارد بوو بانگهێشتی کرد تا کارەکە تەواو بکات، ئەویش کاردینال مەزران دەبوو. لویس پاش حەوت مانگ لە چواردەی مایۆی ساڵی ١٦٤٣ز دا مردو منداڵیکی کەمتر لە پێنج ساڵەی بەجێهێشت کە دواتر بوو بە شالویسی چواردەهەم.

لویسی سیانزەهەم وەسیەتی کردبوو ژنەکەی(ئانی نەمساوی) ببێتە وەسی لویسی چواردەیەمی کوڕی و لەگەڵ ئەوەشدا (ئەنجومەنێکی وەسی لەگەڵدا دانا، بەڵام پەرلەمان بڕیاریدا شاژنی دایك بە هەموو دەسەڵاتەکانەوە ببێت بە وەسی، واتە بە بێ بوونی ئەنجومەنێك کە لەوەدا بەشداری بکات، شاژنیش (ئای) دوژمنی کاردینال ریشیلیۆ بوون، لەگەڵ ئەمەشدا کاردینال مەزرانی وەك سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەت یان حکومەت دەستنیشان کرد.

مەزران بە ڕەگەز ئیتاڵی بوو، ئەو ناسنامەی فەرەنسی لە ساڵی ١٦٣٩ز.دا بەدەستهێنا، چونکە لە پیاوانی پاپا بوو، لە هەموو شتێکدا لە ریشیلیۆ جیاواز بوو، کاتێك ریشیلیۆ سەرباز بوو و پاسەوانێکی زۆر بەدوایدا دەهاتن و دەربارەی پاشایەتی هەبوو، مەزران کەسێکی سادە و خاکی بوو و هەموانی دەدوان و لەگەڵیان دادەنیشێت و هیچ ژیانێکی سەربازی نەبوو، بەڵام لە دیبلۆماسیەتدا بەهێز بوو، بە ئاستێك لە سەروو ریشیلیۆوە بوو، لە ڕوانگەی کارگێڕیشەوە نەدەگەیشتە ئاستی ریشیلیۆ.

بەوجۆرە مەزران دەبوو بەرەو ڕووی بارودۆخی ناو فەرەنسا بێتەوە دوای ئەوەی هەر یەك لە (ریشیلیۆ و لویسی سیانزەهەم) مردن، بارودۆخەکان بۆ ئەو سەخت بوون، جوتیاران زۆرینەی گەل بوون ولە بارودۆخێکی سەختدا دەژیان، ئەمەش لەبەر ئەو باجە زۆر و سەختانەی کە دەیاندا.

دارایی لە بارێکی خراپدا بوو بە تایبەت کە بانکەکان هاوردە و داهاتیان زیاتر دەکرد، مەزران هەوڵیدا دارایی چاك بکات، هەروەك هەوڵیدا چەند باجێکی نوێ بسەپێنێت تا ئەو باجانە بوون بە بنەڕەتی وەستاندنی هەر یەك لە پەرلەمان و دواتریش کۆمەڵێك لە سەرکردەکان دژ بە مەزران و سیاسەتەکەی و هەوڵیاندەدا لە

ڕێگەی ئەو نارەزاییەوە مەرجەکانی خۆیان بەسەر دەسەلاتی ڕەهاییدا بسەپێنن و دواتریش بەشێك لە دەسەلاتی ونبوونیان بگێڕنەوە.

بزووتنەوەکە بە ڕێبەری کۆمەلێك لە کارمەندان و دادوەرانی پەرلەمانی پاریس دەستی پێکرد، ئەمانە ئەوان بوون، کە ریشیلیۆ دەسەلاتی نەهێشتبوون، بەلام ئانی نەمساوی پاش ئەوە بۆ گۆڕینی وەسیەتی مێردەکەی پەنای بردە لای ئەوان ئەم کارە هیوایەکی پێبەخشین تا دەسەلاتی لەدەستچوویان بگێڕنەوە، هەندێ دادوەری پەرلەمانی پاریس نارەزاییەکانی خۆیان لە پەرلەماندا بەرامبەر سەپاندنی باجە نوێکان دەربڕی، کاتێك مەزران سوور بوو لەسەر پێویستی دانی ئەو باجانە، ئەندامانی پەرلەمان بڕیاری پێویستی کۆبونەوەیان لە هۆڵی قدیس لویس دەرکرد تا پێکەوە لە کێشەی (چاکسازی شانشین)دا ڕاوێژ بکەن، ئەمەش لە سیانزەی مایۆی سالی ١٦٤٨ز.دا بوو.

سەرەڕای ئەو ژنە وسی ڕێی لەو کۆبونەوەیە گرت، بەلام کۆبوونەوە و دەقێکیان دەرکرد کە بیست و حەوت ماددەی لەخۆ دەگرت، و تیایدا داوایان کردبوو پایەکانی چاودێران لاببەن و بە بێ ڕەزامەندی پەرلەمان باج نەسەپێنرێت و هیچ کەس بە بێ دادگایی کردن زیاتر لە بیست و چوار کاتژمێر بەند نەکرێت.

ئامانج لەو بڕیارانە سنوردارکردنی دەسەلاتی ڕەهای شا بوو، هەروەك لە ئینگلتەرا ڕوویدا، جەماوەر لە پاریس بەو بڕیارانە سەریان سوڕما، دۆقی کۆندیە لەو کاتەدا بەسەر هێزە ئیسپانیەکاندا سەرکەوت و هات تا پالپشتی دەسەلاتی شانشین لە پاریسدا بکات و حکومەت بڕیاری گرتنی چەندین ئەندامی پەرلەمانی دەرکرد، بەمە لە پاریسدا شۆڕش بلاوبوویەوە و جەماوەر کەوتنە دامەزراندنی سەربەستی دار و بەرد و بەرمیل و داخستنی شەقامەکان تا ڕێ بە کۆندیە نەدەن دەستبگرێت بەسەر پایتەختدا و قسەی شانشینیان بەسەردا بسەپێنێت، هەروەك گەمارۆی خودی کۆشکی شایان دا و وەسیش ناچار بوو پاشەکشە بکات و بڕیاری ئازادکردنی بەندکراوانی دەرکرد.

پاش بەستنی ڕێککەوتنامەی وستڤالیا هەموو هێزەکانی دۆقی کوندیە چوون تا گەمارۆی پاریس بدەن و شۆڕشی ئەویٚ لەناو ببەن و وەسی و شای بچوکیان لە پایتەخت بەجێهێشت، باروذۆخ بەرەو دابەشبوونێکی ڕوون و هەڵگیرسانی جەنگێکی ناوخۆیی نێوان هەردوولا چوو و بە (فرۆند) ناسرا.

ئەمەش بەدابەشبوونی ناو پەرلەمان و جەنگی نێوان هەردوولا دەستی پێکرد و ئەو قرناغەش ناوی نرا، (فرۆندی پەرلەمان) بەلاّم ئەو قۆناغە ماوەیەکی نۆری نەخایاند، بە تایبەت کە پیاوانی ئایینی ئەزموونی سەربازی یان نەبوو و ماڵ و سامان و شمەکی پێویست بۆ بەردەوامی جەنگەکە نەبوو، نەشیاندەتوانی ئەو ڕۆڵە ببینن کە پەرلەمانی ئینگلیزی بینی، بە تایبەت کە دەسەلاّتەکانیان دادوەری بوون، بۆیە هەرێمەکان گوێیان بە بزووتنەوەکەیان نەدەدا، ناچار پاش کەمتر لە سیٚ مانگ ناچار بون داوای ڕێککەوتن بکەن.

بەلاّم دوای ئەوە بزووتنەوەکە گەشەی کرد و چوویە سنووری (فرۆندی سەرکردەکان)ەوە، کۆندیش هەڵوێستی بەرهەڵستکاری ڕاشکاوانەی دژ بە مەزرانی گرتە بەر و هەوڵیدا بچێتە شوێنەکەی ئەو، بەلاّم شاژن بڕیاریدا بیگرن و بەندی بکەن، بەمە دەوروبەر و شوێنکەوتوەکانی کەوتنە وروژاندنی هەرێمەکان، هەروەك سەرلەنویٚ پاریس و پەرلەمانی ئەویٚ وروژان.

ئەمە مەزرانی ناچار کرد تا ئەویٚ بەجیٚ بهێڵێت و دۆقی کۆندیە ئازاد بکات و لە ساڵی ١٦٥١ز.دا پاشەکشەی کرد بۆ کۆڵۆنیا لە ئەڵمانیا، و شاژنی دایکیشی لەگەڵدا بوو و لە دەرەوە کاروباری بەڕێوە دەبرد، مەترسیەکانی دۆقی کۆندیە زیادیان کرد و لەگەڵ پەرلەمان کەوتنە دژایەتی وهاوپەیمانێتی بەهێز لەگەڵ پاشای ئیسپانیادا بەست و مەزران بە سوپایەکی بچوك و بەسەرکردایەتی ماریشاڵ تورین لە ساڵی ١٦٥١ز. گەڕایەوە و هێرشی بردە سەر دۆقی کۆندیە و جەنگی قورس لەسەر شۆرەکانی پاریس ڕوویدا و خەڵکی پایتەختیش ئامادە نەبوون یارمەتی پێشکەش بە هێزەکانی دۆق کۆندیە بکەن.